# پێکەوەژیان

## بەرەو بەخۆداچوونەوە و گۆڕانکاری

.....................................................

لەبڵاوکراوەکانی ناوەندی هزیی و ڕۆشنبیریی خاڵ (٢)

- نووسینی: نازم عەبدوڵڵا
- بابەت: لێکۆڵینەوە
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- نۆبەی چاپ: یەکەم، ساڵی ٢٠١٦ کوردستان ـ هەولێر
- چاپخانە: ڕۆژهەڵات ـ هەولێر

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (        )ی ساڵی ٢٠١٦ پێدراوە



﴿وَإِنَّا أَوْ إِيَّاكُمْ لَعَلَى هُدًى أَوْ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ﴾ (سبأ: ٢٤).

***

﴿وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لآمَنَ مَنْ فِي الأرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا، أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ﴾ (يونس: ٩٩).

***

﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ، أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾ (البقرة: ١٤٨).

# پێڕست

## بەشی سێیەم: میکانیزمەکانی پێکەوەژیان:

## بەشی چوارەم:

## بەربەستەكانی بەردەم چاكسازیی بزاڤە ئیسلامییەكان

## بەشی چوارەم: کێبڕکێی نێوان لایەنە ئیسلامییەکان

# پێشەکیی

بزافە ئیسلامیەکان نزیکەی سەدەیەکە لەسەر یەك ڕیتمی کار، خەبات، سیاسەتکردن ، پەروەرد و بانگەواز دەڕۆن، هەر خاوەن پڕۆژە و پیشەیەك بێت دوای ئەم هەموو ماندووبوون وزەحمەتە هەڵوێستەیەك ئەکات و دوای بەخۆداچوونەوەیەك لە خۆی دەپرسێت وەختی ئەوە نەهاتووە سنووری پڕۆژەکەم فرەوانتر بکەم، سوودی زیاتر لە میکانیزمە سەردەمیەکانی تر ببینم؟ خۆ لەگەڵ هاوتاکانمدا پێکەوە دەستمان پێکرد! بۆ ئەوان گەیشتوون بە چڵەپۆپە و ئێمەش هەر لە شوێنی خۆماندا ماوین؟

زۆرێك لە شارەزایانی بواری هزر و سیاسەت ڕایان وایە: شێوازی گوتاری لایەنە ئیسلامیەکان شێوازێکی کۆنە، لە ڕووی نەتەوایەتی و دەوڵەتی نەتەوەییەوە کەموکووڕتی زۆری تێدایە، نەیانتوانیوە ئاوێتەی کێشە جۆربەجۆرەکانی خەڵکی ببن و چی تر گوتاری بژاردەیی دووبارە نەکەنەوە، یان هەندێك جار بزاڤە ئیسلامیە کوردیەکان لە جیاتی ئەوەی خزمەت بە گەل و نەتەوەی خۆیان بکەن، زۆر جار نەتەوەکانی تری وەکو عەرەب، تورك وفارس، لە ژێر درووشمی ئایەتی: (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ**)[1] ئیستغلالی سۆزە ئایینیەکەیانیان کردوە، پلان و پڕۆژەکانیان لە بەرژەوەندی ئەو نەتەوانە تەواو بووە.

---

[1] الحجرات: ١٠.

دەبێت جارێکی تر سیاسەت و دونیابینی و پلان و پڕۆژەیان لە چوارچێوەی واقیعبینـی و بەرائـەتی دەقـەکانی قوورئـان و فـەرموودەکانی پێغەمبـەردا (درودو سەلامی خـوای لەسـەر بێـت) دابڕێژنـەوە، فیقهـی سیاسـی مێـژووی مسولمانان و ڕای زانایانی ئەو بوارە وەکو ئیجتیهادێـك و بەرهـەمی عـەقڵی زانایان بۆ چارەسەری سەردەمی خۆیان تەماشا بکرێت، ئەوەی لەگەڵ واقیعی ئەمرۆدا یەکدەگرێتەوە سوودیان لێ ببینرێت، ئەوانـەش وەلا بنـرێن ئـەمری واقیعی سەردەمی خۆیان بە سەریاندا فەرزی کردوە و لەگەڵ دەقەکانی قورئان و هەڵسوکەوتی پێغەمبەر و ژیانی خەلیفە سەرڕاستەکاندا یەکناگرنەوە، هیچ چارەسەرێکیشی تێدا نییە بۆ ئەمرۆی ئێمە.

لـە ڕووی ئیـداری و لێکتێگەیـشتن و پێکـەوەژیان و میکانیزمـەکانی دەستاوەسـتکردنی دەسـەڵات مرۆڤایـەتی هـەنگاوی گـەورەی بڕیـوە و ئەزموونێکی زۆری کەڵەکە کردوە، دەکرێـت لـە ژێـر ڕۆشـنایی فـەرموودەی: (**الكلمة الحكمة ضالة المؤمن حيثما وجدها فهو أحق بها** )[١].

بزاڤە ئیسلامیەکان دەبێت ئەو میکانیزمانە لە بێـژەنگ بـدەن، کـە گـەلانی دونیا بە گشتی و هەندێك لە بزاڤە ئیسلامیەکان لێی سوودمەندبوون، تا لـە هەرێمی کوردستانیش سوودیان لێ ببینرێت.

گۆڕانکاری شتێکی حەتمیە ئەگەر بزاڤە ئیـسلامیەکان خۆشـیان نەیکـەن، بـە گـوێرەی فـەرموودەی پێغەمبـەر (درود و سـەلامی خـوای لەسـەر بێـت) گۆڕانکاری ڕوو دەدات: (**إن الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مائة سنة**

[١] سونەنی ئیبن وماجە ٢/ ١٣٩٥/ ٤١٦٩.

**من يجدد لها دينها)**[1]. بۆیە نوێبوونەوە لایەنە ئیسلامییەکان پێی هەستن یان پشتگوێی بخەن هەر دەبێت، هەر وڵات و نەتەوەیەکیش نوێکەرەوەی تایبەت بە هەلومەرجی خۆی هەیە، نوێبوونەوە شتێکی ڕێژەییە بۆیە هەرکەسێك خزمەتێکی تازە بخاتە سەر کار و پرۆژەی ئیسلامی بایی ئەندازەی کاریگەری خزمەتەکەی نوێکەرەوەیە، بۆیە نابێ وا بیربکەینەوە هەوڵ نەدەین تا تازەکەرەوەیەکی تایبەت لەلای خوای باڵادەستەوە دەستنیشان دەکرێت، چونکە ئەوە بڕیار و سونەتێکی خوداییە، جاری واهەیە نوێکەرەوە کەسێکە، جاری واش هەیە زیاتر لەکەسێکە٢، بۆیە هەر یەکێك لەم پارتە ئیسلامیانەی هەرێم دەتوانن لە ناو دامودەزگای پارتەکانیاندا بەخۆداچوونەوە بکەن و ڕێڕەوێکی باش دابمەزرێنن، وەکو تازەکەرەوەیەك خەڵکێکی تر چاویان لێ بکەن. باشترین تازەکەرەوەش بۆ ئەم سەردەمە ئەوەیە: جوانیەکانی ئیسلام لەگەڵ واقیعی ئەمڕۆدا ئاوێتە بکرێت، لە چوارچێوەی دەسکەوتە مرۆڤایەتیەکاندا زەمینەسازیەك بکرێت خەڵکی بەرژەوەندی و چارەنوسیان لە وێدا ببیننەوە، لە جیاتی ڕاکردن بە دوای سەرابی بیاباندا تینوێتیان لە کانیاوی سازگاری ئیسلام بشکێنن.

بیرۆکەی کتێبی: (بەرەو پێکەوەژیان) لە چوارچێوەی ئەزموونی ڕابردو و چارەسەرێکیش بۆ داهاتوو سەرچاوەی گرتوە، بنەمایەکیش بێت بۆ

---

[1] المعجم الوسيط: ٦/ ٣٢٤.

[2] وشەی (من) کە لە فەرموودەی (إن الله يبعث لهذه الأمة على رأس كل مائة سنة من يجدد لها دينها) لەزمانی عەرەبیدا بۆ تاك وکۆ ئەبێت.

لێکتێگەیشتن و پێکەوەژیان. لێرەدا بە ئەرکی سەرشانی خۆمی دەزانم سوپاس و پێزانینی خۆم بۆ ئەو برا بەڕێزانە دەربڕم کە بە تێبینی و سەرنج و تەنانەت بە ڕاستکردنەوەی وشەیەکیش هاوکاریان کردوم، بە تایبەت برای زۆر بەڕێز و خۆشەویست کاك تۆفیق کەریم خوا پایەداری بکات و پاداشتی خێری بداتەوە.

**نازم عەبدوڵڵا**

**سلێمانی: ٣/٩/ ٢٠١٦**

## پێناسەی پێکەوەژیان:

(پێکەوە + ژیان) لە زمانەوانیدا:

(پێکەوە): بە هەموو ئەو کار و بەرنامە و پرۆژە هاوبەشانە دەوترێت، کە تاکەکان بەبێ ئەوانی تر پێیان ئەنجام نادرێت، بۆیە هەر زاراوەکە بە تەنها مانای کاری دەستەجەمعی و زیاتر لە کەسێك دەگەیەنێت.

هەروەها (پێکەوە) بە پێکهاتەی کۆمەڵگا و پێکهاتەی پارت و ڕێکخراوەکان و بە هەموو ئەو کارە هەرەوەزییانە دەوترێت کەوا خەڵکی بەبێ ئەوانی تر پێیان ئەنجام نادرێت. پێکەوە، بەرزترین پێناسەی مرۆڤە، چونکە مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، هەر کاتێك ئەو واتایەی لێ کرایەوە، هیچ مانایەك بۆ مرۆڤبوون نامێنێتەوە.

(ژیان): تەواوکەری دووەمی واتای وشەکەیە، کە هەموو مەبەستە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سەربازییەکان دەگەیەنێت. ئەوەیش بە دەستەوە دەدات کە هەموو پێکەوەبوونێك، ئەگەر نەبێتە دروستکەری ژیان، ئەوە پێکەوەبوونێکی نارێك و بێبەرنامە و زیانبەخشە وململانێی نارێکی شارستانیەتەکانی لێ پەیدا ئەبێت. کەواتە: ژیان هەموو ئەو بەرنامە و پلان و نەخشەرێگا ئایینی و شارستانی و زانستییانەش دەگرێتەوە، کەوا مرۆڤەکان بەبێ ئەوانی تر بۆیان ئەنجام نادرێت. وەکو خوای بالا دەست لە نێوان جیاوازەکاندا گەڕان بە دوای خاڵە هاوبەشەکاندا دوپات ئەکاتەوەو ئەفەرموێت: (**وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ**)[1]

[1] المائدة ٢. صراع الحضارات فی المفهوم الاسلامی، د. عبدالعزیز بن عثمان التویجری، چاپی: ٢٠٠٢، ل:٢٦.

بۆیە زاراوەی (پێکەوەژیان) واتای بەرزبوونەوەی مرۆڤەکانە بۆ هەموو ئاستە ڕۆحی و ئایینی و فەرهەنگییەکان، بڕینی هەموو کۆسپەکان و گەیشتن بە چڵەپۆپەی مرۆڤبوون دەگەیەنێت، چونکە ئەوانە جگە لە کاری دەستەجەمعی، هیچیان بە تاك تاکی مرۆڤ ئەنجام نادرێن.

لە فەرهەنگ و سەرچاوەکانی زمانی عەرەبییشدا، پێکەوەژیان بە واتای جۆراوجۆر هاتووە، لەوانە: (التعایش) لە بنەمای زمانی عەرەبیدا لەسەر کێشی (تفاعل)ە، کە بۆ کارلەیەککردنی دوو شت بەکاردێت: هەر کاتێك دوو شت کاریان لە یەکدی کرد، ئەوە واتای پێکەوەژیان و خۆشەویستی و ئولفەت دەگەیەنێت١، پێکەوەژیانی ئاشتییانەش لەو واتایە وەرگیراوە[٢] .

لە زاراوەشدا پێکەوەژیان بە واتای: قبوڵکردنی بەرانبەر و لێکتێگەیشتن بۆ کاری هاوبەش، کە هەرکەس چۆن پێی خۆشە لە چوارچێوەی یاسادا بەو شێوەیە قەناعەتی شەخسی خۆی پیادە بکات، لە قورئانیشدا جەخت لەسەر پێکەوەژیان کراوەتەوە، بە شێوەیەك خاوەن ئایین و هەڵگرانی ڕێڕەوە جیاوازەکان، هیچ لایەکیان بە تۆبزیی، ویست و ئیرادەی خۆی، بە زۆر بەسەر ئەویتردا نەسەپێنێت، وەکو خوای باڵادەست لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەفەرموێت: (قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَي كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ[٣]) [٤]، کە ڕاڤەکارانی قورئان واتای وا لێك دەدەنەوە کە: شوێنکەوتەی ئایینە ئاسمانییەکان: با ڕێك

---

[١] لسان العرب، ابن منظور، باب عيش، ج٦ ل٣٢١ چاپی یەکەم بەیروت، القاموس المحيط، فصل العين.

[٢] المعجم البسيط، ابراهيم مصطفى، احمد الزياد، حامد عبدالقادر، محمد النجار، باب العين، ١٨٩/٢.

[٣] العمران: ٦٤.

٧ التفسير الوسيط، محمد سيد طنطاوى، ٦٣٥/١، وانوار التنزيل واسرار التأويل، عبدالله بن عمر بن محمد، البيضاوى ٣٥٥/١.

بکەون لەسەر دەستەواژەیەك کەوا پێغەمبەرەکان و خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان کۆکبن لەسەری[1]، کە ئەمەش زیاتر هانمان دەدات بۆ ئەوەی ئێمەش لە خاڵە هاوبەشەکاندا گفتوگۆ بکەین و هەنگاو بنێین، بۆ گەیشتن بە کاری هاوبەش، بۆیە لە پێکەوەژیاندا ئەو بۆچوونە وەلا دەنرێت کەوا تەنها ئەو کەسانە تایبەت بکەیت بە خۆتەوە کە هاوئایینن، یان لە پارتێکدان، یان ڕێکخراوێك، یان خاکێك، کۆی کردوونەتەوە، ئیتر ئەوانی تر بە دەرەوەی خۆت ئەژمار بکەیت، بە پێچەوانەوە چەند خاڵی هاوبەش لە نێوانماندا هەیە بایی ئەوەندە ماف و ئەرکمان بەسەر یەکەوە هەیە.

## بنەماکانی پێکەوەژیان

پێکەوەژیان کۆمەڵێك بنەمای هەیە، تا ئەوەندەی پڕۆژە و پلانمان لە چوارچێوەی ئەو بنەمایانەدا بێت، واتا و مەبەستی پێکەوەژیان دەگەیەنێت، بۆیە گرنگە پێشەکی ئێمە هەڵوێستە لەسەر واتا و مەبەستی بنەماکان بکەین، تا بزانین چەندێك کار و پلان و پڕۆژەکانمان لە چوارچێوەی ئەو بنەمایانەدان، ئەوکاتە پاشتر دەچینە قوڵایی واتای پێکەوەژیانەوە. هەموو ئەو کێشە ئایینی و فەرهەنگی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی ئەمڕۆ جیهانیان گرتۆتەوە، هۆکارەکەی بەشێکی زۆری دەگەڕێتەوە بۆ بەهەڵەتێگەیشتن لە چەمکی پێکەوەژیان، ئەو بەر یەککەوتن و پێکدادانەی لە جیهاندا ڕوویان داوە، هەر لە جەنگە ئایینییەکان و جەنگە

جیهانییەکانــەوە تــا جاڕنامــە گەردوونییــەکانی مــافی مــرۆڤ، هــەمووی دەگەڕێتــەوە، بــۆ هەڵەتێگەیــشتن لــەو چــەمکە، یــان گــەڕان بــە دوای ڕێگەچـارەیەکدا لـە چوارچـێوەی ئـەو چـەمکەدا، هـەر لـە ئاسـتێکی بـاڵای پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکانەوە، تا بەڕێوەبردنی وڵات و نەتەوە جیاوازەکـان و پــارت و ئایــدیۆلۆژیا جۆراوجۆرەکــان، هــەموویان لــە چوارچــێوەی لێکتێگەیـشتنێکی تۆکمـەدا، پێویـستیان بـە داڕشـتنەوەیەکی دەسـتووری و یاسایی هەیە، خۆ ئەگەر کۆمەڵگەکان لەم هەنگاوەدا سەرکەوتنیان بەدەست هێنـا، ئـەوە هـەنگاوێکی گـەورە بـڕدراوە لـە ئاسـاییکردنەوەی پەیوەندییـە نێوخۆیی و دەرەکییەکاندا، هەنـدێك چـەمك و بنـەمای پێکـەوەژیان هـەن، هەرکاتێك ئەو بنەمایانە کەوتنە مەترسییەوە، ئـەوە پێکـەوەژیان دەکەوێتـە مەترسییەوە و کۆمەڵگا بـەرەو ئاقـارێکی خـراپ ملـی ڕێگـا دەگرێـت، کـە لێرەدا ئاماژە بەوانەیان دەکەین بۆ قۆناغی ئێستامان پێویستمان پێیانە.

**١. ئازادی:**

کە باس لـە ئـازادی دەکـەین، مەبەسـتمان لـە ئازادییەکـە یاسـا تێیـدا سەروەر بێت، چونکە ئـازادی بـە تـەنها نابێتـە گرەنتیـی پێکـەوەژیان لەبـەر ئەوەی ئازادیی بێ یاسا دەبێتە سەرچاوەی بارگرژی و هۆکـاری پێـشێلکردنی مافەکان و پێکدادان، ئەوکاتە لـەباتی دەسـتەبەرکردنی پێکـەوەبوون دەبێتـە هـۆی لـێکترازان، بـەڵام هـەرکاتێك ئـازادیی یاسـایی هـەبوو خـەڵکی دەبنـە خاوەنی ئیرادە و هوشیاریی خۆیان، ئەوکاتە هەردەربڕینێکیان هەبێت، خۆیان بەرپرسن لێی، چونکە لە ژێر هیچ جۆرە فشارێکی دەرەکیدا دەریان نـەبڕیوە، ئەوکاتــە بــە شــێوەیەکی سروشــتی هەڵــسوکەوت دەکــەن، هــەموو

هەڵسوكەوتێكیان ڕەنگدانەوەی واقیعی فیكری و سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتیی خۆیانە، پاڵنەری هەموو گۆڕانكارییەكانیش، پاڵنەرێكی خودی دەبێت كە پێكهاتەكانی كۆمەڵگا لە ژێر هیچ فشارێكدا پەنایان بۆ گۆڕانكارییەكان نەبردووە، هیچ هێزێكی دەرەكی و بەرژەوەندیی هیچ نەتەوە و وڵاتێكی تر تێكەڵ بە بەرژەوەندیی گەل و وڵات نەبووە، كە ئەو نەتەوە و وڵاتانە بۆ دەستخستنی بەرژەوەندییەكانی خۆیان ئارامی و ئاسایشی گەل و وڵات بخەنە مەترسییەوە، ئەوكاتە هیچ جۆرە دڵەڕاوكێ و ناجێگیرییەك، لە نێو كۆمەڵگادا بەدی ناكرێت، ئەمەش بەڵگەی ئەوەیە، كەوا هەڵكشان و داكشان و زۆرێك لەو شپرزەیی و پێكدادانەی ئەمڕۆ لە كۆمەڵگە مسوڵمانەكاندا ڕوو دەدەن، هۆكارەكەی بە پلەی یەك دەگەڕێتەوە بۆ ڕێگرییكردنی خەڵكی لە مومارەسەكردنی ئازادییەكانیان و هەندێك جاریش كەلێن دروست دەكات بۆ دەستێوەردانی دەرەكی، چونكە ئەو كەسەی ڕێگریی لێ دەكرێت لە ڕێگەی ڕاستەوە بڕوات، ناچارە پێچ و لاڕێ بدۆزێتەوە تا لێوەی گوزەر بكات، دوور نییە ئەوكاتە خۆی تووشی مەترسی و دەوروبەریشی تووشی دڵەڕاوكێ بكات، بۆیە كاتێك لەسەر ئاستی ناوخۆ هاووڵاتییەك لە لایەن دەسەڵاتەوە، لەسەر ڕادەربڕین لێپێچینەوەی لەگەڵ دەكرێت، یان ئەندامی پارتێك لە نێو پارتەكەیدا، ڕای پێچەوانەی هەیە، بەڵام ئازاد نییە لە دەربڕینی ڕایەكانی، بەبێ ئەوەی دژ بە یاسا بێت، یان بەرژەوەندیی گشتی خستبێتە مەترسییەوە، لێپێچینەوەی لەگەڵ دەكرێت، ئەوە هەم هاووڵاتییەكە وەكو تاكێكی كۆمەڵگا، هەم ئەندامی پارتەكە وەكو ئەندامی ڕێكخراوێك، ئیرادەیەكی تر لەبەر ئەوەی دەسەڵاتی هەیە، یان لە

نێـو پارتەکەیـدا دەسترۆیـشتووە، بەسـەر ئـیرادەی ئـەو کەسـەدا زاڵ دەبێـت، ئەوکاتە ئەو کەسە لە باتی ئەوەی بە شێوەیەکی پـۆزەتیڤ بـیر بکاتـەوە، بـە شـێوەیەکی نێگـەتیڤ، دەوروبـەری خـۆی دەبینێـت، واتـای پێکـەوەبوون و خزمـەتکردن لـە پرۆژەیـەکی هاوبەشـدا، دەکەوێتـە مەترسـییەوە، بۆیـە هەرکاتێك ئازادی بە شـێوەی یاسـایی لـە نێـو کۆمـەڵگادا، ڕێـزلێگیراو بـوو ئەوکاتە هیچ هاووڵاتییەك، لەسەر ڕەخنەگرتن لە پارتێك، یـان ڕێکخراوێـك، یان سەرکردەیەك، چ لە نێو ڕێکخراو و پارتەکەی خۆیدا بێت کە لاگیریی بۆی هەیە، یان هەر پارت و ڕێکخراوێکی تر بێت، لێپێچینەوەی لەگـەڵ ناکرێـت، ئەمەش وایکرد لە شارەزایان و بیرمەندانی ڕۆژئاوا کە لە ژێر ئەو ئەزموونەی لە پێکدادانەکاندا دەستیان کەوتووە، بگەن بە دوو بۆچوونی سەرەکی:

بۆچوونێکیان ئـەوە بـوو ئازادییـەکانیان بخرێتـە چوارچێوەی بەرژەوەنـدیی گشتییەوە، جێگەی هیچ هەنگاو و پلانێك نەبێتەوە، کـە لـە ڕووی ئـیرادەی گەلـدا دەوەسـتێ و بەرژەوەنـدیی گـشتی دەخاتـە مەترسـییەوە. ئەوانەشـی نوێنەرایەتیی ئەو ڕایەیان دەکرد بـریتی بـوون لـە جـۆن لـۆك، ڕۆسـۆ[1]، جـۆن ستیوارت میل[2]. لە جاڕنامەی گـشتیی مـافی مرۆڤیـشدا هـاتووە کـە دەبـێ هاوسەنگ دروست بکرێت لە نێوان ئازادیی تاك و کۆمەڵگادا[3].

---

[1] الموسوعة الميسرة، فی المذاهب والاديان المعاصرة، د. مانع الجهنی، ١/١١٣٥. وة موسوعة السياسة، عبدالوهاب کەیالی، ٢/٨٤٤ـ ٨٤٩.

[2] سس الليبرالية السياسية، ستيوارت ميل، ل: ١٣٥ـ وة ل: ١٤٢.

[3] الوثائق الدولية المعنية بحقوق الانسان، د. محمود شريف بسيونی، چاپی سێیەم، ٢٠٠٦ دار الشروق، مادەی:٢٩.

بۆچوونی دووەمیان ئەوە بوو کە ئازادییەکان لە چوارچێوەی دەوڵەتدا جێگەی بکرێتەوە، وەکو هێگڵ بانگەشەی بۆ کردووە، یان لە چوارچێوەی بەرژەوەندییەکانی چینی کرێکاردا خۆی ببینێتەوە، وەکو مارکس بانگەشەی بۆ کردووە[1]. بەڵام بە ئەزموونی گەلان ڕای یەکەم سەرکەوتنی بەدەست هێنا، بەردەوامیش تا ئەمڕۆ لە گەشەکردن و بەرەوپێشچووندایە، چونکە دەسەڵاتەکەی گەڕاندۆتەوە بۆ گەل، بەڵام ڕای دووەم کەوا ئازادییەکان سنووردار دەکات لە بەرژەوەندیی دەوڵەتدا، یان لە چوارچێوەی بەرژەوەندیی چینی کرێکاردا، ئەوە بە ئەزموون دەرکەوت دەیان پارت و دەوڵەتی خۆسەپێن و دیکتاتۆری لێ پەیدا بوو ئەوەش هۆکاری تێکشکانی ئەو بیردۆزە و بۆچوونە بوو وە لە تێڕوانین بۆ ئازادییەکان جیاوازیی هەیە لە نێوان ئایین و قوتابخانە فەلسەفی و ئایینزاکاندا، ڕێڕەوی لیبراڵییەت کاتێك هەموو دەسەڵاتەکان دەگێڕێتەوە بۆ گەل، ئامانجی ئەوەیە دەسەڵاتی دیکتاتۆریی دروست نەبێت، بە شێوەیەك حساب بۆ گەل نەکات، کاتێکیش مارکس لە پەرچەکرداری دەسەڵاتەکانی کەنیسە و دەرەبەگایەتی و چینە دەستڕۆیشتووەکاندا، هەموو دەسەڵاتێك دەدات بە چینی کرێکار، ئامانجی ئەوەیە چینێکی ژێردەستە باڵادەست بکات و هیچ دەسەڵاتێك بۆ کەنیسە و چینی بۆرجوازی و دەرەبەگ نەهێڵێتەوە، کاتێك هێگڵ هەموو دەسەڵاتێك دەدات بە دەوڵەت، قەناعەتی وایە خەڵك بە بێ دەوڵەتی دەستڕۆیشتوو کاری ناڕوات. بنەما تیۆرییە ئیسلامییەکان و پراکتیزەکردنی خەلیفە

---

[1] فکر جارودی بين المادية والاسلام، د. عادل التل، چاپی یەکەم: ١٩٩٧، ل: ٣٤.

ڕاشیدەکانیش، ڕێگرییان کردووە لەوەی بە ناوی ئایینەوە چینێك خۆی بە پیرۆز بناسێنێت و ستەم لە خەڵك و هاووڵاتیان بکات، کە پێی دەوترێت دەوڵەتی تیۆکراسی[1]، یان بنەماڵەیەکی دەستڕۆیشتوو بە ناوی ئیسلامەوە خۆیان بەسەر خەڵکیدا بسەپێنن، کە پێی دەوترێ حوکمڕانیی میراتی[2]، یان تاکڕەوانە کەسێك چۆنی پێ خۆش بوو وا حوکمڕانیی خەڵکی بکات، کە پێی دەوترێت حوکمی دیکتاتۆریی[3]، ئیسلام لە چوارچێوەی مەرجیعیەتی شەریعەتدا سەروەریی دەدات بە گەل، گەل خاونی هەموو دەسەڵاتێکە، جگە لە گەل هیچ کەسی تر خاوەن دەسەڵاتی شەرعی نییە[4]، ئامانجیش لە ئازادیی گەل ئەوەیە لەسەر ڕەخنەی مانادار و بنیاتنەر کەمینەیەك لێپێچینەوە لە خەڵك نەکات، چونکە ئەوە پێچەوانەی یاسایە و دەچێتە چوارچێوەی تیرۆری فیکرییەوە، سەرەتایە بۆ تۆقاندن و ترساندن، کۆمەڵگا دەکات بە دوو بەشەوە: بەشێکی دەسەڵاتداری پیرۆزی خۆسەپێن، بەشێکی تریشی هاووڵاتیی ڕەخنەگر، کە زۆرجار لە نێو کۆمەڵگا و پارت و ڕێکخراوەکانیاندا جێگایان نابێتەوە، بۆیە لێرەوە ئەرکێکی گەورەی نووسەران و ڕۆشنبیران و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییە: کار بکەن لە سەر هوشیارکردنەوەی هاووڵاتیان، کە مافی خۆیان بزانن و داکۆکی لێ بکەن، ئەرکی دەسەڵات و پارتە سیاسییەکانیش بە خەڵك بناسێنن، کە خزمەتکردن و سوودگەیاندنە بە

---

[1] الاخلاق السياسية، محمد زكريا نداف، چاپی یەکەم: ٢٠٠٦ ل: ٤٣٢.

[2] نظام الحكم فى الاسلام، محمد فاروق النبهان، ل: ٦٧.

[3] الاخلاق السياسية سەرچاوەی پێشوتر، ل: ٤٣٦.

[4] سيادة الامة، قبل تطبيق الشريعة، عبداللة المالكى، چاپی دوەم: ٢٠١٣، ل: ٨٠ـ ٨٥

هاوولاّتیان، نەك خۆ بەبێ عەیب پیشاندان، ئەم پێناسەیەش پێوەری چاکی، یان خراپیی پارتەکانە بە گشتی و پارتە دەسەلاّتدارەکان بە تایبەتی، بۆیە ئازادی ئەوەیە هاوولاّتیان خۆیان و دەوروبەریان بناسن، بزانن ئەرك و مافی خۆیان چییە، ئەرك و مافی دەوروبەریان چییە، ئەوکاتە ئەگەر پارتەکان ئەرکەکانی سەرشانیان بەجێ نەهێنا، بەلّکو لە باتی خزمەتکردنی هاوولاّتیان خزمەتیان بە هەندێك لە کەسە بالاّدەست و شوێنکەوتووی پارتەکانیان دەکرد، ئەوکاتە هیچ مانایەك بۆ بوونی ئەو پارتانە نامێنێتەوە، هەروەها ئەرکی سەرشانی ئەندامان و لایەنگرانە، شانبەشانی ڕێکخراوەکانی کۆمەلّگەی مەدەنی لە پێناوی ئازادیی واتادا کار بکەن لەسەر سنووردارکردنی دەسەلاّتی ئاستە بالاّکانی پارتە سیاسییەکانیان و دانانی میکانیزمی سەردەمییانە بۆ دەساودەستپێکردنی دەسەلاّتی نێو پارتەکان و کارکردن لەسەر بەدامەزراوەییکردنی پارتەکانیان، چونکە مانەوەی سیستمی حیزبایەتی و دەسەلاّتەکان بە شێوازی تاکڕەوی و بەرژەوەندخوازی و پاوانخوازیی بە شێوەی ئێستا، قەناعەت بە بەرپرسە بالاّکان و کەسە دەستڕۆیشتووەکانی نێو پارتەکان دەهێنێت، کە ئەوان سەرکردەی پێویست و موهەمن و ئەلتەرناتیڤ و جێگرەوەیان نییە، ئەوان لە بەرخاتری خەلّك دەمێننەوە و ئیشوکاری پارت و حوکمڕانیی ولاّت بەبێ ئەوان ناڕوات بەڕێوە، خۆ ئەگەر خەلّك وازیان لێ بهێنن، ئەوان پێویستیان بە پشوودان و حەسانەوەیە، بۆیە مانەوەی سیستمی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی پارتی سیاسی بەم شێوازەی ئێستا، جگە لەوەی سەرکردە و بەرپرسی خۆسەپێن دروست دەکات، نائومێدی و بێمتمانەییش بلاّو دەکاتەوە، کە بە پلەی یەکەم

ئۆباڵەکەی لە ئەستۆی شارەزایانە بە تایبەتی و جەماوەری پارتەکانیشە بە گشتی، ئەم بابەتە پرسیارێك دەورووژێنێت ئایا ئەگەر بەرپرسیارێتی لە نێو پارتێکدا کە هەڵگری یەك ئایین و یەك نەتەوە و یەك بیروڕان، ئازادیی ڕادەربڕین بەم شێوازە بێت؟ ئەی لەگەڵ ئەوانەی هەڵگری بیروڕا و ئایین و قەناعەتی جیاوازن، دەبێ هەڵسوکەوت و مامەڵە چۆن لەگەڵ ڕەخنە و سەرەنجەکانیاندا بکرێت؟ چۆن لە پرۆژەیەکی گشتیی چاکسازیی نەتەوەیی و نیشتیمانیدا کۆببینەوە؟! کە هەموو ئەم ئەگەر و گرفتانە ئەوەمان پێدەڵێن ئەبێ ئێمە پێداچوونەوە بە دونیابینی و میکانیزم و سیستمی کارکردنماندا بکەینەوە و سەرلەنوێ بە تێگەیشتن و ڕیتمێکی تازە، ژیان و پرۆژەی پێکەوەبوونمان دابڕێژینەوە، لەگەڵ سوودبینین لە ئەزموونە سەرکەوتووەکانی گەلانی دونیا و دەوروبەر. دەبێ جیاوازی بکەین لە نێوان بنەما تیۆرییەکان و هەڵگران و شوێنکەوتووەکانی ئەو تیۆرانەی کەوا خاوەنی چەندین دەسکەوت و بەرهەمی گەورەن، کە لە کۆیاندا خزمەت بە گەشەی مرۆڤایەتی دەکەن و بلۆکێکن لە کۆشکی پێشکەوتنی مرۆڤایەتیدا، دڵنیا بین لەوەی ئەو دەسکەوتە شارستانییانەی ئەمڕۆ بە هەوڵ و کۆششی مرۆڤەکان گەیشتوون بەم ئاستە و مۆرکی فەلسەفەیەك، یان ئایینێکی دیاریکراویان لەسەر نییە، هەرچەند هەندێك ئایین و نەتەوە بە شێوەیەکی ڕێژەیی، ماندوو بوون و بەرهەمیان زۆرترە، بە درێژایی مێژوو قۆناغ بە قۆناغ سپاردوویانە بە یەکتر و شارستانیەت جێگۆڕکێی کردووە، لەم ئایین و نەتەوە و شارستانیەت، بۆ ئەو ئایین و نەتەوە و شارستانیەتی تر، تا گەیشتووە بە ئەم ئاستەی ئێستا، هیچ گەل و ئایین و نەتەوەیەك بە تەنها خاوەنی ئەم شارستانیەتە نییە، بەڵام

هەرجارە و گەل و نەتەوەیەك سەرکردایەتیی کـردووە و ئالآکـەی هـەڵگرتووە، هەموو ئایین و ئایینزا و نەتەوەکانیش بـایی ئەوەنـدەی لـێ دەزانـن و لەگـەڵ ژینگەی ئایینی و نەتەوەییاندا دەگونجێت، سوودی لێ دەبینن، ئێمەش کاتێك یاسا لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکات و لەسەر کارەکانمان دادگاییمـان دەکـات، نەك لە سەر قەناعـەتەکانمان، هەرکەس بۆخۆی ئازادە بە چ قەناعـەتێك ژیـانی خۆی بەڕێوە دەبات، بـە مـەرجێك زیـان بـە دەوروبـەر نەگەیـەنێت. ئەوانـەی خزمـەتێکی گـشتی دەکـەن و بەشـدارن لـە بـەڕێوەبردنی وڵات و چاکـسازیی کۆمەڵگادا، نابێت چاوەڕێ بن هەمـوو ئـەو کەسـانەی کاریـان لەگـەڵ دەکـەن وەکو خودی خۆیان بیر بکەنەوە، چونکە ئەوکاتە هەمـوو پـلان و پرۆژەکانیـان لـە بـواری تیۆرییـدا دەمێنێتـەوە و ناگەنـە هـیچ ئـەنجامێك، بۆیـە گـۆڕینی قەناعەتی کەسەکان بەدەست ئێمە نییـە و لـە توانـای ئێمەشـدا نییـە، ئـەو جـۆرە هەوڵانــە یــەك ناگرنــەوە لەگــەڵ یاســاکانی پێکــەوەژیان و پــەیامی پێغەمبــەرەکان (درووود و ســەلامی خوایــان لەســەر بێــت) و دونیــابینیی فەیلەسوفان و سیاسەتمەداراندا، بۆیە دەبێ مامـەڵەمان لەگـەڵ دەوڵەتدارییـدا لە لایەك بێت و قەناعـەت و ئایدیۆلۆژییە شەخسییەکان لـە لایـەکی تربێـت، لە یەك جودایان بکەینەوە، کە بتوانین لەباتی ململانێ و تێکگیران، بـبین بـە هاوکار و تەواوکەری یەکتری و هاندەری پێکەوەژیان[١].

[١] لە باسی خاڵە هاوبەشەکاندا، کە چەقی پێکەوە ژیان بن و، خۆ بەدور گرتن لە وروژاندنی خاڵە جیاوازەکان، باسکراوە.

## ٢. دادگەریی:

دادگـەریی کاتێـك دروسـت دەبێـت، ئـەرك و مافـەکان لـە چوارچـێوەی دامەزراوەکاندا، بە کۆمەڵێك یاسای چەسپێنراو دیـاریی کـرابن، ئەگـەر لـە مێژووی حوکمڕانیی ئیسلامییدا، هەموو مەرجەکانی دامەزراوەکانی دەوڵەت لە کەسی یەکەمدا کۆکرابێتەوە[1]، ئەوە لەم سەردەمەدا سیـستمی حـوکمڕانی بەرەو پێش چووە و گەشەیەکی بەرچاوی کردووە، کە توانیویەتی لە سیستمی سیاسی و حوکمڕانیی ماددەگەراییدا، دادگەری بەدی بێنێت، خۆ ئەگەر ئـەو بنەمایانە بکرێت بە بەر سیستمێکی حوکمڕانیی ئیـسلامیی خـاوەن پێـوەری ڕەوشتی و لە خواترسانی، ئەوە چاکتر پیادە دەکرێت، (**إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَــدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ**)[2]، هەرچەند لە مرۆڤدا دوو جۆرە ڕەوشـت هەیـە: ڕەوشـتێك لە کاتی ئاساییدا دەری دەبڕێت، ئەوە ڕەنگدانـەوەی حەقیقـەتی کەسـەکەیە، ڕەوشتێك لە کاتی نائاساییدا، لەبەر دەوروبـەر، یـان کۆمـەڵگا و قـایمکردنی پێگەی دەسەڵات، یان لەبەر خاتری باو و نەریت دەری دەبڕێت، ئەوە ئاکـاری ڕاستی مرۆڤەکان نییە، نابێت بە هاندەر بۆ جێبەجێکردنی یاسا، بـەڵکو بـۆ

---

[1] ئەگەر تەماشای سەرچاوەکانی فیقهی سیاسی مێژوی ئیسلامی بکەیت، هەمو مەرجەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، وەکو: دادگەری و، دەست پاکی و، خزمەتکردنی هاونیشتیمانیان و، بەیەکسانی تەماشای هاولاَتیان کردن، لەکەسی یەکەمدا کۆکراوەتەوە، کراوە بەمەرج بۆ کەسی یەکەم.

[2] النحل: ٩٠.

قەناعەتپێهێنانی دەوروبەرەکەیەتی، بۆ ئەوەی خۆی بە کەسێکی خاوەن ئاکاری بەرز پیشان بدات، بەڵام هەرکات چنگی لە دەسەڵات گیربوو و پێگەی کەوتە مەترسییەوە، ئەوکاتە ڕاستیەکەی دەردەکەوێت، بە نەشیاوترین شێوە هەڵسوکەوت دەکات، بۆیە ئەگەر یاسایەکی تۆکمە نەبێت لغاوی بکات، ئەوکاتە حەزی لە چی بوو ئەوە دەکات، بۆیە ئاکاری ڕاستەقینەی مرۆڤەکان، هاوکارێکی باشە بۆ چەسپاندنی یاسا، بە مەرجێك ڕەنگدانەوەی بێ پێچ و پەنای کەسەکان خۆیان بێت، لە مەیدانا بە کردەوە سەلماندبێتی کە خاوەن ئاکاری بەرز و نموونەی جوانییە، لە جیهانی ئیسلامییدا زۆر جار بەرپرس و کەسە دەسەڵاتدارەکان خۆیان وەکو کەسێکی پابەند بە دینەوە پیشانی خەڵك داوە، بەڵام لەبەر ئەوەی خۆپیشاندانەکەیان لە بەر ڕازیکردنی جەماوەر بووە، لە هەڵسوکەوتی حوکمڕانییاندا دوورترین کەس بوون لە ئاکارە بەرزەکانی وەکو: دادگەری، بەزەیی، خزمەتکردنی خەڵك، دووری لە ستەم و زۆر و گەندەڵی، کە کرۆکی حوکمڕانیی ئیسلامییە، ئەمەش نهێنیی ئەو فەرموودەیەمان پێ دەڵێت: کە مەرجی وەرگیرانی کرداری چاکەی بەستۆتەوە بە نیازپاکییەوە، هەرچەند ئەرکی ئێمە نییە ناو دڵەکان بپشکنین، ئایا ئەو بەرپرسە مەبەستی ڕازیکردنی خودایە، یان بۆ ڕازیکردنی دڵی خەڵکییە؟ بەڵام کە ئاماژەی پێدەکەین، مەبەستمان ئەوەیە: کەسێك لەبەر خودا کارێك ئەنجام دەدات، ئەو کەسە لە هیچ هەلومەرجێکدا هەوڵی سنوورشکێنی نادات، بەڵام کەسێك لە بنەڕەتدا باوەڕی بەو ئاکارانە

نییــه کــه ئــەنجامیان دەدات، بــەڵام هەنــدێك هەلومــەرج ناچــاریان کــردووە ئەنجامیان بدات، ئەوە لای خوا پاداشتی نییە، (**إِنَّمَا الآعْمَالُ بِالنِّيَّات، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَي**)[1]، چونکە ئەو کەسە هەرکاتێك وەزعی تری بـۆ ڕەخـسا، واز لــەو کارانــە دەهێنێــت و دەچــێتەوە ســەر ڕووە ڕاســتەقینەکەی خــۆی، بەهەڵەتێگەیشتن لەم بابەتە و جۆرێك لە دووڕوویی هەندێك سەرکردە وایان لە هەنــدێك لــە شــارەزایانی بــواری ئیــسلامیی کــرد حــوکمی مــسوڵمانەتی و پیاوچاکی ببەخشن بە هەندێك سەرکردەی خۆسەپێن و دیکتـاتۆر، لـە کـاتی لەسـێدارەدانیدا پلـەی شـەهیدیی پێببەخـشن، لەبـەر ئـەوەی لـە قۆنـاغێکی حوکمڕانیدا، لەبەر هەندێك هەلومەرج، هەندێك کـرداری باشـی ئـەنجام داوە، کە ئـەم بۆچـوون و خوێندنەوانـە بـۆ ئـایین و ڕەوشـت، ئـەوە ئـایین و ڕەوشـت دەخاتە ژێر پرسیارەوە، بۆیە کەسێك وەکو خۆی بـە تـەنها دەکرێـت ڕەوشـتی جوانی هەبێت و ڕەوشتی ناشیرینیشی هەبێت، چونکە خوا وا مرۆڤی دروست کردووە، تێکەڵەیەکـە لـە هـەردوو غـەریزە و پاڵنەرەکـە، ئـەو کەسـە خـۆی بەرپرسیارێتیی دونیا و دواڕۆژی کردارەکانی هەڵدەگرێت، بـەڵام کەسـێك لـە ئاستی بەرپرسیارێتیدا بێت، بۆ ئەوەی هەموو دەسەڵات و حوکمڕانی تەنها لە شەخـسی خۆیـدا ڕەنـگ نەداتـەوە، دەبـێ هەڵـسوکەوت و ڕەفتارەکـانی لـە چوارچــێوەی یاســادا بــن، مــاف و ئیمتیــازە شەخــسییە مــاددی و مەعنەوییەکانی و سنووری دەسەڵاتەکانی، بە یاسـای گـشتی ڕێـك بخرێـت و

---

[1] صەحیحی بوخاری: ١/٤/١.

ڕوون و ئاشکرا بێت، بۆیە لە لێپێچینەوەی داراییدا لە ئیسلامدا بنەمایەك هەیە، کە سەرکردە و خەلیفە دادپەروەرەکان لەگەڵ دەوروبەری خۆیاندا کاریان پێکردووە، ئەویش پێی دەوترێت بنەمای: ئەم ماڵەت لە کوێ بوو؟ [1] بۆیە ئەوەی ئەو ماف و ئیمتیاز و بەخششانەی بە هەر بیانویەکەوە پێ بدرێت، یان بە کەس و ئاستە باڵاکان بدرێت، مادام لە چوارچێوەی یاسادا جێگەی نەکراوەتەوە، یان بە میزاجی کەسە یەکەمەکان دانراوە، یان بە میزاجی دەوروبەرەکەی خۆی دانراوە، کە ئەویش پڕە لە خاتر و خۆتر، هیچیان لە چوارچێوەی یاسادا نییە، بۆیە سەخاوەتی کەسە یەکەمەکان و ماڵبەخشینیان، یان سزا و تۆڵەسەندنەوەیان، کاتێك لە چوارچێوەی ڕەوشتبەرزیدا جێگەی دەبێتەوە، کە کرابێت بە یاسا، چونکە بەرپرسێك موچە و مەعاشی دیار و ئاشکرا بێت، بەڵام ئەو دوو ئەوەندە و سێ ئەوەندە خەرج دەکات، لە کوێی هێنا؟ یان دەبێ کەسابەتی کردبێت؟ یان دەستکاریی ماڵی گشتی کردووە؟ یان لە پەنای پیشەکەیەوە، دیاری و بەخششی وەرگرتووە؟ بۆیە کاتێك لە نێو دەسەڵاتەکاندا، چ حیزبی بێت، یان حکومیی،

[1] وەکو بنەمایەکە عومەری کوڕی خەتاب، خوا لێی ڕازی بێت، لەگەڵ والی و، کارمەندەکانیدا ئیشی پێ ئەکرد، سراج الملوك، ابو بكر الطرطوشی، ١/ ٢٩٦. بەڵام وەکوپێشتر باسمان کرد هەمو مەرجەکانی بەڕێوە بردنی دەوڵەت لەکەسی یەکەمدا کۆکراوەتەوە، کە ئەو خەلیفەیە خۆی دادگەر بوە، لەهەمو ڕوەکانی ترەوە بەسەر خۆی ودەورو بەریدا جێ بە جێی کردوە، وەکو لەمەودوا لەجیاکردنەوەی دەسەلاتەکاندا باسی ئەکەین، شێوەی دامەزراوەیی وەرنەگرتوە، کە لەچوار چێوەیکی ئاکاری کەسە هەڵکەوتوە کانەوە، ببێت بەیاسا دوای خۆیان کەس نەتوانێت لێی لابدات.

دادگەری دەچەسپێت، کە هەموو ئەرك و مافەکان لە قالّبی یاسا بدرێت،  بە شێوەیەکی گشتی نەبوونی یاسا، یەکسانە بە نەبوونی دادگەری، کە ئەمەش کێشەی هەرەگەورەی نێو هەموو دەسەلاّت و پارت و ڕێکخراوەکانە،  ئەگەر بمانەوێت بە ئاسوودەیی پێکەوە بین، پێویستە لە چوارچێوەی یاساکاندا دادگەری جێگیر بکەین، تاوەکو هاوولاّتی و دەسەلاّتدارەکان، هەرکەس بایی خۆی بوونی هەبێت و بە یەکتر دلّخۆش بن.

## ٣. جیاکردنەوەی دەسەلاّتەکان:

کاتێك بمانەوێت پێکەوە بژین، دەبێ هەموومان ڕێز لە ئیرادە و مافی یەکتر بگرین، نابێ هیچ کەسێك لەباتی ئەویتر بیر بکاتەوە، یان کارەکانی ڕاپەڕێنێت، یان جگە لە دەسەلاّتەکانی خۆی، داوای دەسەلاّتی ئەوانی تریش بکات بۆ خۆی. دەبێ لەوەش تێبگەین ئەو کەسەی داوا دەکات هەموو ئەرکەکان ڕاپەڕێنێت، پێش ئەوەی ڕەچاوی بەرژەوەندیی گشتی بکات، تەماشای بەرژەوەندیی شەخسی خۆی دەکات، دەیەوێت دەسەلاّتە ماددی و مەعنەوییەکان لە خۆیدا کۆ بکاتەوە و هەژموون بکات بەسەر هەموو دەسەلاّتەکاندا. ڕازیبوون بەم جۆرە بیرکردنەوانە لە نێو پارت و دەسەلاّتەکاندا، سەرەتای گەندەلّیی ئەو پارت و دەسەلاّتەیە،  لە هەر پارت و ڕێکخراوێکدا، هاوسەنگیی دەسەلاّت تێکچوو ئەوکاتە ئەو هێزە دەکەوێتە ململانێی نێوخۆییەوە، پاشان بەرەو دووبەرەکی و لەتبوون مل دەنێت، لەبەر ئەوە نەگونجاوە خەلّکانێك کەوا خاوەن قەناعەتی جیاوازن، یان خاوەن

بەرژەوەندیی جیاوازن، ئەگەر کۆمەڵێك یاسا و بنەمای توندوتۆڵ و بەهێز نەبێت، بە هیچ شێوەیەك پێکەوە، درێژە بە کار و خەباتیان بدەن، لەوانەیە هەندێك قەناعەتی وابێت، بوونی ئەنجومەنی جۆراوجۆر لە دەسەڵات و حوکمڕانیدا، یان لە نێو پارتەکاندا، سنوور بۆ تاکڕەویی کەسی یەکەم، یان ئەوکەسانەی دەیانەوێت ببن بە جەمسەر دا بنێت، یان ماوە نەدات هاوسەنگی دەسەڵات لە ناو کاراکتەرە جیاکانی دەسەڵات و پارتەکەدا تێك بچێت، بەڵام ئەم جۆرە بیرکردنەوانە، بەشێکە لە خۆلادان لە ڕاستییەکان و نەوەستان لە ڕیزی خەڵکانی گۆڕانکاردا، چونکە ئەزموون سەلماندوویەتی هەرکاتێك دەسەڵاتەکان تێکەڵ بوون، کەسی یەکەم و ئەندامانی پارتەکەی، یان ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی کەوا بەرژەوەندییان پێکەوە بەستراوە، بە ناوی ئەوەی ئەو ئەزموون و لێزانینەی ئەوان دەربارەی سیاسەت و دارایی و بەڕێوەبردن هەیانە، کەسانی تر نییانە، ئەو خەمخۆرییەی ئەوان هەیانە بۆ پارت و ڕێکخراوەکەیان، کەسانی تر نییانە، هەرچی پێگە هەستیارەکان و جومگە گرینگەکانی پارتەکەیانە بیگرنە دەست، ئەمەش هەنگاونانە بۆ ئەوەی ئەوکەسانەی بەتەمەنن، یان مێژوویەکی زیاتریان لە کاری حیزبی و ڕێکخراوەییدا هەیە، متمانە بە کەسانی تر نەکەن و هەندێك کەسی نێو سەرکردایەتی و مەکتەبی سیاسی بە هاوئاستی خۆیان نەزانن، بۆیە ئەو جۆرە هاوڕا و هاوتەمەنانە لە هەرشوێنێك بوون، لە ڕێکەوتنێکی عورفیدا، یان بە ڕێکەوتنی تری جۆربەجۆر، داکۆکی لە بۆچوون و قەناعەت و بەرژەوەندییەکانیان دەکەن، بۆیە لێرەوە دەگەینە ئەو ئەنجامەی لەو جۆرە ئەنجومەنە جۆربەجۆرانە هەرچەند هەبێت، تەنها بە ناو لێك جودان، بەڵام لە

ڕاستی و واقیعدا هەر یەك بیرکردنەوە و بۆچوونی خاوەن پێگەی بەهێز ئەو پارت و دەسەڵاتە دەبات بەڕێوە، تەنها بە ناو دەسەڵاتەکان جیاکراونەتەوە، دەبێ ئاماژە بە ڕاستییەکی تاڵ بکەین، ئەم شێوەیەی ئێستا سیستمی حوکمڕانیی وڵاتە دیموکراسییەکانی لەسەر دامەزراوە، لە مێژووی حوکمڕانیی ئیسلامییدا نەبووە، میکانیزمەکانی ئەو سەردەمە بۆ ڕاستکردنەوەی دەسەڵات تەنها فشاری هەندێك لە زانایان و بانگخوازان بووە، هەندێك لەوان دژ بە گەندەڵی و ستەم و زۆری دەسەڵات ڕاوەستاون و هەوڵەکانیان خستۆتە گەڕ بۆ چاکسازیی لە کەسی یەکەم و والییەکان و کارمەندانی دەوڵەتدا، زۆربەی جار فشارەکانیان لە ڕێگەی دڵسۆزیی نواندن و ئامۆژگاریی بۆ خەلیفە و والییەکان بووە، دیارە سنووری کاریگەریی ئامۆژگاری کەمە و هەر چاکسازی و گۆڕانکارییەکیش بکرێت، بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە ئەنجام دەدرێت، ئەگەر ئامۆژگاری و ڕوونکردنەوەکان بەهێز و پێز بووبن، ئەوە بۆ ماوەیەکی کەم شوێنەواریان لەسەر هەندێك لە خەلیفە و دەسەڵاتدارەکان بەجێ دەهێشت، بۆیە زانا گەورەکان و زاهیدە ناودارەکان و شارەزایانی فیقهی سیاسیی زیاتر پێی هەستاون.

بۆ نموونە زانایەکی ناوداری وەکو ئیمامی غەزالی کتێبێکی نووسیوە بە ناوی: (التبر المسبوك فی نصیحه الملوك)، کە بە زانست و بابەتی کۆمەڵناسی و چۆنیەتیی هەڵسوکەوت لەگەڵ ڕەعیەتدا، بە دەستەواژەی واتادار، ڕازاندوویەتیەوە، خوێنەر لە ژێر دەستی دەرناچێت، بە جۆرێکە ئەگەر دڵسۆزیی بەخەرجدان و ئامۆژگاریی بە تەنها بەبێ یاسا و چاودێری و دەسەڵاتی خەڵك و جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان، سوودی هەبوایە ئەبو خەلیفە

و پاشاکانی سەردەمی ئیمامی غەزالی و زانایانی تری هاوشێوەی ببوونایە بە فریشتە و بگەیشتنایە بە چڵەپۆپەی دادگەری! وە ئەبو ئامۆژگاریکەر و ئامۆژگاریکراو و نوێژخوێنانی مزگەوتەکان هەموویان، لە ڕیزی ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکاندا بوونایە، بەڵام دیارە ئامۆژگاریی سنووری هەیە، دەبێ ئەو ڕاستییە بزانین جیاکردنەوەی دەسەڵات لە ئیسلامدا بنەمایەکی بەهێزی هەیە، ئەگەر لە سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیدا کاری پێویستی بۆ بکرایە، ئەوە ئێستا سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامی قۆناغێکی گەورەی بڕی بوو وە لە مەبادیئی ئیسلامیدا لە چەند ڕێگایەکەوە پشتیوانی لە جیاکردنەوەی دەسەڵاتەکان کراوە، یەکێك لەو ڕێگایانە: پاڵنەری لایەنی ئایینییە، کە ڕێگریی دەکات لە بەخراپ بەکارهێنانی دەسەڵات و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و خۆسەپاندن بە ڕێگەی ناڕەوا.

وەکو ئیبنو خەلدون ئاماژە بە هەندێکیان دەکات و دەڵێت: عومەری کوڕی خەتتاب پۆشاکەکانی پینە دەکرد، یان عەلی دەی وت: ئەی زێڕ و زیوەکان دەسەڵاتی منتان نییە، بڕۆن کەسانی تر لە خشتە بەرن، یان کاتێك ئیمامی عوسمان گەمارۆ درا، وتی: ڕازی نیم کەس لەسەر من خوێن بڕێژێت[1]، یان ئەهلی حەل و عەقد لە ئیسلامدا کەسانێکی سەربەخۆ بوون، هیچیان بەرپرسی ئیداریی، یان سەربازیی نەبوون، یان قازییەکان کەسانێك بوون دوور بوون لە بابەتی یاسادانان و سەرکردایەتیی سەربازی و ئیداریی، یان

[1] مقدمة ابن خەلدون، چاپی: ٢٠٠٦، ل: ٢١٤- ٢١٧.

خەلیفەکان دەستیان نەخستۆتە کاروباری قەزاوەتەوە[1]، ئەبو ئەعلای مەودودی دەڵێت: لە مێژووی قەڵەمڕەوی ئیسلامیدا، نەمان بینیوە کەسێك لە یەك کاتدا لە وڵاتێکدا، قەزاوەت و ئیدارەی بردبێت بەڕێوە، یان ڕێگەمان نەکەوتووە لە کارمەندێك، یان ئەمیرێك، یان سەرۆکی وڵاتێك، دەست بخاتە کاروباری قەزاوەتەوە[2].

[1] نظرية الدولة فى الاسلام، د. عبدالغنى بەسيونى، ل: ١٨٢، وة دراسات دولية، د. عصام جميل العسلى، ضاثى: ١٩٩٨، ل: ٤٢.

[2] نظرية الاسلام وهدية فى السيادة، والقانون، والدستور، ئەبو ئەعلای مەودودی، ل: ٢٦٩. لەسەرچاوەی پێشو وەرگیراوە، ل: ١٨٣.

## ١. گوتـاری سیاسیی پارتە ئیسلامییەکان:

### سەرەتا پێناسە:

گوتـاری سیاسـی بـەو پـەیـام و نوسـراو و گـوتراو و هـەڵوێـست و سـلوکانە ئـەوترێـت، کـە لایـەنێکـی سیاسـی بـەکاریـان ئـەهێنێـت بـۆ قـەناعـەتپێکردنـی جـەمـاوەر و هانـدانیان بـۆ مـەبـەسـت و ئامانجـە دیـاریکراوەکـان، کـاتێکیش ئـەو گوتـارە سـەرکـەوتـووە، خـەڵکـی خولیـا و ئامانج و ئاواتە سیاسی و نەتەوەیی و ئـابووری و کۆمـەڵایـەتییـەکانیـانی تێدا ببیننەوە، گوتاری تێر و تەواو یەکێکە لە سـەرچـاوەکانی هێز، وەکو خوای باڵادەست نهێنیی توندوتۆڵیی دەوڵەت و دەسەڵاتـەکەی پێغـەمبـەر داود (درووود و سـەلامـی خـوای لـەسـەر بێـت) گێـڕاوەتـەوە بـۆ ڕێـک و ڕەوانیی گوتاری: (وَشَدَدْنَا مُلْكَهُ وَآتَيْنَاهُ الْحِكْمَةَ وَفَصْلَ الْخِطَابِ)[١]. هـەمـوو کەموکورتییەک، یان لە بواری مومارەسـە و دەرئـەنجامـدا دەرئـەکـەوێت، یـان لـەسـەر زاری خـەڵکـانی ڕەخنـەگـر و چـاودێردا دەرئـەکـەوێـت، هەستکردن بە کەموکورتیش پلەیەک نییە دەست هەمـوو کـەس بکـەوێت، بەڵکو مەدالیا و شـەرەفێکە بۆ کەسانێک ئەبێت: (لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَي السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ)[٢].

### گوتـاری بزاڤە ئیسلامییەکان لە ئێستادا:

- **ناڕوونیی گوتارەکانیان لە لای خەڵك**

خـەڵکـی تێبینییـان لـەسـەر دینداری و ئـەمینـی و سـەرڕاسـتیی لایـەنـە ئیسلامییەکان نییـە، سـەرکردە و زانـا و بـانگخوازەکانیـان بـاش ئـەناسـن،

---

[١] ص: ٢٠.

[٢] ق: ٣٧.

بەلام خەڵكی چەندێک متمانەیان هەیە لایەنە ئیسلامییەكان نوێنەری كێشە نەتەوەیی و سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی وخزمەتگوزاریەكانیان بن، بە جۆرێک لە چەقی گوتار و پەیام و پلانیاندا داخوازییەكانیان ببیننەوە؟ هەموو خەڵكەكە بە مسوڵمانان و غەیرە مسوڵمان و هەموو ئاین و ئاینزا و ڕێڕەوەكانەوە، بە نوێنەری خۆیانیان بزانن و ئومێد و ئاواتە سیاسی و ئابووری و كۆمەڵایەتی و خزمەتگوزارییەكانیان لە لای ئەوان ببینن و ئەوەیان لەلا بەرجەستە ببێت، كە داخوازییەكانیان جەوهەری ئەولەویەتی ئەوانە، كە ئەم جۆرە مامەڵەكردن و شێوازی حیزبایەتیكردنە لەگەڵ ڕوحی شەریعەت و پەیامی ئیسلامی و دەوڵەتەكەی مەدینەی پێغەمبەردا (صلی اللە علیە وسلم) ئەگونجێ[1].

بۆیە لێرەوە پێویستە لایەنە ئیسلامییەكان زۆر هەڵوێستە لەسەر ئەو پرسیارە بكەن كە لە شوێنێكی وەكو هەرێمی كوردستاندا ٩٥%ی دانیشتوانەكەی مسوڵمانە[2]، هۆكاری چییە ڕێژەی جەماوەریان وەكو لە دەنگدانەكاندا دەرئەكەوێت، لە ١٥% بۆ ٢٠% تێپەڕ ناكات؟! ئایا ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لایەنە ئیسلامییەكان پلان و ستراتیژیەتی كار و گۆڕانكارییەكانیان بۆ خەڵك و جەماوەر زۆر ڕوون نییە و وەكو پێویست نازانن بەرەو چ ئاسۆیەک ئەڕۆن؟ جگە لەمانەش كۆمەڵێک ڕواڵەت و دروشم و باو و نەریتی حیزبایەتی هەن لە ناو لایەنە ئیسلامییەكاندا، بوونەتە هۆكاری جیاكارییان لە خەڵک، كە لە

---

[1] مەبەست ئەومادەو بەندانەیە، كەوا لەدەستوری مەدینەدا ئاماژەی بەمافە ئایینی ونەتەویی و، ئابوری پێكهاتەكانی شاری مەدینە داوە.

[2] سایتی: مركز العراق للمعلومات الديمقراطية، خەملاندنێكی لەسەر پێكهاتەی دانیشتوانی عێراق بەكوردو عەرەب وتروكمانەوە كە ٢٠٠٣ ئەنجام دراوە بلاو كردۆتەوە، تیایدا هاتوە: ژمارەی مسوڵمانانی بە: ٩٢٪ بۆ ٩٥٪ مەزەندە كردوە.

ڕابوردوودا خۆمان بۆ خۆمانمان داناوه و ئێستا که ماوەیەکی بەسەردا ڕۆیشتووه، لیمان بوون به دین و قوتارمان نابێت لێیان[1].

ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەران بکەین (دروود و سەلامی خوایان لەسەر بێت)، هەموویان پەیامەکانیان چارەسەری کێشەی سیاسی و ئابووری و کۆمەلایەتی و هوشیارکردنەوەی گەل و نەتەوەکانیان بووه، به مانایەکی تر ئەوان تەنها واعیز و بانگخوازێک نەبوون، که تەنها به دەقی ئاینیی بانگی خەڵک و نەتەوەکانیان بکەن بۆلای ئاینەکانیان.

## گوتار و لێدوانی تایبەت و بژاردەیی:

سەرەتای گۆڕانکارییش ئەبێ له گوتاری بژاردەیی لایەنه ئیسلامییەکانەوه دەست پێ بکرێت، که پەیام و بیرکردنەوه و نەخشه و پلان و کارنامه و دونیابینی و هەلوێست وەرگرتنیان و ململانێکانیان زۆربەی له چوارچێوەی بیرکردنەوه و دونیابینی و چارەسەری بژاردەیەکی ئیسلامیدایه، ئێستا ئەمه پێناسەیەکه و پێی ئەناسرێنەوه و بۆته کالای بالایان، پارته ئیسلامییەکان تا ئێستاش به شێکی بەرچاوی گوتار و لێدوانەکانیان بۆ ڕازیکردنی تەوژمێکی سەلەفییه، که دەبێ مه سەله و بابەت و هەلوێسته سیاسییەکان هەڵگری بەڵگەی شەرعی بن، بۆ ڕازیکردن و قەناعەتپێهێنانی ئەم توێژه، هەندێک له گەوره نووسەران و ڕۆشنبیرانی ڕابوونی ئیسلامیی، نووسینەکانیان له چوارچێوەی عەقیده و پەرستشەکان و پشتیوانیی بۆ ئیمانداران و بەریبوون له بێباوەڕان و هێنانەوەی بەڵگەی شەرعی لەسەر پرۆسەی سیاسی و هەلوێستی نەتەوەیی و چۆنیەتیی هەڵسوکەوت لەگەڵ پارته عەلمانییەکان و چەپ و ناسیۆنالیستەکاندایه، زۆرجار بۆ چارەسەری بابەتێک پەنا دەبرێت بۆ ڕای هەندێک زانا که له نێو سیاسەتدا گەوره

[1] وەکو ناوی پارت و، پەیکەری پارت و، پرۆژەو گووتاری ئێستای پارت و، خۆپەراوێز خستن.

نەبوون، یان حەوت سەدە پێش ئێستا ژیاون، ڕا و قسەکانیان بەبێ هەڵسەنگاندن دەکرێن بە بەڵگەی شەرعی، ئەم کارانەی نووسەران و ڕۆشنبیران و شەرعزانەکانی ڕابوونی ئیسلامیی کردوویانە، تا ئێرە جێگەی ڕێزەۆو خزمەتێکی گەورەیە بە هوشیاریی ئیسلامیی، بەڵام ئەوەی جێگەی پرسیارە ئەوەیە: ئایا ئەم ڕیتمە گوتارە تا کەی بەردەوام دەبێت و لە کوێدا دەوەستێ؟ بۆیە هەموو ئەو هەڵوێستە نیشتیمانی و نەتەوەییانەی لە پێگە و بۆنە تایبەتییەکاندا لایەنە ئیسلامییەکان دەری ئەبڕن، وەکو پێویست تکایان بۆ ناکەن و باڵانسی پێگەی جەماوەرییان بەرز ناکەنەوە و تینوویەتیی جەماوەر ناشکێنن، خۆ ئەگەر هەموو ئیسلامییەکانی هەرێمی کوردستان بەبێ هەڵاواردن، لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگ بە لایەنە ئیسلامییەکان بدەن، ئەوپەڕی ڕێژەی٢٠% ئەکات، ئەی کوا پەیاممان بۆ ٨٠%ەکەی تر؟ لەبەرچی ئەو ڕێژە گەورەیە بە پەیام و گوتاری لایەنە ئیسلامییەکان دڵخۆش نین؟ ئەی ئەم ڕێژە و داتایانە نابێ وا لەلایەنە ئیسلامییەکان بکەن، پێداچوونەوەیەکی جیددی بە پلان و بەرنامە و دونیابینی و ڕواڵەتی کارەکانیاندا بکەنەوە؟ هەندێک ئەم ئایەتە پیرۆزە (**وَمَا أَكْثَرُ النَّاسِ وَلَوْ حَرَصْتَ بِمُؤْمِنِينَ**)١ ئەکەن بە بیانووی جەماوەرییننەبوونی لایەنە ئیسلامییەکان، لە کاتێکدا ئەم ئایەتە بەڵگە نییە بۆ نائومێدبوون لە جەماوەر، چونکە مەبەستی ئەم ئایەتە بۆ قۆناغی جێگیربوونی ڕێباز و بیروباوەڕ ز سەرەتای بانگەواز و پێگەیاندنی بژاردەیە، بە بەڵگەی ئەوەی خوای گەورە لە شوێنی تردا ئەفەرموێت (**أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَمَنْ فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ وَالشَّجَرُ وَالدَّوَابُّ وَكَثِيرٌ مِنَ النَّاسِ وَكَثِيرٌ حَقَّ عَلَيْهِ الْعَذَابُ وَمَنْ يُهِنِ اللَّهُ فَمَا لَهُ مِنْ مُكْرِمٍ إِنَّ اللَّهَ يَفْعَلُ مَا يَشَاءُ**)٢، واتە: تۆ نابینی ئەوانەی

---

[1] یوسف:١٠٣.

[2] الحج: ١٨.

وا له‌ ناو ئاسمانه‌كان و ئه‌وانه‌ی وا له‌ ناو زه‌میندان و خۆر و هه‌یڤ و ئه‌ستێره‌كان و كۆسار و دره‌خته‌كان و جانه‌وه‌ر و زۆر له‌ مه‌ردم سوژده‌ له‌ بۆ خودا ده‌به‌ن؟ زۆرێكیش ئازاریان له‌بۆ بڕیار دراوه‌. خودا هه‌ركێ تووشی سووكایه‌تی بكات، تازه‌ كه‌س ڕێزی لێ نانێ. دیاره‌ خودا هه‌رچی ئاره‌زووی بێ ده‌یكات. كۆتایی ئه‌م ئایه‌ته‌ نیشانه‌ی ئه‌وه‌یه‌ هه‌ندێك قۆناغ دێت مسوڵمانان به‌ توانا و به‌ده‌سه‌ڵات ئه‌بن و زۆرینه‌ی خه‌ڵك ڕوو له‌ خواپه‌رستی ئه‌كه‌ن و كوڕنووش بۆ خوا ئه‌به‌ن، هه‌روه‌كو پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) ئه‌فه‌رموێت: (**لَيَبْلُغَنَّ هَذَا الَامْرُمَا بَلَغَ اللَّيْلُ وَالنَّهَارُ**)[1].

- **سه‌رقاڵبوون به‌ بابه‌تی لاوه‌كییه‌وه‌ به‌ نموونه‌ : سروودی ئه‌ی ڕه‌قیب**

یه‌كێكی تر له‌و بابه‌ته‌ لاوه‌كییانه‌ی هه‌ندێك له‌ لایه‌نه‌ ئیسلامییه‌كان خۆیان پێوه‌ خه‌ریك كردووه‌، سروودی ئه‌ی ڕه‌قیبه‌، كه‌ له‌ كوردستانی باشوور بۆته‌ جێگه‌ی مشتومڕی لایه‌نه‌ ئیسلامییه‌كان، زۆر جار له‌گه‌ڵ پارته‌ ده‌سه‌ڵاتداره‌كانی كوردستان له‌ كۆڕ و كۆبوونه‌وه‌ ڕه‌سمی و ناڕه‌سمی و تایبه‌ته‌كاندا، هه‌ڵوێستوه‌رگرتنی له‌سه‌ر دروست ده‌بوو داوا ده‌كرا ئه‌و بڕگه‌یه‌ی كه‌ ده‌ڵێت: (دینمان ئایینمان هه‌ر نیشتیمان) له‌ سروده‌كه‌ لابرێت، جار جار ده‌بوو به‌ مانشێتی ڕۆژنامه‌كان، هه‌ندێ كاتی تر له‌ كاتی بانگه‌شه‌ی هه‌ڵبژاردنه‌كاندا بۆ ڕاكێشانی سه‌رنجی خه‌ڵكێكی دیندار، كاندیدی هه‌ندێك له‌ لایه‌نه‌ ئیسلامییه‌كان كاریان له‌سه‌ر ده‌كرد و په‌یمانیان ده‌دا به‌ هاووڵاتیان ئه‌گه‌ر ده‌نگیان پێبده‌ن، له‌ په‌رله‌ماندا كار ده‌كه‌ن بۆ

---

[1] موسنه‌دی ئه‌حمه‌د ١٦٣٤٤/٣٠٨/٣٤

دەرکردنی یاسایەك کە ئەی ڕەقیب وەکو سروودی نەتەوەیی نەمێنێت، لە ئەگەری ١٠٠٪ ڕەوابوونی ئەم داوایەدا و تێکگیرانی سرودەکە لەگەڵ بنەما نەگۆڕەکانی شەریعەتی ئیسلامییشدا، ئایا بە گوێرەی بنەماکانی ڕێگریی لە خراپە و بێشەرعیی، ئەم سرووده دەکرێت بکرێتە ستراتیژیەتی یەکەمی لایەنە ئیسلامییەکان؟ کە هەندێك لە نووسەران و ڕۆشنبیرانی لایەنە ئیسلامییەکان، تەئویل و ڕاڤەی تر بۆ سرووودی ئەی ڕەقیب دەکەن و لەو سیاقە دەری دەکەن کە بەشێك لە لایەنە ئیسلامییەکان مەترسییان لێی هەیە، خۆ ئەگەر هەموو شەرعزان و نووسەران و هونەردۆستەکان گەیشتنە ئەو قەناعەتەی ئەو ڕستەیە پێچەوانەی بیروباوەڕی مسوڵمانانە، وەکو هەندێك لە لایەنە دەسەڵاتدارەکانی هەرێمی کوردستان خۆشیان ڕایان لەسەر گۆڕینی ئەو سرووده هەیە، بەڵام مانەوەی ئەم سرووده لەچاو چەندین خراپە و کەموکورتیی گەورە، کە لە بەڕێوەبردنی دارایی و زەوتکردنی دەسەڵات و سیستمی حوکمڕانی و قۆرخکاریی و گەندەڵی لە هەرێمدا هەیە، کامیان زەرەری زۆرترە؟ خۆ لە ئەگەری بەردەوامبوونی ئەو هەموو قەیرانە دارایی و سیاسی و دیارنەبوونی چارەنووسی هەرێمی کوردستاندا، ئەگەری تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵایەتی و شەڕی نێوخۆ و لەناوچوونی هەرێمی کوردستان هەیە، خۆ ئەگەر سرووودی ئەی ڕەقیبیش لابرا، ئەو مەترسییانە هەر دەمێنن، سیستمی حوکمڕانیی هەرێمیش باش نابێت، گەندەڵی و ستەم و زۆر و بەزایەدانی ماڵی گشتی هەر دەمێنێت.

بۆیە دەمەوێت بڵێم: پێویستە پارتە سیاسییەکان بە گوێرەی گرنگی و لەتوانادابوونیان، لە نێوخۆی خۆیاندا پلان بۆ گۆڕانکارییەکان دابنێن، زۆر

مەسـەلەی چارەنووسـسازی گـەورە هەیـە دەبـێ ڕێکخراوەکـانی کۆمەڵگـەی مەدەنی و زانایانی ئایینی، لەگەڵ چین و توێژەکان بە تێـر و تەسـەلی قـسەی تەواویان لەسەر بکەن و ئەوان یەکلای بکەنەوە، هیچ پەیوەندیی بە سـەرکردە و ئاستە باڵاکانی لایەنە ئیسلامییەکانەوە نییە، ئەبێ لایـەنـە ئیسلامییەکان خۆیـان بپـارێزن لـە تێـوەگـلان لـە قـسە و مـشتومڕ بـۆ یەکلاکردنـەوەی هـەموو ئـەو بابـەتـە فیکریی و فیقهییانـەی لـە نـاو خـەڵکی بـە گشتی و شارەزایان بە تایبەتی جێگەی خیلاف و ڕاجیایین و چەند ڕایەک هەڵ ئەگرن، یەکلاکردنەوەی هەموو ئەو مەسەلانە جێ بهێڵن بۆ شـارەزایان و زانایـانی ئیـسلامیی و ڕێکخـراوەکـانی کۆمـەڵگـەی مـەدەنـی بـا ئـەوان قسەی پێویستی لـەسـەر بکـەن و یـەکلایی بکـەنـەوە، بابـەتـە یاسـایی و فیقهییـە چـارەنووسـسازەکـانیش کـە مـشتومڕی زۆریـان ئـەوێـت و پەیوەندییان بە هەموو خەڵکەوە هەیە، خۆیان توانـای یـەکلاکردنـەوەیـانی نییـە، بیگێڕێنـەوە بـۆ پـەرلـەمـان بـا لـەوێ قـسەی لـەسـەر بکرێـت و یەکلاکردنەوەی بسپێرن بە ئەوان.

دەبێ ئەوان لە کوللیات و بابەتـە جەوهـەری و چارەنووسـسازەکاندا قـسە بکەن، بابەتە مشتومڕهەڵگرەکان و ئەو بابەتە فیقهییانەی جێگـەی خـیلاف و ڕاجیایین، با ڕێگەی سروشتیی خۆیان بگرنە بەر، دوای ئەوەی ڕێکخراوەکان ڕا و بۆچوونەکانی خۆیان بە پڕۆژە گەیاندە پەرلەمان، ئەوکاتـە بـا نوێنـەرانی خـەڵك لـە پەرلەمانـدا ئەوانـەی دژیـن و ئەوانەشـی پـشتیوانی لـێ دەکـەن، گفتوگۆی لە سـەر بکـەن، لـە لایـەکی تریـشەوە لایەنـە ئیـسلامییەکان، بـۆ چەسپاندنی پڕۆژە و دەرکردنی یاساکان پێویستیان بە لایەنـەکانی تـر هەیـە، بۆیە دەبێ دروشمەکانیشیان لە چوارچێوەی داوا و خواستەکانی خەڵکیدا بێت، بە تایبەت چارەسەری ژیان و گوزەرانی خەڵك و ئاسایشی گشتی و چارەسەری

قەیرانی سیاسی و ئەو مەترسییانەی هەڕەشە لە گەل و ولاّتمان دەکەن، بۆیە بۆ تێپەڕاندنی هەموو پڕۆژەیەك جگە لە خۆیان، دەبێ لایەنەکانی تریش کەم تا زۆر قەناعەتیان پێی هەبێت و بەشێك لە بەرژەوەندییەکانی خۆیانی تێدا ببیننەوە، نابێ ڕێگە بدەن مۆرك و بەرژەوەندیی پارتێك، یان ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەت، باڵ بکێشێت بە سەر پلان و پڕۆژە گۆڕانکارییەکانیاندا، یان هەندێك بابەت هەیە لەوانەیە بە لای ئەندام و لایەنگرانی پارتێکەوە گرنگ بن، بەلاّم جێگەی بایەخی زۆرینەی خەڵك نین، یان جەماوەر ئەو جۆرە قسە و باسانەی ئەوانیان پێ هەرس ناکرێت[1]، ئەوکاتە دوای دەرچوونی هەر یاسایەك لە پەرلەمان، لایەنە ئیسلامییەکان دەتوانن داوای گۆڕانکاریی لەو بڕیارانەدا بکەن کە نامۆن لە هەرێمی کوردستان و ئەوان تێبینییان لەسەری هەیە، داوا لە لایەنە پەیوەندیدارەکان بکەن گۆڕانکارییان تێدا بکەن.

## • زاڵکردنی ئایدیۆلۆژیایەکی تایبەتی بەسەر داوکارییەکانی خەڵکیدا، بە نموونە بە هاری عەرەبی:

ئێمە باس لە لێکتێگەیشتن و پێکەوەژیان دەکەین، بۆیە هیچ لایەنێك بە تەنها نابێ بیر لە گۆڕانکاریی لە بابەتێکدا بکاتەوە کە پەیوەندیی بە

---

[1] پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم هەندێك گۆڕانکاری پێ خۆش بو، بەلاّم لە بەر ڕای خەڵکی دەستی بۆ نابرد، وەکو ئەفەرموێت: (يَا عَائِشَةُ، لَوْلَا أَنَّ قَوْمَكِ حَدِيثُوا عَهْدٍ بِشِرْكٍ، لَهَدَمْتُ الْكَعْبَةَ، فَأَلْزَقْتُهَا بِالْأَرْضِ، وَجَعَلْتُ لَهَا بَابَيْنِ : بَابًا شَرْقِيًّا، وَبَابًا غَرْبِيًّا، وَزِدْتُ فِيهَا سِتَّةَ أَذْرُعٍ مِنَ الْحِجْرِ، فَإِنَّ قُرَيْشًا اقْتَصَرَتْهَا حَيْثُ بَنَتِ الْكَعْبَةَ، مسلم، ژمارە: ٢٣٧٨.

چارەنووسی لایەنەکانی ترەوە هەیە، ئەگەر داواکارییەکەشی سەد لە سەد ڕەوا و بەجێ بوو دەبێ حیسابی ئەوە بکات لایەنە پەیوەندیدارەکان ڕازیی نەبن، ئەوە ئەو داوایە سەرناگرێت و لەوانەیە چەندین کێشەی سیاسیی تری لێ پەیدا ببێت، ئەوکاتە ئەو لایەنە ئیسلامییە لەباتی ئەوەی لای خودا پاداشتی دەست بکەوێت و جەماوەر دەستخۆشی لێ بکەن، لە لای خودا تاوانبارە، چونکە لە ڕێگەی خۆیەوە نەبووە، کە لە هەوڵی چاکسازییەکدا خراپەی تری لێ پەیدا بووە، خەڵکیش قبوڵیان نییە، چونکە لە ڕێگەی نوێنەرەکانیانەوە نەبووە، لێرەوە دەمەوێت بچمە ئەو باسەوە، کەوا بەهاری عەرەبی (٢٠١٢)، لە سەرەتاوە دروشمەکانیان: ژیان، ئازادی، دادگەریی کۆمەڵایەتی بوو بارودۆخەکە بە باشی دەڕۆیشت بەڕێوە، جێگەی دڵخۆشیی خەڵکی بوو ئامانجی باشی بەدەست هێنا، خەڵکیش هەموو ڕازیی بوون بە ئاوێتەکردنی دروشمە ئایینی و نیشتیمانییەکان و پێناسەی وڵات بە عەرەبی و ئیسلامی بێت و شەریعەتی ئیسلامییش مەرجەعی یەکەمی وڵات بێت. دیمەنەکە بە گشتی ئامادە بوو بۆ سازانی نیشتیمانی[1]، بەڵام زۆری پێ نەچوو دیمەنەکە گۆڕا، ڕاپەڕینی جەماوەری و بەهاری بەرەو ئاقارێك ڕۆیشتن کە خواستی خۆپیشاندەران نەبوون، کە لە خواستی جەماوەری و ڕزگاربوون لە دەستی دیکتاتۆر، هەندێ دروشم و ئایدیۆلۆژیای تایبەت بە لایەنێك باڵیان کێشا بەسەر خۆپیشاندانەکاندا، ئەمەش دوو مەترسیی گەورەی پەیدا کرد و بەهاری عەرەبی بە تایبەت لە میسر بەرەو ئاقارێکی خراپ برد:

## مەترسیی یەکەم:

[1] ازمة التنظيمات الاسلامية، الاخوان نموذجاً، د. جاسم سلطان، الطبعة الاولى ٢٠١٥، بيروت، ل: ٧٨.

دروشمـەکانی جێبـەجێکردنی شـەریعەت، یـان شـەریعەتی ئیـسلام تاکـە سەرچـاوەی یاسـا دانـان بێـت، یـان هەڕەشـەکردن لـە ئیـسرائیل، یـان داوای پێداچوونەوەی پەیوەندییە ئابووری و دیبلۆماتییەکان لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژئاوا و هەندێك لە وڵاتانی عەرەبی، بوون بە هۆکاری سەرەکی کە ئەو وڵاتانە بکەونە خۆیان و بکەونە ختووکـەدانی پـارت و تـەوژم و کەسـایەتییە عەلمانییـەکان، ئـەوانیش هەسـتیان کـرد پاڵپـشتیی دەرەکییـان هەیـە، دەسـتیان کـرد بـە خۆگورجکردنەوە، ئەوەبوو هەموو بـزاڤ و ڕەوتـە عەلمانییـەکان بـە تونـدڕەو و میانەڕەویانەوە، هەڵوێستی دژیان بەرانبەر بە تەوژم و لایەنە ئیـسلامییەکان وەرگرت و بە چاکی خۆیان ڕێکخستەوە و کەوتنە خۆئامادەکردن، کە دەکرێت بڵێین گۆڕینی دروشمـەکانی بـەهاری عـەرەبی لـە: ژیـان، ئـازادی، دادگـەریی کۆمەڵایەتی، کـە داواکـاریی گـەل بـوون، بـۆ هەنـدێك دروشمـی تایبـەت بـە تەوژمێك، هۆکار بوون بۆ ئەوەی بەهاری عـەرە بـی بـەرەو ئاقـارێکی خـراپ بڕوات.

## مەترسیی دووەم:

لـە مـاوەی زیـاتر لـە نیـو سـەدەی حـوکمڕانیی دەسـەڵاتە خۆسـەپێنە دیکتاتۆرەکـانی جیهـانی عـەرەبی، بـە پلـەی یەکـەم تـەوژم و بزاڤـە ئیسلامییەکان ئۆپۆزسیۆن بوون و ئەوان لە سەنگەری ڕووبەڕووبوونەوەی ستەم و زۆر و دەزگا داپڵۆسێنەرکاندا وەستا بوون، لایەنە چەپ و عەلمانییـەکان بـە گشتی ئەو قورساییەیان نەبوو پارتە دەسەڵاتدارەکان لێیـان بـسڵەمنەوە و لـە بەردەمیاندا هەڵوێستە بکـەن، بۆیـە ئـەبوو لایەنـە عەلمانییـەکان خۆیـان لـە

هەموو جوداخوازییەکی ئایدیۆلۆژی و ورووژاندنی هەستیاریی بەرانبەر تەوژمە ئیسلامییەکان بپاراستایە، کە ئەوان لە دروشمەکانیاندا دەڵێن: عەلمانیەت هەستیاریی ناهێڵێت و بە یەك چاو تەماشای هەموو ئایین و ئایینزاکان دەکات! وە ئەبوو هاوکار نەبوونایە بۆ لە باربردنی بەرهەمەکانی بەهاری عەرەبی و پاشماوەی ڕژێمەکانی پێشوویان پێ باشتر نەبوایە لە لایەنە ئیسلامییەکان. ئەوەی جێگەی تێڕامانە، ئەوان ئەو هەموو کاتە تەحەمولی ئەو دەسەڵاتانەیان کرد، بەڵام ئامادە نەبوون ئەگەر حکومەتیشیان لەگەڵ پێك نەهێنن، دوو ساڵ تەحەمولی لایەنە ئیسلامییەکان بکەن و دان بە خۆیاندا بگرن، تا لایەنە ئیسلامییەکانیش بەرچاوی خۆیان ببینن و بزانن چۆن مامەڵە لەگەڵ دەوروبەری خۆیاندا بکەن؟! نەدەبوو ئەوان ئەوەندە بە خێرایی هەڵویستی بەپەلە وەربگرن! هەرچەند تا ئێستا بە شێوەی گشتی ئاست و هوشیاریی گەلانی جیهانی عەرەبی، بە ئیسلامی و عەلمانییەوە، لە ئاستێکدایە بەرانبەرەکانیان پێ قبوڵ نییە و دەیانەوێت کاتێك دەسەڵاتیان کەوتە دەست، جگە لە خۆیان هەموو پێکهاتەکانی تر لە دەسەڵاتدا وەکو میوان بن و هەموو جومگە سەرەکییەکانی حوکمڕانی لە ژێر چنگی خۆیاندا کۆبکەنەوە، بۆیە ئێستا کاتی ئەوە هاتووە هەردوو تەوژم بە خۆیاندا بچنەوە و لەسەر خاڵە چارەنووسسازە هاوبەشەکان ڕێك بکەون و قەناعەتی شەخسی و ئایدیۆلۆژیای حیزبایەتی و هەستیاریی سەردەمی ڕژێمەکانی پێشوو لەبیر خۆیان ببەنەوە، پێکەوە پشتیوانیی لە پرۆژەیەکی نیشتیمانیی هاوبەش بکەن و پەند لە ڕووداوەکانی بەهاری عەرەبی وەربگرن.

# گوتاری بزاڤە ئیسلامییەکان لە ڕابوردوودا

## • گێڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامیی

دوای لاوازبوونی شارستانیەتی ئیسلامی و ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی، ئایدیۆلۆژیای سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی شارستانیەتی ئەورووپا جێگەی گرتەوە، لەم سەروبەندەدا جیهانی ئیسلامیی ڕووبەڕووی دوو مەترسیی گەورە بوویەوە، مەترسیی یەکەم: ڕووخانی مەرجیعیەتی ئیسلامیی کە خۆی لە خیلافەتی عوسمانییدا دەبینییەوە، کە لەو کاتەدا چەند شۆڕشێك بۆ گێڕانەوەی حوکمی خیلافەتی عوسمانی سەریان هەڵدا، وەکو: شۆڕشی عەبدولکەریم خەتابی لە ١٩٢١ـ ١٩٢٦ لە جەزائیر، شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران لە ١٩٢٥ لە کوردستانی باکوور. وەکو لە دادگاییکردنەکەیدا دەردەکەوێت، شێخ سەعید شۆڕشەکەی لە پێناوی گێڕانەوەی خیلافەتی عوسمانییدا بووە. ئەو ڕایەش هەیە کە دەڵێت شۆڕشەکەی نەتەوایەتی بووە[1].

مەترسیی دووەم: سەرهەڵدانی بیری چەپگەرایی و ناسیۆنالیستی بوو کە لەو کاتەدا بزاڤە ئیسلامییەکان لە لایەك خەریکی پێگەیاندنی تاکی مسوڵمان بوون لەسەر باوەڕی ڕاست و تێگەیشتنی ڕەوان و ئاکاری جوانی ئیسلامی و ڕەواندنەوەی ئەو گومانانەی لەسەر خودی ئیسلام دروست کرابوون. لە لایەکی تریش لە گوتار و لێدوانە ڕەسمییەکانیاندا، بانگەشەی

---

[1] دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة، د. عثمان علی، چاپی:٢٠٠٣، اربیل، ل: ٥١٣.

گێڕانەوەی پێگەی خیلافەتی ئیسلامی و دەرکردنی داگیرکارانی ڕۆژئاوا و گێڕانەوەی خاکی مسوڵمانان و کۆکردنەوەی مسوڵمانانیان لە ژێر یەك بەیداخدا دەکرد[1].

ئەوەی دەمانەوێت لێرەدا ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە:

یەکەم: لەو سەروبەندەدا سەرکردە و سیاسەتمەدارانی بزاڤە ئیسلامییەکان نەیانتوانیوە بەسەر ئەو واقیعەدا باز بدەن کە جیهانی ئیسلامیی تێیدا گوزەری کردووە، ئەو جۆرە گوتارانە چاوەڕوانکراو بوون بۆ ئەوکاتەی جیهانی ئیسلامیی، لەو کاتەدا پاساوی خۆی هەبووە، بەڵام دوای ئەوەی بە واقیعی دەرکەوت کە خیلافەت ناگەڕێتەوە و خاکی مسوڵمانانیش یەك ناخرێت و دەسەڵاتی ئیسلامییش ناگەڕێتەوە، ئەبوو لە لایەن بزاڤە ئیسلامییەکانەوە پێداچوونەوە بەو گوتارانەدا بکرابایەتەوە، چونکە بنەمای گوتاری سەرکەوتوو واقیعیبوونە، هەر گوتارێك چووە چوارچێوەی خەون و خەیاڵەوە، ناگونجێ بزاڤە واقیعییەکان بانگەشەی بۆ بکەن، هەڵوێستەنەکردنیش لە لایەن ئەوانەوە، ئەوەمان پێدەڵێت: بیرۆکەی بەخۆداچوونەوە ئەگەر لە نێو بزاڤە ئیسلامییەکاندا بوونی هەبێت، بوونێکی زۆر لاوازە، چونکە کێشە و گرفتەکانی جیهانی ئیسلامیی، لەو سەروبەندەدا بەردەوام لە گۆڕانکارییدا بوون، بۆیە ناگونجێت بۆ نموونە بزاڤێکی گەورەی وەکو ئیخوان موسلیمین، لە واقیعی خۆی جێ بمێنێت! هەموو پارتە چەپ و ناسیۆنالیستەکان ببن بە خولقێنەری ڕووداوەکان و لایەنە ئیسلامییەکانیش بە دوایاندا بڕۆن.

---

[1] رسالة المؤتمر الخامس، حسن البنا، ناونیشانی: الاخوان المسلمون والخلافة. ورسالة الى الشباب.

دووەم: دوای ڕووخانی خیلافەتی عوسمانی، ڕاستەوخۆ گەلانی ناوچەکە: بە تورك و عەرەب و کورد و نەتەوەکانی ترەوە، عەودالّی کێشە نەتەوایەتییەکانی خۆیان بوون و هەموو توانای سیاسی و سەربازی و دیبلۆماسی و پەیوەندییەکانی خۆیانیان لەو پێناوەدا وەگەڕ خستبوو هەر هێز و تەوژمێکیش ئەگەر هەڵگری ئەو دروشمانە نەبوایە، لای ئەو گەل و نەتەوانە، جێگەی بایەخ نەبوون، ئەو گەل و نەتەوانە ڕاستەوخۆ چوونەتە بەرەی دژە خیلافەتەوە، کوردیش وەکو نەتەوەیەك، لە ژێر سایەی دەسەڵاتی عوسمانییدا، هەندێك قۆناغی وەکو: سەردەمەکانی سوڵتان سەلیم لە ساڵی ١٥١٤ــ ١٨٢٦ زایینی، کە نزیکەی چوار سەدەی خایاندووە، باش بەڕێوەچووە[1]، هەروەها سەردەمی سوڵتان عەبدولحەمید، کە سەردەمێکی زێڕین بووە بۆ کورد، لە سنووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا کە زیاتر کوردی تێدا نیشتەجێیە، سوارەی حەمیدیی پێکهێناوە و پارێزگارییان لە خۆیان کردووە[2]. هەندێ کاتی تریش بووە کورد لە دەسەڵاتی عوسمانی ناڕازی بووە، هەروەکو لە کاتی ڕاپەڕین و شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریدا لە ساڵی ١٨٨٠، دژ بە دەسەڵاتی عوسمانی دەردەکەوێت[3]، کورد هەستی بە ستەمدیدەیی و مافخوراویی کردووە، لە کاتی شۆڕشی شێخ مەحموددا، بە حوکمی ئەو ململانێیەی لەسەر ویلایەتی موسڵ لە نێوان تورکیا و بەریتانییەکاندا

---

[1] ڕۆڵی عەلمانیەت لە دروست بونی مەینەتی کورد، مەسعود عەبدولخالق، چاپی: ٢٠١١، ل: ٤٦ و٤٧ و٥٨ و٩٦.

[2] دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة، د، عثمان علی، ل: ١٢٨.

[3] دراسات فی الحرکة الکوردیة المعاصرة، د. عوسمان علی، چاپی: ٢٠٠٣، ل: ٧٠.

هەبووە، دەسەڵاتی تورکی بۆ کەمکردنەوەی فشاری بەریتانیا لە سەریان، کە ئینگلیز داوایان لێدەکردن دەست لە موسڵ هەڵبگرن و بخرێتە سەر عێراق، هەڵوێستیان ناوبەناو بەرانبەر بە کورد نەرم بووە[1]، بەڵام لەبەر ئەوەی چارەسەری کێشەی کورد لای تورکەکان نەبووە، ئەو هەڵوێستە پۆزەتیڤانەش کە ناوبەناو لە لایەن تورکەکانەوە هەبوون، هیچ مافێکی دەستووریی لەخۆ نەگرتبوو بۆ کورد، بە شێوەیەك گۆڕانکارییە گەورە و ستراتیژییەکان هەڵنەوەشێننەوە، بەڵکو زیاتر لە ڕێکەوتنێکی سیاسی چووە و بۆ قۆناغێك بووە، بۆیە کورد ناچار بووە دوای ئەوەی هەموو گەلانی ناوچەکە بە دوای کێشەی خۆیانەوە بوون و بەشێکیشیان وەکو عەرەبەکان گرەنتیی چارەسەرکردنیان پێ درابوو کوردیش دوای ئەوەی گەیشتە قەناعەت گۆڕانکاریی لە دەسەڵاتی عوسمانییدا بەڕێوەیە، ناچار بوو بە دوای چارەسەری کێشە ڕەواکەی خۆی بکەوێت، بۆیە لەگەڵ ئینگلیز لە لایەك و لەگەڵ حکومەتی عێراقی لە لایەکی تر، ناچار بوو گفتوگۆ بکات و بە دوای چارەسەری کێشەکانیدا بگەڕێت[2]. بەڵام ئەم ڕووداوە یەك لەدوایەکانە وایان کرد ڕەوتە ئیسلامییەکانی بکەونە دواوە، چونکە پلان و بەرنامەیەکیان نەبوو کورد و هەموو هەڵگرانی بیری نەتەوایەتی وەکو نەتەوەیەکی مافخوراو خۆیانی تێدا ببیننەوە، بەڵکو بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ لەبەر ئەوەی لایەنە ئیسلامییەکان پشتیوانییان لە حوکمی خیلافەتی عوسمانی دەکرد، کەوتنە سەنگەری دژی ئینگلیز و هەموو بزاڤە ناسیۆنالیستی و ئەو گەلانەی داوای

[1] سەرچاوەی پێشو، ل: ٤١٠.

[2] سەرچاوەی پێشو، ل:٤٢٠.

مافی خۆیانیان دەکرد و وەکو نەتەوەیەك خاوەنی قەوارە و دەوڵەتی خۆیان بن. ئەمەش هۆکارێك بوو بۆ لاوازبوونی پێگەی بزاڤە ئیسلامییەکان و هەموو کات لە دوای ڕووداوەکانەوە بن و فریادڕەسی قەیرانە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و نەتەوەییەکان نەبن، ئەمەش وا دەکات هەر بزاڤ و ڕێکخراوێك لە ناو خەم و ناسۆرەکانی خەڵکیدا نەبێت، بە لای خەڵکەوە بوون و نەبوونی وەکو یەك وابێت، بۆیە ئەگەر بزاڤ و ڕەوتە ئیسلامییەکان لێکۆڵینەوەیەکی باش لە ڕابوردووی خۆیان بکەن، بە شێوەیەکی ئازایانە دەست بە بەخۆداچوونەوە بکەن، بتوانن خاڵە لاواز و نێگەتیڤەکان دیاری بکەن، بە دڵنیاییەوە تەکانێکی باش بە بزاڤی ئیسلامیی دەدەن و کارێك دەکەن جارێکی تر تەوژمی ئیسلامیی بە هێز و گوڕوتینێکی باشەوە بێتەوە مەیدان.

## • دەرکردنی داگیرکەر و یەکخستنی خاکی مسوڵمانان و دروستکردنی دەوڵەتی ئیسلامیی:

ئەم دروشمانەی لەو کاتەدا بەشێك لە لایەنە ئیسلامییەکان بەرزیان کردبوونەوە، لە لایەك ڕەنگدانەوەی ئومێد و ئاواتی کەمەنەتەوەکانیان تێدا نەبوو هاوکات لەگەڵ تەوژم و بزاڤە چەپ و ناسیۆنالیستەکانیشدا تێکگیرانیان دروست دەکرد، کە لایەنە نەتەوەیی و ناسیۆنالیستەکان هەڵگری دروشمی ڕزگاریخوازیی نەتەوە جیاجیاکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بوون، کە بە ڕاستەوخۆ ئەوان چووبوونە بەرەی گەلەوە، لایەنە ئیسلامییەکانیش لەبەرەی گەل دابڕابوون، ئەمەش پاساوێك بوو بۆ نەیارەکانیان کە خاوەنی دەسەڵاتی

سیاسی و حوکمڕانی وڵات بوون، چەندین سەرکردەی کاریزمایان تێدا هەڵکەوێت، لەو لاشەوە لایەنە ئیسلامییەکان بە دژی گەل و وڵات وێنا بکرێن، بە جۆرێك بە خەڵك و جەماوەریان دەناساندن، کە پارت و ڕەوتە ئیسلامییەکان لەگەڵ سەربەخۆیی گەلاندا نین و ژێردەستەیی و ستەمدیدەیی گەلەکانیان بە لاوە گرنگ نییە. ئەم پێناسەیە ڕەهەندێکی مەترسیدار و کاریگەری هەبوو لەسەر لایەنە ئیسلامییەکان و فاکتەرێکی بەهێزیش بوو بۆ گەورەنەبوون و گەشەنەکردنیان. پارتە چەپ و ناسیۆنالیستەکانیش بە حوکمی جیاوازیی بیر و ئایدیۆلۆژیایان لە لایەك، لە لایەکی تریش کە وەکو ئەلتەرناتیڤی خۆیان تەماشایان دەکردن، دەترسان لەوەی ئیسلامییەکان بە هۆی ئەوەی خاوەن ئەندامی زۆر و ڕێکخستنێکی توندوتۆڵ بوون، لە ڕێگەی هاتنەپێشەوەی هەلومەرجی جۆربەجۆر و کودەتاوە، دەست بۆ حوکم بەرن و دەسەڵات بگرنە دەست، بۆیە ئەمەیان کرد بە بیانوو بۆ تێوەگلانیان لە ململانێی حکومەت و پارتە چەپ و ناسیۆنالیستە دەسەڵاتدارەکان و وا بە خەڵکیان دەناساندن کە ئەمانە دژ بە دەسکەوتەکانی گەل و وڵاتن. لە لایەکی تریش خۆیان بە پارێزەری گەل و وڵات پیشان بدەن و بە زمانی حاڵ بە خەڵکیان دەوت ئەم لایەنە ئیسلامییانە دەیانەوێت بمان گێڕنەوە بۆ سەردەمی تاریکی و دواکەوتوویی واقیعی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی دەوڵەتی عوسمانی. هەرکاتێش باس لە دەوڵەتی عوسمانی بکرایە، خەڵکی هەندێك دیمەنی ناشیرینی وەکو ستەم و زۆر، بێکاریی و هەژاریی، ژاوەژاوی کۆمەڵایەتییان بیردەکەوتەوە، کە لایەنە ئیسلامییەکانیش بە گوتار و گوفتار و هەڵوێستەکانیان ببوون بە پارێزەری ئەو دەوڵەتە. لەبەر ئەوەشی بزاڤە

ئیسلامییەکان گوتارێکی ڕوونی دوور لە دەوڵەتی عوسمانییان نەبوو نەیان توانیبوو بە گەلانی جیهانی ئیسلامیی بسەلمێنن ئێمە جیاین لە دەوڵەتی عوسمانی و بانگەشە بۆ ئەو واقیعەی ڕابوردووی ئەوان ناکەین، ئەو ئیسلامەتییەی ئێمە بانگی خەڵکی بۆ دەکەین جیایە لەو ئیسلامەتییەی دەوڵەتی عوسمانی. بۆیە ئەوان لە لایەك لە لای خەڵکی ببوون بە پارێزەری ئەو واقیعە نەخوازراوە، لە لایەکی تریشەوە ڕووبەڕووی تەوژمێکی گەورەی نوێگەریی و بانگەشەکاری گۆڕانخوازیی ببوونەوە، کە ئەمانە هۆکاری شکست و پەراوێزخرانی لایەنە ئیسلامییەکان بوون. ئەو تەوژمانەش لەو کاتەدا لە جیهانی ئیسلامییدا لە گەشەکردندا بوون، بە هیچ شێوەیەك خۆشییان لەو دروشم و گوتارانە نەدەهات کە بزاڤە ئیسلامییەکان بەرزیان کردبوونەوە، دروشمەکان هەروەها جێگەی ئومێد و دڵخۆشیی گەلانی ناوچەکەش نەبوون. گەلانی ناوچەکە بە هۆی ئەوەی لە دەوڵەتی عوسمانیی زۆر بێزار بوون و هەڵوێست و دەربڕینی لایەنە ئیسلامییەکانیش هاوسۆزیی بوو بۆ ڕابوردوو بۆیە ئەو گوتارانە برینی گەلانی ناوچەکەیان تیمار نەدەکرد.

خاڵێکی تریش کە پێویستە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە: لەگەڵ ئەوەی بزاڤە ئیسلامییەکان خۆیان بە خاوەنی کێشە نەتەوایەتیەکانی گەلانی ناوچەکە نەدەزانی و بانگەشەیان بۆ ئیسلام و پەیامی ئیسلامیی دەکرد، لایەنە چەپ و ناسیۆنالیستەکان، بە مەبەست یان بێ مەبەست، وایان بۆ خەڵکی وێنا دەکرد کە ئیسلام کێشەی تەنها نێوان خودا و بەندەکانە، ئەی ئەوە نییە لایەنە ئیسلامییەکان خۆیان لە قەرەی باسی کێشەی نەتەوەکان و برسێتیی گەلان و چارەسەری دۆخی سیاسی و هتد نادەن؟!

- **شوێنەوارە نەرێنییەکانی بەخۆدانەچوونەوە:**

ئەگـەر لایەنــە ئیــسلامییەکان زووتــر فریــای حاڵەتــە ئیــسلامییەکە بکەوتنایــە، پێداچــوونەوەیەکی پێویــستیان لــە گوتارەکــانی ڕابــوردوو و ئێستایاندا بکردایە، هەروەها لاپەڕەیەکیان لە بواری پەیوەندی و تێڕوانینیـان بۆ خۆیان و دەوروبەریان هەڵبدایەتەوە، گوتار و گوفتارەکانیان لە سـنوورێکی بەرفراوانـدا بوایـە، بـە شـێوەیەك جێگـەی سـەرنجی هـەموو خـەڵکی بوایـە، هەروەها پەیوەندی و لێکتێگەیشتنیان لەگەڵ وڵاتانی ناوچەکە بە تایبـەتی و وڵاتانی ڕۆژئاوا بە گـشتی هەبوایـە، ئـەوا ئـەو بەخۆداچـوونەوەیە دەبـوو بـە دەروازەیەك بۆ ئەوەی بتوانن زیاتر لێـوەی بـچنە نـاو کایـە سیاسـییەکانەوە، هەروەها دەبووە ڕێگر لە بەردەم ئەو هەموو هەستیارییەی وڵاتانی ڕۆژئـاوا و ناوچەکە، کە بەرانبەر تەوژمی ئیسلامیی بۆیان دروست بـووە، ڕێگایـەکیش دەبــوو بــۆ دەربــازبوون لــەو حاڵەتــە چەقبەســتووەی، کــە ئێــستا بزاڤــە ئیسلامییەکانی پێدا گوزەر دەکەن. هاندەرێکی باشیش دەبوو بۆ پارتە چەپ و ناسیۆنالیــستەکان کــە ئــەوانیش شانبەشــانی لایەنــە ئیــسلامییەکان بەخۆداچوونەوە بکـەن، بـە دوای خـاڵی هاوبەشـدا بگـەڕێن و پێکـەوە کـاری هاوبەش لەسـەر پرسـە چارەنووسـسازەکان بکـەن. ئەوکاتـە پێکـەوە هاوخـەم دەبوون بۆ چارەسـەری کێـشە جۆراوجۆرەکـانی ناوچـەکە و تەواوکـەری یـەکتر دەبوون، کارئاسانییەکی باشیش بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەموو ئـەو کێـشە کەڵەکەبوانەی کە وڵات و گەلانی جیهانی ئیسلامیی بەدەستیانەوە دەناڵێنن، ئەوکاتە پارتە دەسەڵاتدارەکان لەباتی هەڵبەستنی دەیان تومەتی جۆراوجۆری

سیاسـی و ئـەمنی بـۆ لایـەن و کەسـایەتییە ئیـسلامییەکان و هەوڵـدان بـۆ پەراوێزخستنیان، هەروەها لەباتی تێکگیران و پیلاندانان و خۆماندووکردن بۆ سڕینەوەیان، هاوکاری و هەماهەنگیی یەکتریان دەکرد، بۆ بوژانـەوەی وڵات، ئەو لێکتێگەیشتنەی ئێستا هەندێك لـە بـزاڤ و کەسـایەتییە ئیـسلامییەکان هەنگاوی بۆ دەنـێن و لـە پـەیام و بەرنامـە و گوتارەکانیانـدا بانگەشـەی بـۆ دەکەن، زووتر بکرایە، ئێـستا پـڕۆژەی ئیـسلامیی لـە جیهانـدا پێـی نـابووە قۆناغێکی ترەوە و لەوانە بوو ڕێگریش بوایە لە بەردەم ڕوونەدانی ئەو هەموو نەهامەتی و چەرمەسەرییەی بەسـەر تەوژمـە ئیـسلامییەکان بـە تایبـەتی و جیهانی ئیـسلامیی بـە گـشتی هـاتوون، هۆکـارێکیش بوونایـە بـۆ گـۆڕینی سـەرجەم پەیوەندییـە سیاسـی و نێودەوڵەتییـەکان سیـستمی نـوێی جیهـان، لەوانەبوو بەرەو ئاقارێکی پۆزەتیڤتر لە ئێستا بەرانبەر بە جیهانی ئیسلامیی هـەنگاوی بنایـە، دوور نـەبوو ململانێـی زانـستی و هوشـیاری و ئـابووری و تـەکنۆلۆژیای زانـستی، بـە دیـوێکی پـۆزەتیڤ و بـۆ خزمـەتکردنی گـشت مرۆڤایەتی بهاتایەتە ئاراوە. دەبـێ ئـەوەش بـیری خۆمـان بهێنینـەوە، ئێمـە لێرەدا نابێ تەنها تەوژمی ئیسلامیی تۆمەتبار بکەین، خـۆ ئەگـەر تـەوژمی ئیسلامیی کەمئەزموون بووبێت، زۆرجار پلان و هەنگاوەکانیان پەرچـەکردار بـووبن، خـۆ تـەوژمی عـەلمانی زۆر بـە شـێوەیەکی دوژمنکارانـە و زۆر بێبەزەییانە مامەڵەیان لەگەڵ لایەنـە ئیـسلامییەکاندا کـردووە، بـە حـوکمی ئەوەی دەسەڵاتبەدەسـت بـوون، بـە هـەموو شـێوەیەك هـەوڵی پاکتـاوکردن و قەڵاچۆکردنی لایەنە ئیسلامییەکانیان داوە، بە هەموو شـێوەکانی ئەشـکەنجە و زیندان و لەسێدارەدان ڕەفتاریان لەگەڵ کردوون، خۆ ئەگـەر ئـەوانیش یـەك

تـۆز بـە ویژدانـەوە مامەڵـەیان لەگـەڵ تـەوژمی ئیـسلامی و نەیارەکانیانـدا بکردایە، گەل بەو شێوەیە لە بەهاری عەرەبییدا سزایان نەدەدان و چاکەیەکی لایەنە عەلمانییە دەسەڵاتدارەکانیان لەپێش چاو دەبوو. لێرەدا مەبەستم ئـەوە نییە ڕووداوەکانی مێژوو بگەڕێنـەوە بـۆ دواوە، ئـەم ڕەخنانـەی ئێمـە لێـرەدا دەیان گرین ئاسـانن، چـونکە هەنـدێکیان نزیکـەی پـەنجا سـاڵیان بـە سـەردا ڕۆیشتووە، بەڵام ئەمە وەبیرهێنانەوەیە بـۆ لایـەن و تەوژمـە ئیـسلامییەکان، کـەوا ڕیتمـی کارکردنیـان بگـۆڕن و چـیتر لەسـەر ئـەو حاڵەتـەی پێـشوو نەمێننـەوە، سـەرتاپای سیـستمی کـارکردن و چـۆنیەتیی بیرکردنـەوە و پێداچوونەوە بۆ تێڕوانینەکانیان بۆ دونیا و دەوروبەریان بگۆڕن، چونکە خوای بالادەست پەیمانی داوە کە: (**إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ**)[1]، خۆ ئەگەر هەر نەیانتوانی خۆیان بگۆڕن، ئەوە خـوای بالادەسـت پەکی لەسـەر سـەرکردایەتیی ئـەم بزاڤـە ئیـسلامییانە نەکـەوتووە، دووبـارە پەیمانێکی تری داوە کە: (**وَإِنْ تَتَوَلَّوْا يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوا أَمْثَالَكُمْ**)[2].

---

[1] الرعد: ١١.

[2] محمد: ٣٨.

## • هۆکاری مانەوەی بزاڤە ئیسلامییەکان لە چوارچێوەی ئەو گوتارانەدا

هۆکاری یەکەم: سەرهەڵدانی هەموو بزاڤە ئیسلامییەکان پەرچەکردار بووە و لە چڵەپۆپەی لاوازیی جیهانی ئیسلامیدا سەریان هەڵداوە. سروشتی شارستانیەتەکان وایە کە کەوتن بە ئاسانی ڕاست نابنەوە، هەرچەند سەرهەڵدانی تەوژم و بزاڤە ئیسلامییەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەیەمدا، گۆڕانکارییەکی گەورە بوو سەرەتایەکیش بوو بۆ متمانە بەخۆ کردنەوە و هۆشیارکردنەوەی جیهانی ئیسلامی، کە دوای ڕووخانی خیلافەی عوسمانی و[1] داگیر کران و دابەشکردنی جیهانی ئیسلامی و سەرهەڵدانی بیری چەپگەرایی و پەیدابوونی چەندین بزووتنەوەی ناسیۆنالیستی، چەند بزووتنەوەیەکی ئیسلامی لەسەر ئاستی جیهانی ئیسلامیدا سەریان هەڵدا، وەکو بزووتنەوەی نوور لە تورکیا: ١٩٠٨، بزووتنەوەی برایان لە میسر: ١٩٢٨، کۆمەڵەی ئیسلامی پاکستان: ١٩٤١، کە ئەمانە سەرەتای نوێکردنەوەی هزر و بیری ئیسلامی بوون. بۆ هەموو ئەوانەی چاویان بڕیبووە جیهانی ئیسلامی، بە تایبەت وڵاتانی ڕۆژئاوا کە وایان دەزانی دوای ڕووخانی خیلافەی عوسمانی، ئیتر جیهانی ئیسلامی خاوەنی نییە، دروستبوونی ئەم بزووتنەوانە پەیامێك بوو بۆیان، کە ئیسلام ڕۆحێکە بە نەخۆشی و لاوازی و بێئاگایی مسوڵمانان لەناو ناچێت، بەڵکوو وەکو ژیلەمۆیەك وایە ئەگەر لە هەندێك شوێن

---

[1] هۆکارەکانی ڕوخانی خیلافەی عوسمانی پێش ئەوەی دەرەکی بێت، هۆکارەکان خودی بون، ئەوەش وایکردبوله نێو ئەوروپیەکاندا، بە پیاوە نەخۆشەکەناو دەر بکات.

خۆڵەمێشی لەسەر بنیشێت، ئەوە لە شوێنێکی دیکە و بە شێوازێکی تر، بە فوویەك دەگەشێنرێتەوە و شوێنکەوتووانی گەرم دەکاتەوە و ڕووناکی بە مسوڵمانان دەبەخشێتەوە. دروستبوونی هەر یەك لەم بزاڤانە، پەرچەکرداری هەلومەرجی سیاسی و سەربازی و ئابووری و جوگرافیی جیهانی ئیسلامی بوو کە دوای جەنگی جیهانیی یەکەم (١٩١٤ ـ ١٩١٨) و کودەتاکەی ئیتیحادوتەرەقی بەسەر سوڵتان عەبدولحەمیدی دووەمدا و داگیرکردنی جیهانی ئیسلامی و پێکهێنانی دەوڵەتی ناسیۆنالیستی لە ناوچەکەدا و بە ڕەسمی هەڵوەشاندنەوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٤ و ڕێککەوتنی سیڤەر لە ١٩٢٠ و هێنانی بیری عەلمانی بوو[1] بەڵام بە پلەی یەك ئەو بزاڤانە وڵامدانەوەی ئەو ڕوداوانە بوون، کە لایەنە ئیسلامییەکان خۆیان دروستکەری ڕووداوەکان نەبوون، تاوەکو پلان و بەرنامەی گونجاویان بۆیان هەبێت، ئەمەش وای کرد ئەو بزاڤانە، هەندێکیان خۆیان لە ڕووداوە سیاسییەکاندا هەڵبوێرن، وەکو بزووتنەوەی نوور، یان لە سەرەتای سەر هەڵدانیاندا بەهۆی ئەو هۆکارە زاتی و بابەتییانەی پێشتر باسمان کرد[2]، کەوتنە ململانێ لەگەڵ پارتە چەپ و ناسیۆنالیستەکان، کە خۆیان بە شۆڕشگێر و خاوەنی شەرعیی کێشەی گەلانی ناوچەکە دەزانی، ئەمەش وای کرد بزاڤە ئیسلامییەکان لە پەراوێزی ڕووداوەکاندا بن، کە گرنگترین ڕووداوەکانی سەدەی ڕابوردو: دابەشبوونی وڵاتانی ئیسلامی و گەلانی مسوڵمان بوو بەتایبەت گەلی کورد، بەسەر گەلانی عەرەب و تورك و فارسدا

---

[1] حوارالاسلام والعلمانية، د. عثمان على، ل: ٣١٠.

[2] بڕوانە شوێنەوارە نەرێنیەکانی بە خۆدا نەچوونەوە.

دابــەش کــران، هــەروەها دروســتبوونی دەوڵــەتی نەتــەوەیی و ســەرهەڵدانی شۆڕشی نەتەوایەتی و سەرهەڵدانی بیری چەپگەرایی و دروستبوونی دەوڵـەتی ئیسرائیل و بەرپابوونی شۆڕشی ئیسلامیی ئێران لە ١٩٧٩ و ڕووخانی بلۆکی کۆمۆنیستیی ڕۆژهەڵات لە ١٩٩١، هەروەها دروستبوونی یەك جەمــسەری و ساغبوونەوەی بۆ ئەمریکا، لـەناو هـەموو ئـەم ڕووداوانـەدا، کـە جولێنـەری هەموویان وڵاتـانی ڕۆژئـاوا بـوون و ڕۆژئـاوایش لـەو کاتـەدا دوای ڕووخـانی دەوڵەتی عوسمانی، ئامادە نەبوو فاکتەرێك بێت بۆ زیندوکردنەوەی ئەو ڕێتمە لە گوتار و ئایدیۆلۆژیا و تێڕوانین، بۆیە لە جێگەی گوتاری پێشووی جیهـانی ئیسلامی کە خیلافەی عوسمانی لەو کاتەدا ڕابەرایەتیی دەکرد، ئـەو مۆدیلـە سیاسەتکردن و ئایدیۆلۆژیا و دونیابینییەی لە ئەوروپا سەری هەڵدا، کە دەیان ســەرکردە و کەســایەتیی ئیــسلامی پێــی سەرســام بــوون، کــە بــوون بــە بانگخوازانی نوێگەری و گۆڕانکـاری لـە جیهـانی ئیـسلامیدا. لـەباتی بـیری ئیسلامی، ئەوان هەڵگری بیری نوێگەری و ناسیۆنالیستی بوون، ئەمەش وای کرد بزاڤە ئیسلامییەکان، لە جیهانی ئیسلامیدا، لە پـەراوێزی ڕووداوەکانـدا بن، کە بەشێك لـەم دروشمانـە لەگـەڵ بـیری ئیـسلامیدا یـەکیان نەگرتـەوە و بەشێکیـشیان دژ بـەو واقیعـە بـوو کـە مـسوڵمانان بـە گـشتی خۆیـان تێـدا دەبینییەوە، لایەنە ئیسلامییەکانیش لەبەر ئەوەی وەکو ئێستا بەرچاو ڕۆشـن نەبوون، کە لە ڕووی هـەموو شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوادا نەوەسـتنەوە، بـەڵکوو پۆلێنی بکەن و سوود لە شـتە بەکەڵکـەکانیان وەربگـرن، ئەمــەش وای کـرد لایەنـە ئیـسلامییەکان لـە ڕووی هـەموو ئەوانـەدا بوەسـتنەوە کـە بـە نـاوی

شارستانیەتی ڕۆژئاواوە قسەیان دەکرد، بۆیە ئەوان دوور بوون لـە سەرچـاوەی ڕووداوەکان.

هۆکاری دووەم: دوای جەنگی جیهانیی یەکەم و ڕێککەوتنی سایکس بیکۆ و ڕووخانی خیلافەی عوسمانی، چەند بزووتنەوەیەکی ناسیۆنالیستی سەریان هەڵدا، لەوانە: کەمالییـەکان لـە تورکیـا (١٩١٨)، ناسـرییەکان لـە میـسر (١٩٥٢)، بەعـسییەکان لــە عێــراق و ســووریا (١٩٤٧)، زەینەلعابــدین لــە تــونس، هەواریبولمدین لە ١٩٦٥ لە جەزائیر کودەتای بەسەر ئەحمەد بـن بـیلا سـەرۆکی شەرعیدا کرد، کە بە بێ دەستوور تا ساڵی ١٩٧٦ حوکمڕانیی ئەو وڵاتەی کرد، موعەمەر قەزافی لە لیبیا، لە کیشوەری ئەفریقیاش لە ساڵی ١٩٦٣ ـ ١٩٧٨، ٣٠ کودەتای سەربازی سەرکەوتوو و ٣٦ کودەتای سەرنەکەوتووش ئەنجام دراوە، لـە عێـراقیش لـە ١٩٣٢ ـ ١٩٦٨، شـەش کودەتـای سـەربازی ئـەنجام دراوە[1]. ئەوانەی بەو کودەتایانە هەڵـساون، بـە پاسـاوی دەستپێـشخەری و شـەرعیەتی شۆڕشـگێڕیی دەسـتیان بەسـەر ئـەو وڵاتانـەدا گـرت و سیـستمی تاکڕەوانـە و هەیمەنـەی حیزبییـان پیـادە کـرد. هـەموو ڕایـەکی جیـاواز شـەرعیەتی لـێ وەرگیرایەوە و هیچ پارتێکی ئۆپۆزسیۆنیش قبووڵ نەبوو. هەر پارت یان گـەل و نەتەوەیەك لە ڕوویاندا بوەستابایە، ئەوە هاوشێوەی شۆڕشەکەی شێخ سـەعیدی پیران لە ١٩٢٥ و گرتن و دوورخستنەوەکانی سەعید نەوڕەسی و شۆڕشی گـەلی کورد لە باشوور و باکوور و ڕۆژهەڵاتی کوردستان، هەروەها شۆڕشی شیعەکانی عێراق و گـرتن و لەسێدارەدانی برایـانی مـسوڵمان لـە میـسر و سـووریا. ئـەو ڕژێمانە بە ئاگر و ئاسن وەڵامی نەیارانیان دەدایەوە، ئەم ڕێڕەو و بـەڕێوەبردن و

[1] پارتەسیاسیەکان وڕای گشتی، ڕێبوار کەریم مەحمود، سلێمانی چاپی: ٢٠٠٩، ل: ١٥٦.

سیاسەتکردنە، جگە لەوەی وڵاتـەکانیان وەکـو گرتوخانەیـەك لـێ کردبـوو، لـە هەمان کاتدا هاووڵاتییان بە هۆی سـتەم و زۆری ئـەو ڕژێمـە داپڵۆسـێنەرانەوە، هەسـتیان بـە مرۆڤبـوونی خۆیـان نـەدەکرد، بۆیـە هـەموو نـەیار و بەرهەڵستکارەکانیان سێ ڕێگایان لە بەردەمدا بوو:- یەکـەم: تەسـلیمبوون بـە ئەمری واقیع و خۆ بەدوور گرتن لە هەموو جموجوڵێکی سیاسی، هەندێك پارت بـۆ ئەسـتۆپاکیی خۆیـان هەڵوەشـاندنەوەی پارتـەکانیان ڕاگەیانـد، وەکـو: د. عەبدولکەریم زەیدان، بە ناونیشانی ئەمینداری گشتی لـە ١٩٧١، بـە ڕەسمـی هەموو جموجوڵێکی حیزبـی ئیـسلامیی عێراقـی لـەکار خست، کـە لـە نێـوان ململانێ و خەباتی سیاسیدا ئەو ڕێگایەیان هەڵبژارد. دووەم: مانەوە لـە کـار و خەباتی سیاسیدا و ململانێ کردن، لەو دۆخەشدا ئەوانەی دەسـتگیر دەکـران لـە سـێدارە دەدران و ماڵـەکانیان بەسـەریاندا دەڕووخێنـدرا، هەندێکیـشیان لـە گرتوخانەکان قایم دەکران، وەکـو ئـەوەی لـە میـسر و عێـراق کـە بەرانبـەر بـە نـەیارەکانیان لـە کـورد و شـیعە و کۆمەڵـەی برایـانی میـسر ئـەنجامیان دەدا. سێیەم: چوونە دەرەوە لە وڵات، هاوشێوەی ئەوانـەی هەنـدێکیان دەڕۆیـشتن بـۆ ئەفغانستان و چیچان و وڵاتانی ئەوروپا، کە بـە کـاری بانگخوازییـەوە خـەریك دەبوون. ئەوەی لێرەدا کـە دەبـێ هەڵوێستەیەکی لەسـەر بکـەین، ئەوەیـە کـە بەشێوەیەکی گشتی هەست بە لاوازییەك دەکرێـت لـە کـاری بەرهەڵـستکاری و ئۆپۆزسـیۆنبوونی بزاڤـە ئیـسلامییە سـونییەکاندا، کـە ئەوکاتـە لـەباتی ئـەو هەڵبژاردانەی کە جێگەی تێبینییە و ڕەخنەیەکیشە لە مێـژووی ئـەو بزاڤانـەدا تۆمار کراوە، دەبـوو یـەك ڕیـتم لـە کـار و خـەبات هەڵنەبـژێرن، هـەر وڵاتـە و بـەگوێرەی تایبەتمەنـدی خۆیـان سیاسـەتیان بکردایـە. ئەگـەر لـە ئێـستادا

هەڵسەنگاندنێك بۆ چۆنیەتی خەباتی سیاسیی ئەوکاتە بکەین، هەندێك کەموکورتی بەدی دەکەین، لەوانە:

أ- دەبوو پارتە سیاسییە ئیسلامییەکانی عێراق بۆ نموونە، پڕۆژەیەکی هاوبەشیان لەگەڵ کورد و شیعەدا کە دوو هێز و نەتەوەی نەیاری ڕژێمی بەعس بوون، هەبوایە و لە چواچێوەی ئەو پڕۆژەیەدا سیاسەت و ئۆپۆزسیۆنبوونیان بکردایە، لە نێوانیشیاندا پەیمانێکی هاوکاری لە کاتی مانەوەی ڕژێم لە دەسەڵاتدا و دوای نەمانی ڕژێمیش هەبوایە، ئەوکاتە وەکو هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی زەمینەیەکی لەباری بۆ دەسازا بۆ کار و چالاکی، پەنایەکیش هەبوو بۆ ئەو کەسانەی کە مەترسییان لەسەرە ڕووی تێ بکەن.[1] بەڵام ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق لە ١٩٨٧، وەکو هێزێکی ئۆپۆزسیۆنی چەکداری، جگە لەوەی خزمەتێکی بەرچاوی بە بەرەی ڕزگاریخوازی گەلی کورد کرد، لە هەمان کاتدا تەکانێکیشی بە پرۆژەی کاری ئیسلامیی کوردستانی باشوور بەخشی و مەعنەویەتێکی گەورە بوو بۆ پڕۆژەی ئیسلامی و بە کردەوە بە هێزە چەپ و ناسیۆنالیستەکانی وت: هەر ئێوە لە سەنگەری بەرگریکردن لە خەڵکی کوردستاندا نین، بەڵکو ئەوەتا هێزە ئیسلامییەکانیش شانبەشانی ئێوە، لە پێناوی گەلەکەیاندا خەبات دەکەن.

ب- دەبوو لەسەر ئاستی وڵاتانی ناوچەکە و وڵاتانی ڕۆژئاوا، پەیوەندییەکی توند و تۆڵیان هەبوایە و جۆرێك لە لێکتێگەیشتن و

[1] لێرەدا مەبەست ئەوە نییە هەڵسەنگاندن بۆ حیزبی ئیسلامی، یان برایان بکەین، چونکە ئەوە لێرە ناکرێت و ئەم نووسینە کەمە مافی خۆی پێ نادات.

هەماهــەنگییان دروســت بکردایــە، چــونکە پارتــە ئیــسلامییەکان لــە دوورگەیەکدا نەبوون کە پەیوەندییان بە کەسـەوە نـەبێت و نەبنـە سەرچـاوەی هەڕەشە و دڵەڕاوکێ و کـەس سـڵیان لـێ نـەکات. بـوونی ئـەو پەیوەندییانـە تەنانەت بۆ ئێستاش زۆر بۆیان بە کەڵك دەبوو. ئەوەی زیاتر لە چل ساڵ پێش ئێستا پارتە ئیسلامییەکان نەیان کردووە، ناچارن ئێستا دەبێ بیکەن.

هۆکـاری سـێیەم: تێـڕوانینی هەڵـە بـۆ دەوڵـەتی نەتـەوەیی و نەتـەوە جیاوازەکان. بیست ساڵ دوای ڕێککەوتنی سایکس بیکۆ لە ١٩١٦/٥/١٦ و دابەشکردنی جیهانی ئیسلامی و دروستبوونی دەوڵەتی نەتەوییی، هەروەها بە زۆرەملێ پاشکۆکردنی هەندێك نەتەوەی وەکو کورد بۆ ئەو گەل و نەتەوانـەی کە بەرژەوەندیی زلهێزەکان لـەلایان پـارێزراوە، بـەڵام هێـشتا گوتـاری بـزاڤ و کەســایەتییە ئیــسلامییەکان، لــەو چوارچــێوەیەدا بــووە کــە بانگەشــەی نەتەوایەتی و کارکردن بـۆ دەوڵـەتی نەتـەوەیی تاوانـە و دەبـێ خۆمـانی لـێ لابدەین. ئەم بۆچوونە لە خودی خۆیدا کاتێك بۆچوونێکی ڕاست و تەواوە، کە ئەو هێزانـەی بانگەشـەی بـۆ دەکـەن توانیبێتیـان دەوڵـەتێکی مرۆڤدۆسـتانە دروست بکەن، کە ئەوەی تێیدا نەخوێندرێتەوە نەتەوە و زمانی جیایە، بـەڵام لە کاتێکدا تەوژمێك هیچ هێز و دەسەڵاتێکی نییە تا پارێزگـاری لـە گـەل و نەتــەوە چەوســاوەکان بکــات، چ لۆژیکێکـە بانگەشــەی حــەرامیی دەوڵــەتی نەتەوییی بکـات و لـە دژی خـەباتی گـەلانی چەوسـاوە بوەسـتێتەوە؟! ڕاسـتە کاتێك مرۆڤایەتی گەیشتە ئاستی کەماڵ و چڵەپۆپەی مرۆڤبـوون، جیـاوازی لـەنێوان زمـان و نەتەوەکانـدا نـەکرا، نەتـەوە بـەهێزەکان بێدەسـەڵاتەکانیان ناچەوسـاندەوە، جێگــەی خۆیــەتی بانگەشــەی تــەحریمکردنی نەتــەوایەتی و

دەوڵەتی نەتەوەیی بکرێت. کاتێك کە خوای باڵا دەست دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَي وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ"**،[1] یان پێغەمبەر (صلی الله علیەوسلم) ئەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا النَّاسُ أَلَا إِنَّ رَبَّكُمْ وَاحِدٌ وَإِنَّ أَبَاكُمْ وَاحِدٌ أَلَا لَا فَضْلَ لِعَرَبِيٍّ عَلَي أَعْجَمِيٍّ وَلَا لِعَجَمِيٍّ عَلَي عَرَبِيٍّ وَلَا لآحْمَرَ عَلَي أَسْوَدَ وَلَا أَسْوَدَ عَلَي أَحْمَرَ إِلَّا بِالتَّقْوَي"**[2]، یان لەکاتێکدا دوو کەس شەڕیان بوو، هەرکەس بانگی لە هۆزەکەی خۆی کرد، پێغەمبەر (صلی اللہ علیە وسلم) فەرمووی ئەوە چییە؟ وتیان دوو کەس هەر یەکەیان لە هۆزێکە، بەشەڕهاتوون، فەرمووی: **"لَا بَأْسَ لِيَنْصُرْ الرَّجُلُ أَخَاهُ ظَالِمًا أَوْ مَظْلُومًا فَإِنْ كَانَ ظَالِمًا فَلْيَنْهَهُ فَإِنَّهُ لَهُ نُصْرَةٌ وَإِنْ كَانَ مَظْلُومًا فَلْيَنْصُرْهُ"**[3]. ئەمە کاتێك بووە لەسەر بنەمای مرۆڤبوون مامەڵە لەگەڵ خەڵکیدا کراوە، ئیسلام ئەم بنەما ئاکارییانەی لە جێگەی هۆز و نەتەوە و بنەماڵە داناوە، مرۆڤبوونی کردووە بە پێوەری پێکەوەبوون، بۆ بەدەستهێنانی مافەکان و چەسپاندنی دادگەرییش، دوو شتی داناوە: سەروەریی یاسا، کە هەرکەس بە یاسا مافی زەوتکراوی خۆی بسێنێت. ئەگەر یاساش جێبەجێ نەکرا، ئەوە بنەمای ئاکار و پارێزگاری لە ستەملێکراو و مافخوراوی داناوە، ئەم بنەمایەش کاتێك کاری پێ دەکرێت، کەوا زۆرینەی خەڵکی پێی قایل بن و پشتیوانی لە ستەملێکراو لە نێوانیاندا هەبێت، بەڵام کاتێك یاسایەك نەبوو ستەملێکراو و

---

[1] الحجرات: ١٣.

[2] موسنەدی ئەحمەد، ٤٧/ ٤٧٨/ ٢٢٣٩١.

[3] موسنەدی ئەحمەد، ٢٨/ ٤٩٢/ ١٣٩٤٣.

بەشخوراوێکی وەکو کورد، پەنای بۆ ببات، هەرچەند هاواریشی لە برا مسوڵمانە عەرەب و تورك و فارسەکانی کرد کە لە خۆیانیان جودا نەکەنەوە و وەکو یەکێك لە خۆیان تەماشایان بکەن، بەڵام هیچ کام لەو نەتەوانە گوێیان لێ نەگرتن و بەدەم داواکاریەکەیانەوە نەچوون، هەموو جۆرە ستەم و ماف پێشێلکردنێکیان پێ ڕەوا بینین، لەو کاتەدا ستەملێکراو نابێ پەنا بۆ نەتەوەکەی خۆی ببات و بڵێت: (واقوماه)!، تا ئێرە ئەوە واقیعی نێونەتەوەییە و بەدەست ئێمە نییە، تازە وا هاتووە، بەڵام ئەوەی جێگەی تێبینییە بۆ بزاڤ و بیرمەندە ئیسلامییەکان، خۆیان نەکرد بە خاوەن کێشەی نەتەوەکانیان؟ با ئەوان پیادەی دەوڵەتی نەتەوایەتییان بکردایە، نەك هەموو گەلانی مسوڵمان بە ئاقارێکدا و بزاڤ و ڕەوتە ئیسلامییەکانیش بە ئاقارێکی دیکەدا بڕۆن؟! ئێستاش برا عەرەب و تورك و فارسەکان، کە ئەو برایەتییەیان بە هەند وەرنەگرتووە ئایەتی: **"إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ"**،[1] ئاماژەی بۆ دەکات، واتە عەرەبێك تەنها مسوڵمانێکی عەرەبی بە برای خۆی زانیوە، هەروەها تورکێك و فارسێکیش بە هەمان شێوە. هەروەها دەبوو بزاڤە ئیسلامییەکان کاتێك بینییان تورك خاوەنی دەوڵەتی خۆیەتی و فارس خاوەنی دەوڵەتی خۆیەتی و عەرەبیش خاوەنی چەند دەوڵەتێکە، بۆ حەسانەوەی ویژدانیان، مافی نەتەوەکانی دیکەیان لە گوتار و ئەدەبیاتی خۆیاندا تۆمار بکردایە.

هۆکاری چوارەم: بزاڤە ئیسلامییەکان نەیانتوانی سوود لە پێگەی کەسایەتییە ئیسلامییە شۆڕشگێڕەکان ببینن. لە سەرەتای سەرهەڵدانی

---

[1] الحجرات: ١٠.

دەوڵەتی نەتەوەیی، زۆربەی ئەوانەی لە پێناوی نەتەوەکانیاندا سەرمەشقی شۆڕش بوون و هەوڵی ڕزگارکردنی نەتەوەکانی خۆیانیان لەژێر دەستی نەتەوەکانی دیکە داوە، کەسایەتی و زانایانی ئایینی بوون. بزاڤە ئیسلامییەکان لەباتی ئەوەی سوود لە هەڵوێستەکانیان ببینن، سەرقاڵی هەندێك دروشمی نامۆ بە خەڵك بوون و دروشمی خۆیانیان نەزانیوە، کە ئەوەش وای کرد ئەوان ڕووبەڕووی کۆمەڵێك لەمپەری گەورە ببنەوە، لەوانە:

ئیسلامییەکان زۆربەی کات لەناو چینی ڕۆشنبیر و ناوەندەکانی زانکۆ و خوێندنگە ئایینییەکاندا ڕۆڵیان هەبووە، بەڵام لەناو جەماوەرە مسوڵمانەکەدا ناسراو نەبوون و جێگەی سەرەنجیان نەبوون، بەڵکو ئەو جەماوەرە بە حوکمی ئەوەی کەسی یەکەمی شۆڕشەکان لە سەرەتاوە کەسانی ئایینی بوون، لەدوای نەمانی ئەوانیش بوون بە میراتی بۆ ئەو شۆڕشانە کە دوای نەمانی ئەوان چەپەکان و ناسیۆنالیستەکان ڕابەرایەتییان کردووە، وەکو باسمان کرد[1] ئەمە هۆکارێك بووە بۆ ئەوەی بزاڤە ئیسلامییەکانی زیاتر بزاڤێکی نوخبەوی بن. پارتە دەسەڵاتدارەکان جگە لەوەی ئایدیۆلۆژیایەکی دژ بە ئیسلامییان هەبوو، بە بەهانەش بوون لە دژایەتیکردنی تەوژمە ئیسلامییەکان، لە هەمان کاتیشدا شەرعییەتی شۆڕشگێڕییان هەبووە و خاوەنی جەماوەریش بوون، بەڵام لایەنە ئیسلامییەکان لە زۆربەی وڵاتان جگە لە ئەندامان و جەماوەرەکەی خۆیان، پشتیوانیی تریان نەبووە. لە لایەکی تریشەوە پارتە دەسەڵاتدارەکان، لەلایەن ئینگلیز و وڵاتانی تری ڕۆژئاواوە پشتیوانییان لێ

[1] بڕوانە بابەتی گێڕانەوەی خیلافە، وەدەر کردنی داگیر کەر.

دەکرا، چونکە ئەوان هاوکارێکی باش بوون لە جێبەجێ کردنی نەخشە و پلانەکانیاندا، کە ئەم واقیعە سیاسی و کۆمەڵایەتییە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا وای کردووە بەرە دروست ببێت: بەرەیەکی پارتە ئیسلامییەکان لەسەر بنەمای بیروباوەڕی دینداری و عەقیدەی ئیسلامی، بەرەیەکی تری پارتە چەپ و ناسیۆنالیستەکان لەسەر بنەمای خەبات و شۆڕشگێڕی و سەربەخۆیی گەلەکانیان، کە ئەم هۆکارانە ئەو پارتانەیان کردبوو بە پێشڕەوی نەتەوەیی و خاوەن پێگەی جەماوەری، هەلومەرجەکەش بۆ گەشەکردنی گوتار و پلان و بەرنامەی ئەو پارت و تەوژمانە زۆرگونجاو و لەبار بوو، چونکە لەو کاتەدا خەڵکی تامەزرۆی سەربەخۆیی و ڕزگاری بوون، دەیانویست لەژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانی دەرباز بن. لەگەڵ هەلومەرجە نەتەوایەتییە و بیری چەپگەراییەکەدا، چاوکردن لە هەڵوێستی ڕۆژئاوا بەرانبەر ئایین و جیاکردنەوەی لە دەوڵەت و سیاسەت، تیایاندا ئاوێتە بوو بوو، بۆیە هیچ نزیکی و پێکەوەبوون و بەشداریکردنێکی لایەنە ئیسلامییەکانیان لە دەسەڵاتدا لا قبوولّ نەبوو، بە چاوێکی ناحەزانە و وەکو دوژمنێکی سەرسەختی خۆیان تەماشایان دەکردن، نەك بەدوای خاڵەهاوبەشەکان لەگەڵ لایەنە ئیسلامییەکاندا نەدەگەڕان، بەڵکو هەموو کات وەکو ئەڵتەرناتیڤێك تەماشایان دەکردن. لە ساڵی ١٩٤٨، بۆ هاوهەڵوێستیی گەلانی عەرەب و وەکو ئەرکێکی ئایینی دژ بە ئیسرائیل، حەسەن بەننا بە ڕەحمەت بێت، ڕاهێنانی بە لاوانی ئیخوان دەکرد و بۆ فەڵەستینی دەناردن، تا شانبەشانی لەشکری عەرەب دژ بە داگیرکارییەکانی ئیسرائیل بجەنگن، بەڵام تا لە فەڵەستین گەڕانەوە، لە میسر دەستیان بەسەر بنکە و بارەگاکانی ئیخواندا

گـرت و هـەموو كـار و چـالاكییەكیان لـێ قەدەغـە كـردن. ئـەم ڕێگـری و قەدەغەكردنی چالاكییانەی برایان جارێك و دوو جار نـەبوو، بـەڵكو ناوبـەناو دووبـارە دەبـووەوە. بـە هـەمان شـێوە لـە سـاڵی ١٩٥٤ جـارێكی دیكـە دەسەڵاتدارانی میسر كار و چالاكیی ئیخوانیان قەدەغە كرد. دوور نییە جگە لـە خۆشـی لـێ نـەهاتنی خۆیـان و ڕقبوونیـان لـە كـار و چـالاكیی ئیخـوان، هەندێك جار دەستی دەرەكیش هاندەر بووبێت، هەر وەكـو لـە دوای شۆڕشـی ٢٥ی كانوونی دووەمـی ٢٠١١، سعودیە و هەنـدێك لـە وڵاتـانی عـەرەبیی دیكە لە ١٤/ ٨/ ٢٠١٤، بزووتنـەوەی (ئیخوانولموسـلیمین)یـان لـە نـاوەوە و دەرەوە وەكو بزووتنەوەیەكی تیرۆریست ناساند و مامەڵەیان لەگەڵ كرد.[1] ئەو تێبینییەی لێرەدا ئاماژەی پێ بكەین، ئەوەیە كۆمەڵی ئیسلامیی میسر كـە چـەندین پـەرتووكیان لەسـەر بەخۆداچـوونەوەكانیان دەركـرد[2]، بزووتنـەوەی نەهزەی تـونس لـە بەخۆداچـوونەوەكانیاندا هـەنگاوی زۆر باشـیان بڕیـوە كـە شوێنەوارەكانیشی لە واقیعی سیاسیی تونسدا دەركەوتووە، بە هـەمان شـێوە بزووتنـەوەكانی دیكـەیش دەبـوو هاوشـێوەی ئـەوان خۆیـان دەسـتیان بـە بەخۆداچـوونەوە بكردایـە. دەبـوو بزاڤـە ئیـسلامییەكان پـێش ئـەوەی قەڵەمبەدەستەكانی دەرەوەی پارتەكانیان تێبـینی و ڕەخنـەكانیان بخەنـە نـاو كتێبـەوە، خۆیـان پێداچـوونەوەیان بـە گوتـار و دونیـابینی و پەیوەندییـە نێودەوڵەتییەكانیان و خویندنەوەیان بۆ پارت و ڕێكخراوە ئیسلامی و عەلمانی و چەپ و پارتە ناسیۆنالیستەكان بكردایـە. پـێش ئـەوەی قەڵەمبەدەسـتانی

[1] جةزيرة نت، وة مركز الشرق العربی، للدراسات الحضارية والاستراتجية، لندن.
[2] سايتی: مكتبة الامن الفكری.

دەرەوەی پارتە ئیسلامییەکان بێنە دەنگ و لێرە و لەوێ بابەت و پەرتووك و نووسراوی جۆراوجۆری لەسەر بڵاو بکەنەوە، دەبوو خۆیان بە ڕەسمی ئەو دەستپێشخەرییەیان بکردایە. مەرج نییە هەموو بەخۆداچوونەوەیەك هەمووی وەکو یەك وابێت، بەڵام ئەگەر گوێ لە نەیارەکانی بزاڤە ئیسلامییەکان بگریت، ئەوانیش تێبینی و سەرەنجیان لەسەر سیاسەتکردن و ئەزمونی سیاسی و دونیابینی و مامەڵەکردنیان لەگەڵ پارت و لایەنەکانی غەیری خۆیان بە ئیسلامی و عەلمانییەوە هەیە، بەخۆداچوونەوە بۆ هەر پارت و ڕێکخراوێك کە تەماحی دەسەڵات و سیاسەتکردن و ڕازیکردنی جەماوەر و بە هەڵە تێنەگەیشتنی ناوخۆ و دەوروبەری هەبێت، پێویستییەکی حاشاهەڵنەگرە. بەخۆدانەچوونەوە واتای خراپی هەیە، یان ئەوەیە وا دەزانێ هەڵە و کەموکورتیی نییە، کە ئەوەش نابێت، چونکە هەموو مرۆڤێك هەڵەی هەیە، پارت و ڕێکخراوەکانیش بەرهەم و جێدەستی مرۆڤەکانن، کە وابێ ئەوانیش بێ هەڵە نین، چونکە ئەو کەسەی قەناعەتی وابێت هەڵەی نییە، خۆ قەناعەتی وایە کە خەڵك هەڵەی هەیە! دەگێڕنەوە پرسیاریان لە عیسا (درودی خوای لەسەر بێت) کرد: کێ ئامۆژگاریی کردوویت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: کەس ئامۆژگاریی نەکردووم، بەڵام هەڵەی خەڵکم بینی خۆمم لێ لادا.[1] یان ئەوەیە: قەناعەتی وایە هەڵەی هەیە و لەوانەیە خۆیشی دەرکی پێ بکات، بەڵام توانای چارەسەری نییە، دیسانەوە ئەمەشیان خراپەکەی لەوی تر کەمتر نییە.

---

[1] احیاءعلوم الدین، الامام الغزالی، ٤/٩٢.

## ٢. پێداچوونەوەی هەندێك لە چەمكە فیكرییەكان

### أ- هەڵە تێگەیشتن لە چەمكی دۆستایەتی و تەبەڕا كردن (الولاء والبراء)

دۆستایەتی و تەبەڕابوون (الولاء والبراء) لە ئیسلامدا بە مانای پشتیوانی لە مسوڵمانان و وەستان لە دژی بێباوەڕان دێت، كە بنەمایەكی ئیمان و بنچینەیەكی بەرجەستەی عەقیدەیە. لە هەمان كاتدا چەمكی خۆشەویستی و ڕق لێ بوون، لە چەند حاڵەتێكی وەكو: بوونی هاوپەیمانی لەگەڵ لایەنی بەشەڕهاتوو لەگەڵ مسوڵماناندا، یان هاووڵاتی بوون، یان هەردوو لای بەشەڕهاتوو مسوڵمان بن، یان هاووڵاتی بن، یان هاوپەیمان بن، یان دووربێت لە دەسەڵاتی مسوڵمانان، هەڵاواردنی تێدا هەیە و بە شێوەیەكی ڕەها نییە، كە نابێ تێكەڵ بە مامەڵەی ڕۆژانە بكرێت، كە بە كورتی ئاماژەیان پێ دەكەین:

- ئەگەر دوو لایەنی مسوڵمان بەشەڕ هاتن، ئەوە لەو حاڵەتەدا بنچینەی (الولاء والبراء) كاری پێ ناكرێت، بەڵكو تەماشای ڕەوایی داواكەیان دەكرێت، هەر لایەنێكیان ماف و شەرعیەتی لە لا بێت، ئەوە هەموو لایەك دژ بە لایەنی یاخیبوو دەجەنگن و پشتیوانی لەو لایەنەیان دەكەن كە دەستدرێژیی دەكرێتە سەر. وەكو خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێت: "وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَي الأُخْرَي فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّي تَفِيءَ إِلَي أَمْرِ اللَّهِ".

- هەر لایەنێکی غەیرە مسوڵمان ئەگەر لەگەڵ لایەنێك لە مسوڵمانان بەشەڕ هات، ئەگەر لایەنێکی تری مسوڵمان لەبەر بەرژەوەندیی گشتیی مسوڵمانان، یان لەبەر بەرژەوەندیی وڵاتەکەی هاوپەیمانێتیی کردبوو لەگەڵ ئەو هێزەی کە لەگەڵ مسوڵمانان بەشەڕ هاتووە، ئەوە ئەرکی سەرشانی نییە پشتیوانی لەو لایەنەی تر بکات، با مسوڵمانیش بن، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: "وَإِنِ اسْتَنْصَرُوكُمْ فِي الدِّينِ فَعَلَيْكُمُ النَّصْرُ إِلا عَلَي قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ مِيثَاقٌ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ". هەر وەکو کاتێك ئەبو جەندەلی کوڕی سوهەیل لەدەست قورەیش ڕای کرد و پەیوەندیی بە مسوڵمانانەوە کرد، لە حودەیبیە کاتێك باوکی بردیەوە بۆ لای قورەیشییەکان، پێغەمبەر (صلي الله عليه وسلم) ڕێزی ڕێکەوتنەکەی گرت و ڕێگریی نەکرد لە گێڕانەوەی ئەبو جەندەل بۆ لای قورەیش.
- یەکێکی تر لەو هۆکارانەی چوارچێوەی دۆستایەتی وبەرائەت نایگرێتەوە و تێکی دەدات، هاووڵاتیبوونە، واتە ئەو کۆمەڵە خەڵکانەی لە مسوڵمان و غەیری مسوڵمان پێکەوە لە وڵاتێکدا نیشتەجێن، مافی هاوکاری و پشتیوانیکردنی یەکدییان بەسەریەکەوە هەیە، هەر وەکو بڕوانامە (دەستووری مەدینە) ئاماژەی پێ دەکات، کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) سەرپەرشتیی نووسینەوەی کرد، لەنێوان لایەنەکاندا کە دەڵێت مسوڵمان و غەیرە مسوڵمان پشتیوانیی یەکدی بەرانبەر هەر کەسێك دەکەن دژایەتیی لایەنەکانی ئەم بڕوانامەیە بکات، لە نێوان خۆیاندا دڵسۆزی بەرانبەر بە یەکدی دەنوێنن، ئەو لایەنە جولەکانەی لەم هاوپەیمانیەتییە لەگەڵمانن، پشتیوانییان لێ دەکرێت و ستەمیان لێ ناکرێت و پشتیوانی لە

هیچ کەسێکیش لە دژیان ناکرێت، کە ئەمە پەیماننامەی هاووڵاتیبوونە، دەبێ بە چاوی تەبایی وەکو دوو هاووڵاتی تەماشای یەکتر بکەن و مافی هاووڵاتیبوونیان بەسەر یەکتریەوە هەیە.

- یەکێکی تر لەو هۆکارانەی کە مسوڵمان ناتوانێت دیفاع لە مسوڵمانێکی دیکە بکات: ئەو مسوڵمانانەیە کە لە وڵاتێك دادەنیشن دەسەڵاتی مسوڵمانانی بەسەردا نییە، لەم کاتەدا نابێ داوای کۆمەکی و پشتیوانی لە دەسەڵاتی ئیسلامی بکرێت، هەر وەکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێت: "أنا بريء من كل مسلم يقيم بين أظهر المشركين". واتە: من بەپرسیارێتیی هیچ مسوڵمانێك هەڵناگرم لە وڵاتی موشرکین دابنیشێت. مەبەست ئەوە نییە ئەو کەسە مسوڵمان نییە، مەبەستی ئەم فەرموودەیە ئەوەیە: ئێمە توانای پارێزگاریکردنمان لێی نییە.

**ب- مەسەلەی بە کافر دانان:**

هەندێك وشە و زاراوە هەیە، لەلایەن لایەنە ئیسلامی و غەیرە ئیسلامییەکانی وەکو وتاربێژەکان و بانگخوازەکانەوە، بەبێ ئەوەی پێناسەیەکی وردی بۆ بکرێت، زۆر بەکار دەهێنرێن، ئەمەش وای کردووە هەموو ئەو تەوژم و باڵ و هێزە جۆراوجۆرە ناسیۆنالیستی و نەتەوەییانەی هەیە، کە خۆیان بە هەڵگری باوەڕی مسوڵمانان دەزانن، لە خۆیان دەکەونە گومانەوە، کە ئێمە قەناعەت و باوەڕمان هەر وەکو هەمان قەناعەت و باوەڕی خەڵکی نوێژخوێنی مزگەوتە، بەڵام وەکو کوردێك باوەڕم بە بیری نەتەوایەتی هەیە و پشتیوانی لە هەموو کێشە ڕەواکانی گەلەکەم دەکەم، بەڵام بە حوکمی مێژوو و دەسپێشخەریی شۆڕشگێڕی، چارەنووسم کەوتووەتە

نێو فلان لایەن، ئێستاش وەکو کوردایەتی و وەکو پیشە، ژیان و بژێوی و خەباتم لەوێیە. بۆ ئەوەی نەکەوینە هەڵەی عەقیدەییەوە، دەبێ پێداچوونەوە بە هەندێك چەمك و دەستەواژەدا بکرێت، بەبێ ئەوەی کەسانێك بە خۆیان بزانن، ئایین و بیروباوەڕیان دەخرێتە مەترسییەوە، دەبێت سنوورێك بۆ بە ڕەهایی تەکفیرکردن و دانانی نیشانەی پرسیار لەسەر دینداریی خەڵکی گشتی دابنرێت، وەکو ئیسلام چۆن تەکفیرکردنی بەر تەسك کردووەتەوە، ئێمەش لەو سنوورە تەسکەدا بەکاری بهێنین و بازنەکەی فروان نەکەین، وەکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **"مَنْ صَلَّي صَلاَتَنَا، وَاسْتَقْبَلَ قِبْلَتَنَا، وَأَكَلَ ذَبِيحَتَنَا، فَذَلِكَ الْمُسْلِمُ الَّذِي لَهُ ذِمَّةُ اللَّهِ وَذِمَّةُ رَسُولِهِ، فَلاَ تُخْفِرُوا اللَّهَ فِي ذِمَّتِهِ"**.[1] واتە: ئەگەر کەسێك وەکو ئێمە نوێژی کرد و ڕووی کردە ڕووگەمان و گۆشتی سەربڕاوی ئێمەی خوارد، ئەوە ئیماندارە و لە ئەستۆی خودا و پێغەمبەری خودادایە. واتە مسوڵمانەکان بە گشتی چ مافێکیان هەیە، ئەوانیش هەمان مافیان هەیە. لە بیروباوەڕی ئەهلی سوننەدا هاتووە: هەر کەسێك دان بە پەیامی پێغەمبەردا بنێت و پشتڕاستی بکاتەوە، ئێمە بە مسوڵمان و ئیمانداری دەزانین.[2] بۆیە دەبێ گوتارە ئایینییەکان وردەکاریی زیاتری تێدا بکرێت، بە ناوی هاندانی خەڵکەوە بۆ خواپەرستی و دوورکەوتنەوە لە پشتیوانی کردن لەستەم و زۆر و تاوان و گەندەڵی، ئیمان و باوەڕی خەڵکی نەخەینە مەترسییەوە. هەوڵ بدرێت گوتارەکان نەخرێنە چوارچێوەی سیاسەتەوە و وەکو چەکێك بەرانبەر بە لایەنەکان بەکار بهێنرێت.

---

[1] بوخاری، ١/١٨١/ ٣٩١.

[2] شرح العقيدة الطحاوية، صالح بن عبدالعزيز، بن محمد آل الشيخ، چاپی:٢٠١٤، ١/٥٣٤.

ئەگەر پارتێك، یان كەسێك، خۆی بانگەشەی دژە ئایینی كرد، یـان هەنـدێك دروشمی بەرز كردەوە، بەبێ پێچ و پەنا دژ بە بنەما نەگۆڕەكانی ئیسلام بـوو، یان بانگەشەی بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەندێك چەمكی خێزان و كۆمەڵگا دەكرد و سنووری بۆ حەرامەكان نەهێشتەوە، ئەوە مافی ئیماندارانە لـە چوارچـێوەی بنـەماكانی بانگـەوازدا،[1] ئـەو بـیر و ڕێـڕەوە لار و چـەوتانە بـۆ خـەڵك ڕوون بكەنەوە.

### ت- چەمكی ئوممەت:

دەبێ ئێمە جارێكی تر پێداچوونەوە بە زاراوەی ئوممەتدا بكەین. لـە ڕووی زمانەوانییەوە ئوممەت، بە مانـای ئـایین و ڕێبـاز دێـت.[2] بـە هـەر كۆمـەڵ و دەستەیەكیش دەوترێت كەوا یـەك مەبەسـتیان هـەبێت.[3] بـە هـەر كەسـێكی تریش دەوترێت ئایینێكی ڕەوای هەبێت و لە ئایینەكانی تر نەچێت.[4] كەواتە مانای ئومەت لە ڕووی زمانەوانییەوە بەو گەلانە دەوترێت: یەك ئـایین، یـەك مەبەست، یەك ئامانجی دیاریكراویان هەیە و لەسەری دەڕۆن. ئەگەر ئوممـەت بەو نەتەوانە بوترێـت كـە: هـەڵگری یـەك بیروبـاوەڕ بـن، وەكـو: یـەك خـودا بپەرستن و شـوێن یـەك پێغەمبـەر (صـلی اللـه علیـه وسـلم) بكـەون و یـەك ڕووگـەیان هـەبێت و پـەیڕەوی یـەك كتێـب بكـەن و لـە بنـەما نـەگۆڕەكانی

---

[1] لە بابەتی بانگەوازو گەیاندنی پەیامی ئیسلامی باسكراوە.

[2] الصحاح فی اللغة، الجوهری، ١/ ٢٣.

[3] لسان العرب، ابن المنظور، ١٢/ ٢٢.

[4] مقاییس اللغة، ابن فارس، باب امَ، ١/ ٢٧.

ئیسلامدا یەك بن، ئەوە جێگەی مشتومڕ و هەڵوێستە لەسەرکردن نییە. لە هەمان کاتدا، لە مەسەلە سیاسی و نەتەوایەتییەکاندا، بە دەق کەس پابەند نەکرێت پارێزگاری لە بەرژەوەندیی نەتەوەیەکی تر بکات، ئەوکاتە هەر گەل و نەتەوەیەك بە جیا لەگەڵ نەتەوەکانی تر، چۆنی پێ باش بوو بۆ گەل و وڵاتی خۆی ئەنجامی دەدات، بەبێ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیی گەل و نەتەوەکانی تر. بەوشێوەیە هەمووگەلان، لە بابەتی حوکمڕانی و بەڕێوەبردن، لەگەڵ هەموو گەلانی دونیا، لە چوارچێوەی مافەکانی مرۆڤ و یاسا نێودەوڵەتییەکاندا، بە هاوبەشی لەگەڵ کۆمەڵگەی نێودەوڵەتیدا، هەرکەس خۆی بۆخۆی چارەنووسی خۆی دیاری دەکات، تا هیچ گەل و نەتەوەیەك بە حوکمی ئایین، مێژوو، هێز، یان زۆرینە، دەست وەرنەدرێتە دیارکردنی چارەنووس و بەرژەوەندییەکانی. لە هەمان کاتدا هەموو گەلانی مسوڵمان، ئامانجی دوورمەودایان بۆ دروستکردنی مەنزومەیەکی جیهانی هەبێت، کە کار بۆ دەستەبەرکردنی بەرژەوەندیی گەلانی مسوڵمان لە هەر شوێنێك هەن، بکات، گرنگ نییە هەر ناوێکی وەکو: سیستمی خیلافە، یەکێتیی گەلانی مسوڵمان، یان سیستمی جیهانی ئیسلامیی هەبێت، گرنگ ئەوەیە گەلانی مسوڵمان بەبێ ئەوەی هەڕەشە بن بۆ سەر بەرژەوەندیی گەلانی تر، پێکەوە دوای ڕێکەوتن لەسەر کۆمەڵێك بنەما، لەو ڕێکخراوەدا خۆیان ببیننەوە. ئێستا بیرمەند و نووسەرە ئیسلامییەکان، پێناسەیەکی واقیعیتریان بۆ مانای ئوممەت داناوە، ئەویش بریتییە لە یەکدەنگیی گەلی مسوڵمان بەرانبەر بەدەسەڵات. بە جۆرێك، هەرکات دەسەڵات بوو بە خۆسەپێن و لە بەرژەوەندیی باڵای گەل لای دا، ئەوە هێزی گەل لای دەدات، ئەوکاتە گەل سەرچاوەی شەرعییەتی دەسەڵاتە.

ئەو بیرمەندانە ئایەتەکانی "وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا لِتَكُونُوا شُــهَدَاءَ عَلَي النَّاسِ وَيَكُونَ الرَّسُولُ عَلَيْكُمْ شَهِيدًا"[1] و "كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّة أُخْرِجَــتْ لِلنَّاسِ"[2] وا لێك دەدەنەوە کەوا گەل و نەتەوەی مسوڵمان چاودێرە بەسەر دەسەڵاتەوە و ناهێڵن لە ڕێگەی ڕاست لابدات و بەرەو ستەم و زۆرداری بڕوات.[3] ئەم مانایەش هیچ گرفتێك بۆ نەتەوەکانی تری غەیری عەرەب دروست ناکات و هیچ هەستیارییەکیان بەرانبەری نییە. بەڵام ئەوەی جێگەی نیگەرانیی نەتەوەکانی تری مسوڵمانی غەیری عەرەبە، تێکەڵکردنی بەرژەوەندیی ئوممەی عەرەبی بە چەمکە ئیسلامییەکانی وەکو بەرژەوەندیی ئوممەتی ئیسلامی، کە هەر کاتێك نەتەوەکانی تر داوای مافی خۆیان کرد، پێیان ڕەوا نەبینرێت، بەڵام لە فەرهەنگی ئەواندا ئەگەر گەلانی عەرەب ٢١ دەوڵەتیان هەبێت، یەکڕیزیی ئوممەت تێك نادات، بەڵام گەلانی تر وەکو کورد و هاوشێوەکانی، ئەگەر داوای بوون بە دەوڵەت بکەن، ئەوە زیانی بۆ یەکڕیزیی ئوممەت هەیە! لە کاتێکدا ئوممەتی ئیسلامی، وەکو مەنزومەیەکی خاوەن هێز و پێگەی سیاسی و ئابووری و تەکنۆلۆژیای مەدنی و سەربازی نەماوە. بۆیە ئەو دەستەواژەیە، بەو ڕاڤەکردنە، دوو جار نەتەوەکانی غەیری عەرەب تووڕە دەکات، جارێك ئوممەت دیار نییە، تا نەتەوەکانی تر پەنای بۆ ببەن و کێشەکانیان چارەسەر بکات، وەکو نەتەوەکانی هاوتای خۆیان،

---

[1] البقرة: ١٤٣.

[2] العمران: ١١٠.

[3] الامة هی الاصل، د. احمد الریسیونی، چاپی دوەم، ٢٠١٣، ل:١٠، وسیادة الامة قبل تطبیق الشریعة، عبداللة المالکی، چاپی دوەم، ٢٠١٣، ل: ١٠.

ئەوانیش ببن بە خاوەنی قەوارە و بوونی خۆیان، جارێکی تریش تووڕەیان دەکات، چونکە ئەو دەستەواژەیە نەتەوە بەهێزەکانی تری وەکو: عەرەب و فارس و تورك، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان و بۆ چەوساندنەوە و ژێردەستەکردنی گەلانی تری وەکو: کورد و ئەمازیغ و هاوشێوەکانیان، بەکاریان دەهێنن، هەر کاتێك لە هەر مەحفەل و شوێنێکدا باس لە مافی ئەو نەتەوانە بکرێت، ئەوە برا عەرەبەکان، ئایەتەکانی وەکو: "**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ**"[1] و "**وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ**"[2] لە سەرەتادا دەخوێننەوە، ئەو گەل و نەتەوانەی داوای مافی خۆیان دەکەن و دەیانەوێت لە ژێردەستەیی نەتەوە بەهێزەکان بێنە دەرەوە و خاوەنی چارەنووسی خۆیان بن، بەوە تۆمەتبار دەکرێن کەوا خاك و وڵاتی مسوڵمانان لەت و پەت دەکەن و دەستی دوژمنانیان لەپشتە.

## پ- چەمکی لەکارخستن (النسخ) لە قورئاندا:

شارەزایانی زانستی قورئان و ڕاڤەکارانی قورئان، لە زمانەوانیدا بەم شێوەیە پێناسەی نەسخیان کردووە: بە مانای سڕینەوە و لەکارخستن و گواستنەوەی واتای ئایەتەکە بۆ شوێنێکی تر دێت.[3] لە زاراوەشدا دەقێکی (عام) تایبەت دەکرێت، یان دەقێکی ڕەها (**المطلق**) وابەستە (مقید) دەکرێت، هەروەها لادانی حوکمێکی شەرعی و دانانی حوکمێکی تری

---

[1] الحجرات:١٠.

[2] الانفال: ٤٦.

[3] الناسخ والمنسوخ، ابن حزم الاندلسی، ١/ ٦.

شەرعییە لە شوێنی.[1] ئایەتەکانی: **"وَإِذَا بَدَّلْنَا آَيَةً مَكَانَ آَيَةٍ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوا إِنَّمَا أَنْتَ مُفْتَرٍ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ"**[2]، **"مَا نَنْسَخْ مِنْ آَيَـــةٍ أَوْ نُنْسِهَا نَأْتِ بِخَيْرٍ مِنْهَا أَوْ مِثْلِهَا أَلَمْ تَعْلَمْ أَنَّ اللَّهَ عَلَي كُلِّ شَيْءٍ قَـــدِيرٌ"**.[3] قورتوبی دەڵێت: هۆکاری دابەزینی ئەم ئایەتە ئەوەیە کاتێك مـسوڵمانان لـە نوێژدا ڕوویان کردە کەعبە، جووەکان کەوتنـە تانـەدان لـە ئیـسلام وگوتیـان: محەمەد فەرمانێك بـە هاوەڵـەکانی دەکـات و دوایـی ڕێگرییـان لـێ دەکـات، ئەگەر ئەم قورئانە لەلایەن سەرچاوەوە بنێردرایـە، دژبەیـەك نـەدەبوو.[4] یـان فـەخرەدینی ڕازی دەڵێـت: مەبەسـت لـە لەکارخـستنی ئایـەتێك و دانـانی ئایـەتێکی تـر لـە جێگـەی، شـەریعەتی کتێبـە کۆنـەکانی وەکـو تـەورات و ئینجیلـە، کـە لەوانـەدا شـەممە ڕۆژی حەسـانەوەیە، لـە نوێـژدا ڕوو دەکەنـە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا[5]. ئەگەر یەك بە یەك ئێمە بچینە سـەر ڕای شـارەزایانی زانـستی قورئـان و ڕاڤـەکارانی قورئـانی پـیرۆز، ڕاجیاییـەکی زۆر لـەبارەی لەکارخستنی ئەو ئایتە پیرۆزانە بە ناوی (ئایەتی شمشێر) هەیە، بۆیـە ئەگـەر هەموو ئەو ئایەتانەی باس لە پێکەوەژیان دەکـەن، بـە لـەکارخراو دابنرێـت، ئەوە ستەمێکی گەورەیە لە بانگەوازی ئیسلامی و ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵە بەڕێزەکانی. ڕاستکردنەوەی بیرۆکەی لەکارخستن و خستنیە سەر تێگەیـشتنی

---

[1] نواسخ القرآن، جمال الدين، بن محمد الجوزي، چاپی: ١٩٨٤، ٢/ ٤٦.

[2] النحل: ١٠١.

[3] البقرة: ١٠٦.

[4] تەفسیری قورتوبی، ٢/ ٦١.

[5] تەفسیری ڕازی، ٢/ ٢٦٦.

ڕاست و ڕەوان، کەوا کۆمەڵێك لە زانایان و شارەزایان قسەیان لەبارەوە کردووە، ئیشکالێکی گەورەی لێکتێگەیشتن و پێکەوە مەدارکردن لەگەڵ هەڵگرانی ئایین و قەناعەتە جیاوازەکان، چارەسەر دەکرێت، بۆیە حەقی خۆیەتی شارەزایانی ئەو بوارە زیاتر قسەی لەسەر بکەن. کە وابێ ئەم ئایەتانە دەربارەی لەکارخستنی شەریعەتی ئایینەکانی پێشووە. دانانی ئەو ئایەتە پیرۆزانەی باس لە پێکەوەژیان و چاوپۆشی و ئازادیی ڕادەربڕین دەکەن، کە هەندێك لە کۆنەوە قەناعەتیان وایە لە کاتێکدا مسوڵمان و غەیری مسوڵمان، هەر کەس لەماڵی خۆی بێت و کەس حەقی بەسەر ئەوی تریانەوە نەبێت، ئەو کاتە جیهاد و بەگژداچوونەوەی بێباوەڕان و دۆستایەتی وتەبەڕا بوون هیچ مانایەکیان نامێنێت.[1] دیارە هەڵگرانی ئەم ڕایەش بە پلەی یەکەم پشت بەو ئایەتەی سورەتی تەوبە دەبەستن کە دەفەرموێت: "فَإِذَا انْسَلَخَ الْأَشْهُرُ الْحُرُمُ فَاقْتُلُوا الْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدْتُمُوهُمْ وَخُذُوهُمْ وَاحْصُرُوهُمْ وَاقْعُدُوا لَهُمْ كُلَّ مَرْصَدٍ فَإِنْ تَابُوا وَأَقَامُوا الصَّلَاةَ وَآتَوُا الزَّكَاةَ فَخَلُّوا سَبِيلَهُمْ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَحِيمٌ".[2] واتە: هەر کە مانگە حەرامەکان بڕانەوە، ئەو بتپەرستانەتان لەکوێ وەدەست کەوت، لە گرتن و بەندکردن و کوشتنیان دەست مەپارێزن و بۆسەیان بۆ بنێنەوە، ئەگەر پەژێوان بوونەوە و بوونە نوێژکەر و زەکاتدەر، ئەوسا دەستیان لێ هەڵگرن، خودا لە گوناھ خۆش دەبێ و دلۆڤانە.[3] کە ئەو زانایانەی بانگەشەی لەکارخستنی ئایەتەکانی قورئان

---

[1] في ظلال القران، ٣/ ٤٦١.

[2] سورةتی التوبة:٥

[3] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی : هەژار ل: ١٨٧

دەکەن، پێی دەڵێن: ئایەتی شمشێر. ئەو زانایانە ڕایان وایە ئەم ئایەتە حوکمی ١١٤ ئایەتی قورئانی هەڵوەشاندووەتەوە، کە باس لە ئاشتی و پێکەوەژیان و ڕێزگرتی موشریك و بێ باوەڕ دەکات.١ دکتۆر موستەفا زەڵمی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (التبیان) بە دوورودرێژی بەرپەرچی هەموو ئەوانەی داوەتەوە کەوا بانگەشەی لەکارخستنی ئایەتەکانی قورئان دەکەن، بە تایبەت ئەو ئایەتانەی باس لە پێکەوەژیان و لێکتێگەیشتن و چاوپۆشی دەربارەی ئایینەکانی تر دەکەن.[2] با لێرەدا نموونەی یەك ئایەت لەو ئایەتانە بهێنینەوە کە بانگەشەکەرانی لەکارخستن پێیان وایە بە ئایەتی شمشێر ئەو ئایەتەی لەکار خستووە و کار بە واتا و مەبەستەکەی ناکرێت. خوای گەورە دەفەرمووێت: "لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ".٣ ئەم ئایەتە چڵەپۆپەی ئازادیی مرۆڤەکان دەگەیەنێت، چونکە کۆی سورەتەکە دەڵێت: دینداری قەناعەتە، من قەناعەتم بەوە نییە ئێوە قەناعەتتان پێ هێناوە، هەر وەکو ئێوەش قەناعەتتان بەوە نییە من قەناعەتم پێیەتی، ئێوە دینی خۆتان بۆ خۆتان و منیش دینی خۆم بۆ خۆم.٤ یان دەفەرمووێت: "وَلَوْ شَاءَ رَبُّكَ لآمَنَ مَنْ فِي الآرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعًا أَفَأَنْتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّي يَكُونُوا مُؤْمِنِينَ".[5] ئەم ئایەتە

---

[1] الناسخ والمنسوخ فی القرآن الکریم، ابن سلامة، ١٦/١، والناسخ والمنسوخ، قتادة بن دعامة السدوسی، ٤٠/١، وتلخیص الناسخ والمنسوخ، للکرمی، ٦/١، والناسخ والمنسوخ، للنحاس، مکتبة الفلاح، طبعة:١٤٠٨، ص:١/ ١٢٣

[2] التبیان لرفع غموض النسخ فی القرآن، د. موستەفا زەڵمی، ضاثی: ٢٠١١، ل: ٥٩ ـ ٦٨.

[3] الکافرون: ٦

[4] التبیان لرفع غموض النسخ فی القرآن، د. مصطفی الزلمی، ص:٥٩. ٤

[5] یونس:٩٩

ئینکاریی ئەو شێوە کارانە لە پێغەمبەردا (صلی الله علیـە وسـلم) دەکـات. مانای ئایەتەکە بەم شێوەیەیە: ئاخۆ تۆ دەتـەوێ بـە زۆر ئـەم مەردمـە بـڕوا بهێنن؟[1] یان دەفەرموێت: "وَمَا أَنْتَ عَلَيْهِمْ بِجَبَّـارٍ".[2] واتـە: تـۆ زۆردارێـك نیت بەسەریانەوە.[3] یان دەفەرموێت: "لَسْتَ عَلَـيْهِمْ بِمُـسَيْطِرٍ".[4] واتـە: تـۆ زۆردارێك نیت لەسەریان.[5] یان دەفەرموێت: "إِنْ عَلَيْكَ إِلَّا الْبَلَاغُ".[6] واتـە: تەنیا ئەوەندەت لەسەرە مەبەستەکە ڕابگەیەنیت.[7] لەم چەند ئایەتە پیرۆزەوە دەگەینـە ئـەو ئەنجامـەی بابـەتی ئیمـان و گـۆڕینی قەناعـەتی مرۆڤـەکان، ڕێککەوتنیان لەسەر ناکرێت. هەموو کەسێك ئازادە چۆن گۆڕانکاری لە دڵ و باوەڕ و ئیمانەکەیدا دەکات. ئەو ئایەتەی سورەتی (الکافرون) وەکو وەڵامێك بۆ هاوبەشپەیداکەر و بێباوەڕەکانی شاری مەککـە دابـەزی، کـە داوایـان لـە پێغەمبەر (صـلی اللـە علیەوسـلم) دەکـرد ڕێککـەوتنێك بکـەن، کـە ئـەوان ساڵێك بچنە سەر دینی ئیـسلام و پێغەمبـەریش سـاڵێك بـچێتە سـەر دیـنی ئەوان.[8] کە ئەم ئایەتە پیرۆزە ڕاستیی بێباوەڕەکان دەردەخات، ئەوەی ئـەوان

---

[1] قورئانی پیرۆز وەرگێڕانی: هەژار، ل:٢٢

[2] ق:٤٥

[3] قورئانی پیرۆز، وەرگیرانی هەژار، ل:٥٢٠

[4] الغاشیة، ٢٢

[5] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار.

[6] الشوری:٤٨.

[7] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار ل ٤٨٨.

[8] اسباب النزول، علی بن احمد بن محمد بن علی، النیسابوری، دار الکتب العلمیة، طبعة: ٢٠٠٠، ص: ٨٧٤.

داوایان دەکرد، ئەوە ئیمانهێنان نییە، بەڵکو ئەوە ڕێککەوتنێکی سیاسییە و ناچێتە چوارچێوەی گـۆڕینی قەناعەتـەوە و گۆڕانکـاری لـە هەسـت و هۆشـی مرۆڤەکاندا دروست ناکات، بۆیە خـوای باڵادەسـت ئـەو شـێوە باوەڕهێنانـەی قبووڵ نەکرد. وەپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە کردەوە خۆی ڕاڤەی ئەم ئایەتە پیرۆزەی کردووە، بۆیە نەدەبوو زانایانی پێشوو خۆیان ماندوو بکردایـە و بەڵگە بهێننەوە لەسەر لەکارخستنی ئەو ئایەتە پیرۆزە. هەر وەکو لە بەندی یەکەمی پەیمان(دەسـتوور)ی مەدینـەدا هـاتووە: "لليهـود ديـنهم وللمـسلمين دينهم". [1] کە ئەم بەندە بێ کەم و زۆر جێبەجێکردنی ناوەرۆکی ئایەتی: "**لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِيَ دِينِ**"ە. [2] خۆ ئەگەر تەماشایەکی هەڵسوکەوتی پێغەمبەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) بکـەین، چـۆن مامەڵـە و هەڵـسوکەوتی لەگـەڵ ئایینـە جیاوازەکاندا کردووە، بۆمان دەردەکەوێت، زۆر جار بـەهۆی سەرسـامبوونیان بە هەڵسوکەوت و ئاکاری بەرزیـەوە، هەنـدێك لـە بێبـاوەڕ و شـوێنکەوتووی ئایینەکانی تـر، مـسوڵمان بـوون و دەسـتبەرداری ئایینـەکانی خۆیـان بـوون. لێـرەدا مەبەسـتم ئـەوە نییـە بەرپەرچـی ئەوانـە بدەمـەوە کـەوا بـاس لـە هەڵوەشاندنەوە و لەکارخستنی ئایەتەکانی پێکەوەژیان لە قورئاندا بە ئایەتی شمشێر دەکەن، چونکە ئـەوە کەسـانی پـسپۆڕ لـەو بابەتـەدا قـسەیان لەسـەر کردووە و مافی خۆیشیان پێ داوە، بـەڵام مەبەسـتی مـن ئەوەیـە ئـەو جـۆرە

---

[1] کۆی پەیمانی مەدینە، کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ لایەنەکانی تردا بەستی، دەچێتە چوارچێوەی فەرمودە ڕاستەکانەوە، السيرة النبوية، عرض وقائع وتحليل احداث، على محمد محمد الصلابى، ١/ ٤٩٢.

[2] الكافرون: ٦.

تێگەیشتنە زەرەری گەورەی لە ئیسلام و بانگەوازی ئیسلامی داوە، ئەو جۆرە تێگەیشتنانە لەگەڵ ناوەرۆکی قورئان و پەیامی ئیسلامدا یەك ناگرنەوە.

### ج- بانگەواز و گەیاندنی پەیامی ئیسلامی

یەکێك لەو ڕێگیانەی خەڵکی لێوەی بە ئیسلام وەکو بەرنامەی ژیان ئاشنا دەبن، ڕێگای بانگخوازەکانە. ئەگەر ئەوان شارەزا و لێزان بن لە هەڵسوکەوت و گەیاندنی پەیامەکەیان، کاریگەرییان لەسەر دەوروبەریان هەبێت، ئەوان دەبن بە یەکێك لەو کەسانەی دەتوانن ببنە هەوێنی ئاشتیی کۆمەڵایەتی. بانگخوازەکان ئاوێنەیەکن خەڵکی لەوانەوە جوانیی ئیسلام دەبینێت. بۆیە پێویستە بانگخواز لە بانگەوازەکەیدا بەرچاو ڕوون بێت و بزانێت بانگەواز بۆ چی دەکات.[1] وەکو خوای گەورە ڕێنمایی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەکات و دەفەرموێت: **"قُلْ هَذِهِ سَبِيلِي أَدْعُو إِلَى اللَّهِ عَلَى بَصِيرَةٍ أَنَا وَمَنِ اتَّبَعَنِي وَسُبْحَانَ اللَّهِ وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ"**.[2] ئەوەی لەم ئایەتە پیرۆزە وەردەگیرێت، ئەوەیە بانگخواز دەبێ زۆر متمانەی بە پەیامەکەی هەبێت، کە ئەوەش وا دەکات خەڵکیش متمانەی پێ ببەخشن. **"كُنْتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنْكَرِ وَتُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ"**.[3] کەسانێك دەتوانن چاکەکان پیادە بکەن و ڕێگری لە خراپەکان بکەن، هەموو نەخۆشییەکانی ناو کۆمەڵگا و چارەسەرەکەشی

---

[1] اصول الدعوة، د. عبدالكريم زيدان، چاپی نۆیەم، ٢٠٠٢، ل:٣٠٧.

[2] یوسف:١٠٨.

[3] العمران: ١١٠.

بزانن. کەسێك ئەگەر لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆ مەڵایەتی و فیکری و ڕۆشەنبیرییەوە لە دابونەریت و باوەڕ و ئاکارە دزێوەکان نەزانێت، کە چی خراپ و نامۆیە بۆ خەڵك، چۆن ڕێگریی لێ دەکات؟! ناتوانێت بانگخوازێکی کاریگەری ناو کۆمەڵگا بێت. بە هەمان شێوە کەسێك لە ڕووی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فیکری و ڕۆشنبیرییەوە شارەزایی لە پێداویستییەکانی کۆمەڵگا نەبێت، چۆن فەرمانی پێ دەکات؟ دووبارە ناتوانێ ببێتە جێگەی تەماحی خەڵك، کە لەژێر ڕۆشنایی ئەو دوو ئایەتە پیرۆزەوە ئاماژە بەوە دەکەین دەبێ بانگخواز لەو سێ بڕگەیەدا خوێندنەوە و شارەزایی تەواوی هەبێت:

١. تەنها یەك قوتابخانە، یان یەك ڕێڕەوی زانایانی فیکر و فیقهی ئیسلامی سەرچاوەی تەرزی بیرکردنەوەیان نەبێت. هەوڵ بدات سوود لە زانیاری و ئەزموونی زانایانی هەردوو قوتابخانەی عەقڵی و نەقڵی ببینێت و ئاوێتەیان بکات. بانگخوازی سەرکەوتوو دەبێ بەبێ جیاوازی هەموو خەڵك لێی سوودمەند بن و نابێ تەنها مۆرکی فیکر و تێگەیشتنی یەك ڕێڕەو یان یەك قوتابخانەی پێوە بێت و یەك توێژ لە خەڵکی گوێی لێ بگرن. خۆ لەوانەیە ئەم خاڵە بەشێك لە ئازادیی بانگخوازی تێدا زەوت بکرێت، چونکە هەموو کەس ئازادە لایەنگری چ قوتابخانەیەك، یان ڕێڕەوێك، یان پارتێکە، بەڵام لەبەر ئەوەی لە وڵاتی ئێمە وایە ئاستی هۆشیاریی خەڵك نەگەیشتووە بە ئاستێك تەماشای جوانی و چاکی و سوودی قسەکان و ڕەفتاری بانگخوازەکان بکات، بەڵکو بەدواداچوونی بۆ دەکات کە ئەم بانگخوازە لایەنگری کوێیە و سەر بە چ قوتابخانەیەکە، بۆیە کە بۆی دەرکەوت سەر بە

قوتابخانەیەکی جیاوازە لەو لایەن و قوتابخانەیەی ئەو لایەنگیریی دەکات و خۆشی دەویت، دوور نییە یەکسەر بڕیاری خۆی بدات و هێڵێکی سوور بە دەوری قسەکانیدا بهێنێت. جاری وا هەیە بابای بانگخوازیش ناتوانێت لایەنگیریی قوتابخانەیەك بە قسە و بۆچوونەکانیەوە دیار نەبێت، بە شێوەیەك هەندێ کات گوێگرەکان ئەوەی لێ بخوێننەوە ناڕاستەوخۆ بانگەشە بۆ لایەنێك دەکات. لێرەوە دەبێ بچینە نێو باسێکەوە تازە لەنێو بەشێك لە بزاڤە ئیسلامییەکاندا خاکەلێوەیەتی و لەهەندێك وڵات دەستیان پێ کردووە، ئەویش جیاکردنەوەی بانگەوازە لە سیاسەت و حیزبایەتی. ئەو هەنگاوە بۆ پارتە ئیسلامییەکان سەرسووکییەکیشە، ئیتر بۆخۆیان لێ دەبڕێن بۆ کاری سیاسی و لە گوریسپچڕێنەی قوتابخانە جیاوازەکانیش ڕزگاریان دەبێت، کە هەرکەس بۆ بەهێزکردنی پێگەی خۆی هەوڵی زاڵکردنی تێڕوانین و دونیابینیی خۆی بدات، لە هەمان کاتدا کاری بانگەوازیش بەجێ دەهێڵن بۆ بانگخوازەکان و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی. بۆ بانگخوازەکانیش دەسکەوتێکی باشە، چونکە نابنە خۆراکی بانگەشەی هەڵبژاردن و پێشخۆراکی پارتە سیاسییەکان. ئەوکاتە هاووڵاتییانیش بە گومان و دڵەڕاوکێوە گوێ بۆ قسەکانیان ناگرن، کە ئایا ئەم بانگخوازە بەبێ ئەوەی بە خۆمان بزانین داخوا ئەمان کات بە جەماوەری چ پارت و ڕێکخراوێك.

٢. شارەزا بێت لە بیروڕای عەلمانییەتی سەردەم بە تایبەتی و ڕێڕەوە فیکرییە جۆراوجۆرەکانی تر. لەوانەیە خەڵکی بە گشتی پێویستیان بەو زانیارییانە نەبێت، بەڵام ڕێڕەو و دونیابینیی عەلمانیەت، وەکو بزووتنەوەیەکی فیکری، دەیەوێت لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا جێ پێی خۆی قایم بکات، بە

تایبەت عەلمانییە شمولییە توندڕەوەکان، کە سەرتاپای ئیسلامیان لا ڕەفزە و باوەڕیان بە پێکەوەژیان نییە.[1] عەلمانییە میانڕەوەکان، ئەوانەی باوەڕیان بە پێکەوەژیان هەیە، ئەوە بە هەمان شێوە ئێمەش دەبێ ئەو دەرگایەیان لەگەڵدا بکەینەوە و دەکرێت لەگەڵ ئەواندا لێکتێگەیشتن و پرۆژەی هاوبەشمان پێکەوە هەبێت، ئەمەش هەنگاوێکە بۆ بانگخوازەکان، بۆ پۆلێنکردنی خەڵکی و وازهێنان لە گشتاندن، لە گوتارەکانیاندا. زۆر گرنگە بانگخوازەکان ئاگایان لە کون و کەلەبەرەکانی سیستمی دیموکراسی بێت، شارەزاییەکی باشیان لە خاڵە بەهێز و لاوازەکانیدا هەبێت. دەبێ دیموکراسیەت وەکو میکانیزمی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی وڵات، جیا بکەنەوە لە قوتابخانە فەلسفییە جۆراوجۆرەکانی ڕۆژئاوا. ئیسلام لەگەڵ دیموکراسیەتدا وەکو میکانیزمی حوکمڕانی و بەڕێوەبردنی وڵات، هیچ تێکگیرانێکی نییە، بەڵام لەگەڵ ئایدیا و قوتابخانە فەلسەفییە مادەگەراییەکانیدا، تێگیرانی زۆر هەیە

---

[1] عەلمانیە توندڕەوە کوردەکان، ڕەخنە لە ئیسلام ئەگرن و، قەناعەتیان وایە سەرچاوەی هەمو دواکەوتویەکی گەلی کوردە، ئەمانە خۆیان ڕاستەو خۆ هیچ شارەزایی ولێکۆڵینەوەیەکیان لە سەر ئیسلام نیە، بەڵکو سەرچاوەی زانیاریان نوسراو و، لێکۆڵینەوەی، عەلمانیە توندڕەوە عەرەبەکانی وەکو: محمد ئەرەگۆن و، هاشم صالح و، علی حەرب و، نصرحامد ابوزەید و، حسن حنفی و، محمد عابد الجابیری و، د. ئەدۆنیس و، محمد شحرور و، جۆرج تەرابیشی و، ساتع الحصری یە، وەعلمانیە عەرەبەکانیش شوێن کەوتوی عەلمانیە کانی ڕۆژ ئاوان و، پشت بەسەرچاوەو، لێکۆڵینەوەو، نوسینەکانی ئەوان دەبەستن، لە هاوشێوەی: شلیرماخر، ویلهلم دیسلی، مارتن هایدجر، هانس جۆرج جادامار، برناردلویس، مونتطمەری وات، ئیدوارد سیل، جۆستاف فایل، نۆلدك، سەرچاوە: حوار الاسلام والعلمانیة فی کردستان، دراسة فی تلاقی الاسلام والعلمانیة، ئامادەکردنی: د. عوسمان علی، چاپی یەکەم: ٢٠١٥، ل: ٥١٢ـ ٥٢٩ـ ٥٤٠ـ٥٥٢ـ ٥٢٣.

و لەگەڵ ئیسلامدا پێکەوە دانولەیان ناکولێت و لە مەنجەڵێکدا جیگەیان نابێتەوە. لەگەڵ شارەزابوون لەو چەمکە فیکرییانەدا، نابێ ئەوەمان لەبیر بچێت بانگخواز پێویستە ئاگاداری باو و نەریتی کوردەواری بێت، چ بەو زمانە قسە و دەربڕینەکانی بکات، باسی چیرۆك و بەسەرهات و باو و نەریتە کوردییە ڕەسەنەکان بکات[١]، هەروەها سەرنجی گوێگران و هەوادارانی بۆ مێژووی پرشنگداری باو و باپیرانمان ڕابکێشێت، بە تایبەت زانا پایەدار و شاعیران و ئەدیبە خامە بەپێزەکان. ئەوکاتە لەگەڵ گێڕانەوەی نموونەی بەسەرهات و ڕووداوەکانی مسوڵمانانی دونیادا، بەسەرهاتی ئەوانیشیان بۆ بگێڕنەوە، با چیتر فیقهی وڵاتانی تری جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی ئەوان و زاراوە و دەستەواژەی ئەوان بەکار نەهێنین. ئەگەر سوودیشمان لێیان بینی، هەوڵ بدەین ئەو دەق و زاراوە و دەستەواژانە بە ڕەوانی و پاراوی وەربگێڕینە سەر زمانی کوردی، تام و بۆنی کوردەواری بگرێت. کۆمەڵێك بنەمای شەرعی، وەکو باو و عورفی خەڵکی[٢]، ڕەچاوکردنی بەرژەوندییەکان، کە لە ئوسوڵی فیقهدا باس کراون، هەموو جیهانی ئیسلامی دەتوانن بە گوێرەی وڵاتی خۆیان سوودی لێ ببینن، بۆیە پێویست بە گواستنەوەی زمانی گەلان و وڵاتانی تر، یان داب ونەریتی گەلانی تر ناکات.

---

[١] کاك تۆفیق کەریم لەسەر کەلتوور و کەلەپووری کوردی، زنجیرە کتێبێکی نووسیوە، لەم بوارەدا سوودی لێ دەبینرێت، جێگەی خۆیەتی برایانی بانگخواز بگەڕێنەوە بۆی.

[٢]علم اصول الفقة، عبدالوهاب خلاف، ل: ٩٩، واصول الفقة فی نسیجة الجدید، د. مصطفی زەڵمی، ل: ١٠٨.

٣. گەیاندنی پەیام و بۆچوونەکان، پێویستە بە شێوازێکی زانستییانە و واقعییانە و زمانی سەردەم بێت.[١] گرنگترین هەنگاویش شارەزابوونە لە سروشتی کۆمەڵگا و زانینی قەیران و کێشە جۆراوجۆرەکانی، لە هەندێك شوێن کێشەی ئابووری و گرانیی ژیان و گوزەران هەیە، لە هەندێ شوێنی تر کێشەی سیاسی خەڵکی سەرقاڵ کردووە، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێت: پێویستە بانگخواز لە بارودۆخی سیاسیی وڵات و هەرێمەکەی شارەزا بێت، خۆ ئەگەر چارەسەرکردنی بە حوکمی پیشەکەی ئەرکی ئەو نەبێت، بەڵام قورساییەك بە پێگە بانگخوازییەکەی دەبەخشێت. لە هەندێك شوێنی تریش کێشەی کۆمەڵایەتی پەرەی سەندووە، لە هەندێك ناوچەش ململانێی هزریی جۆراوجۆر هەیە، کاتێك بانگخواز دەیەوێت پەیامەکەی بگەیەنێت، دەبێ شارەزای ئەو ژینگەیە بێت و جگە لە زانیارییەکی باش لە زانستە شەرعییەکاندا، شارەزایی لە ئابووری و بابەتی کۆمەڵناسیدا هەبێت. پێویستە بانگخواز و خاوەن پەیامەکان، هەموو ئەو بەربەستانەی وەکو: نامۆبوون بە جەماوەر بە هۆی بوونی گوتاری نوخبەوی یان شێواز و سیما،

---

١ بۆ نموونە ناکرێت لەم سەردەمەدا، بەبێ سەرەنج و تێبینی و ڕوونکردنەوە، باس لە فیقهی سیاسیی سوڵتانی هاوشێوەی (الاحكام السلطانية)ی ماوەردی و ئەبو یەعلاو(التبر المسبوك) ی ئیمام غەزالی بکرێت، یان لە حوکمی ئەهلی زیممەدا مەرجەکانی ئیمامی عومەر خوا لێی ڕازی بێت، بەو شێوەیەی ئیبن القیم هێناویەتی، لە(احكام اهل الذمة، ابن القيم الجوزية، دارابن حزم، بيروت، چاپی یەکەم، ١٩٩٧، ٣/١١٥٩. باس بکرێت، کە جیاوازییەکی بەرچاو لە نێوان ئەو مەرجانە هەیە لەگەڵ ئەو ڕێکەوتنەی لە: المجلة العلمية، للمجلس الاوربی للافتاء والبحوث، ذمارة:١٠-١١، ج١/٢٠٠٧. یان بەبێ ڕوونکردنەوەی تەواو، باس لە پێناسەی وڵاتی ئیسلام و وڵاتی کوفر (دارالاسلام ودارالكفر) و حوکمی نیشتەجێبوون تیایاندا بکرێت.

یان جۆرێ هەڵسوكەوتی تایبەت بە گرووپێك، یان چوونە نێو ناونیشانێکی تایبەت کە جیایان بکاتەوە لە خەڵك، کە زۆر جار بانگخواز تەنها لە یەکێك لەو دەرگایانەوە دەچێتە ناو خەڵك و لەو ڕێگەیەشەوە زانیاری و هەڵسەنگاندن لەسەر خەڵکی وەردەگرێت، جگە لە ئەهلی مزگەوت و خەڵکی دیندار، یان یەکێك لەو توێژانە، ئاگایان لە چین و توێژەکانی تر نییە، خەڵکە گشتییەکەش ئاگایان لە خولیا و خەمی بانگخوازان نییە و هیچ کامیان لە زمانی یەکتر تێناگەن.

لێرەدا بە پرسیارێك وەڵامی بەشێك لە بانگخوازان دەدەینەوە: ئایا بانگخوازان تێکەڵ بە خەڵکی ببن و ڕێگەی ڕاست و چۆنیەتی دوورکەوتنەوەیان لە هەڵە و کەموکورتی و بێشەرعییان بۆ ڕوون بکەنەوە، لە بیر و باوەڕ و ئاداب و ئاکارە ئیسلامییەکان و حەڵاڵ و حەرام تێیان بگەیەنن باشترە؟ یان لە پێناوی سەلامەتیی دڵ و دەروون و لە پێناوی هەندێك سیمای دینداری و بە بیانووی پارێزگاری لە سام و پێگەی بانگخوازان، دوورەپەرێزی بکەن و تێکەڵ بە خەڵکی نەکەن چاکترە؟

بانگخواز کاتێك سەرکەوتوو دەبێت، بتوانێت هەستیاریی خەڵکی لە بەرانبەر خۆیدا نەهێڵێت، وەڵامی بە هەڵە تێگەیشتن و گومانەکانی خەڵکی کە لە بەرانبەریدا دروست بووە، بداتەوە. بانگخواز هەرچەند زانا و ڕەوانبێژ بێت، تا تەلبەند و پەرژینەکانی نێوان خۆی و خەڵکی نەقرتێنێ، خۆماندووکردن و هەوڵ و کۆششەکانی کەمبەرهەم و خەرمانی کەمبڕشت دەبێت، بۆیە خاوەن پەیامەکان، دەبێ هەمیشە بە دوای ئەو دەروازانەوە بن و

لەو دەرگایانە بدەن کە لـە ڕێگایانـەوە دەتـوانن بـچنە نـاو هەسـتن و هۆشـی خەڵکەوە.

بەشێك لە هەڵەی خاوەن پەیامەکان ئەوەیـە: لـەو شـوێنانەوە دەسـت پـێ ناکەن کە خودا و پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لێیانـەوە دەسـتیان پـێ کردووە. ئەولەویەت بـەو بابەتانـە بـدەن کـە لـە قورئـان و سـونەتدا جێگـەی ئەولەویەتن، ئەو مەسەلانەش دوا بخەن کـە ئـەوان بـۆ پلـەی دووەم و سـێیەم دوایان خستووە. لەباتی بایەخدان بە بیر و باوەڕ و دامەزراوی لەسەر ڕەوشـت و ئاکارە بەرزە ئیـسلامییەکانی وەکـو: خۆشەویـستی خـودا و ئاشـنابوون بـە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، خزمەتکردن و بەدەمەوەچوونی خەڵکی و چارەسەری کێـشەی ئەوانـەی کەمدەرامـەت و هـەژارن، لێبـوردەیی بەرانبـەر هەڵەی یەکتر و چاوپۆشیکردن و پۆشینی عـەیب و عـاری دەوروبـەر، کـە بـە کردار بانگخوازێکی بێدەنگ بن، بەڵام دەبینین تەنها هەندێك ڕواڵەتیان لـەلا خۆشەویست دەکرێت و فێری ڕەخنەگرتن لە هەندێك بابـەتی لاوەکـی دەبـن و کاتەکانیان بە هەنـدێك بابـەتی خـیلافی نێـوان زانایـانی پێـشین و باسـکردنی کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامییەکان بەسەر دەبەن و ئەو کەسانەیان لـەلا دینـداری تەواوە کە سەر بە قوتابخانەکەی ئەوان بن، بە چـاوی ڕەخنـە و جوداکارییـەوە تەماشای ڕێـڕەو و قوتابخانـەکانی تـر دەکـەن، هەڵـسەنگاندنیان بـۆ چـاکی و خراپیـی دەوروبـەر، لەسـەر ئـەو جـۆرە تێگەیـشتنانەیە. دەبـێ ئـەم جـۆرە پەروەردەکردنانــە ســەرتاپایان پێداچــوونەوەیان پێــدا بکرێــت و پێــچەوانە بکرێنەوە. زۆر پێویستە برایان و مامۆستایانی بانگخواز، وەکو مامۆسـتایان و پزیـشکان و خـاوەن پیـشەکانی دیکـە کـە بـۆ ئـەوەی لـە پیـشەکانیان دوا

نەکـەون، نـاو بـەناو پێداچـوونەوە بـە زانیـاری و میکـانیزمی بـەڕێوەبردنی کارەکەیاندا دەکەن، لە دەرەوە یـان نـاوخۆی وڵات، لـە سـەنتەرە ئـەکادیمی و پەیمانگاکاندا، خولی جۆراوجۆر دەبینن و ڕاهێنانی تـازە فێـر دەبـن، هـەموو کات بە کۆمەڵێك زانیاری و ئەزموونی تازەوە ڕووبەڕووی قوتابی و نەخۆش و کارمەنـد و دەوروبـەریان دەبنـەوە، بەڕاسـتی هـەموو ئەوانـەی لـە پرۆسـەی بانگەواز و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و گەشەی مرۆییدا کار دەکەن، زۆرتر پێویستیان بە ئەزموونی خەڵکانی تر هەیە. خوای گەورە دەفـەرموێت: **"وَفَوْقَ كُلِّ ذِي عِلْمٍ عَلِـيمٌ"**.[1] یـان پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) دەفەرموێت: **"الْكَلِمَةُ الْحِكْمَةُ ضَالَّةُ الْمُؤْمِنِ حَيْثُمَا وَجَدَهَا فَهُوَ أَحَقُّ بِهَا"**.[2] بەڵام بە داخـەوە لـە وڵاتـی ئێمـە هەنـدێك لەوانـەی کـە خـەڵك گوێیـان لـێ دەگرێـت، لەوبارەیـەوە دەستپێـشخەرییان نییـە، وا دەزانـن مـادام خۆیـان دەخوێننەوە و بەدواداچوونیان هەیە، ئەو جۆرە کۆڕ و کۆبوونەوانـە بـۆ ئـەوان پێویست ناکات و بەشداریکردنیان لەوانەیە زەرەر بە پێگەیان بگەیەنێت! کـە بە خۆیان بزانن یان نا، ئەم جۆرە بیرکردنەوانە وایان لێ دەکات لە چوارچێوەی ئەو باو و نەریتەی دەقیـان پێـوە گرتـووە، لـە جـۆری زانیـاری و ئـەزموون و جلوبەرگ و سیما و ڕواڵەت و شێوازی بیرکردنـەوە و لێـدوان و قـسەکردنیان،

---

[1] یوسف: ٧٦.

[2] سونەنی ابن ماجة، باب الحكمة، ١٢/ ٣٥٨/ ٤٣٠٨، وةسونةنى الترمذى، ١٠/ ٢٠٩/ / ٢٩٠٣.

لێی لانەدەن و لە ئاستی بانگخوازێکی سەردەمییانەدا نەبن[1]. ئەم تێبینی و سەرەنجانەی ئێمە دەیخەینە ڕوو، لە زاراوەی قورئانیدا پێیان دەوترێت: حیکمەت و ئامۆژگاریی جوان و گفتوگۆی لەبار، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: "**ادْعُ إِلَي سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ**".[2] لە ڕووی زمانەوانییەوە (**الحكمة**) بە لغاوی ئەسپ دەوترێت، چونکە ناهێڵێ سەرکێشی بکات و جڵەو بپچڕێنێت و خاوەنەکەی عەزێت بدات.**٣** وەرگرتنی زانیاریی بەکەڵك بە ڕێگە و میکانیزمی چاك، پێی دەوترێت (حکمە).[4] لە زاراوەشدا ئەنجامدانی کارێکە، بەو شێوەیەی مەبەستە و لەو کاتەی پێویستە ئەنجام بدرێت. کەسێك وردەکاری لە پیشەکەیدا بکات پێی دەوترێت (حکیم).[5] قورئانی پیرۆزیش دووپاتی ئەو مانایە دەکاتەوە بۆ حیکمەت و دەفەرموێت: "**يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَنْ يَشَاءُ وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا**".[6] بۆیە دەبێ لە کاتی بانگەوازدا، کات هەڵبژێردرێت بۆ قسەکردن بۆ خەڵك و وردەکاریی تێدا بکرێت. بزانیت تا

---

١لە هەڵسەنگاندمان بۆ بانگخوازە بەڕێزەکان نابێ گشتاندن بکەین، چونکە هەندێك بانگخوازیش لەهەرێمی کوردستان هەیە شارەزاییەکی باشی سەردەمیانەوزمانی سەردەم ئەزانێت وخەڵکیش بەگشتی لێیان سودمەند بوە.

٢النحل: ١٢٥.

[3]تاج العروس، من جواهر القاموس، مرتضى الزبيدي، فصل الحاء، ٧٦٧٣/١.

[4]لسان العرب، ابن منظور، ١٤٠/١٢.

[5]النهاية فى غريب الحديث والاثر، ابن اثير، باب الحاء مع الكاف، مادة: حكم: ١١٩/١.

[6]البقرة: ٢٦٩.

چەنێك بەرانبەر ئامادەی گوێگرتن و بایەخدانی بەو پەیامە هەیە کە تۆ بە نیازیت پێی بگەیەنیت. نابێ قسەکردن بۆ کەسی بەرانبەر تەنها بۆ ئاسودەکردنی ویژدان بێت، بۆ نموونە کەسێك پێگەیەکی سیاسی یان کۆمەڵایەتی یان زانستیی بەرزی هەیە، بۆ مەبەست و کارێکی دیاریکراو دێتە سەردانت، یان تۆ دەچیتە سەردانی ئەو، نابێ ئەو کاتانە بە هەل بزانیت بۆ گەیاندنی پەیامەکەت، چونکە لایەنی بەرانبەر بۆ کارێکی ئامانجداری دیاریکراو هاتووە، یان تۆ بۆ کارێکی دیاریکراو و گەیاندنی پەیامێکی دیاریکراو چوویت بۆ لای ئەو، لە دەرەوەی گەیاندنی ئەو کارە، هەر کارێکی تر ئەنجام بدرێت، دەبێ بە کارێکی لاوەکی، بەرانبەر ئامادە نییە قسەی دڵی خۆیت بۆ بکات و بە ڕاشکاوانە ڕا و سەرەنجی خۆی سەبارەت بە پەیامەکەی تۆ بڵێت، هەر زۆر ڕێزت لێ بگرێت، هەندێك موجامەلەت دەکات و بەس. بۆیە کاتێك پیاوێك، یان ئافرەتێك دەبینیت، بە دینەوە پابەند نییە و پێت خۆشە پەیامێکی پێ بگەیەنیت، پێشەکی زەمینەسازی وەکو یەکتر ناسین، یان سەردانکردنی لە ماڵەکەی، یان لە فەرمانگەکەی بکە، پاشان پەیامەکەت بگەیەنە. بۆ کەسانێکیش کە خاوەنی پێگەیەکی سیاسی یان کۆمەڵایتی یان زانستین، باشترین شێوازی گەیاندنی پەیام، بانگردنیانە بۆ ئەو کۆڕ و سیمینار و کۆبوونەوانەی، سەبارەت بە گفتوگۆی هزری لەبارەی ئایینەوە، یان گفتوگۆی لێکتێگەیشتنی نێوان ئیسلام و عەلمانی، یان ئیسلام و ناسیۆنالیستی ئەنجام دەدرێن. ئەم شێوازەی بانگەوازکردن، دەبێ بە ڕچەشکاندنێك کە گفتوگۆی کراوە لە نێوان لایەنە جیاجیاکاندا بسازێنرێت و ئەو لێك دوورییەی ئێستا لە نێوان لایەنە ئیسلامی و عەلمانییەکاندا هەیە،

کـه هـەر لایەنـە کـۆڕ و موناسـەباتی فیکریـی تایبـەت بـە خۆیـان هەیـە، ئیسلامییەکان تەنها نوێـژخوێن و ئـەهلی مزگـەوت و خەڵکـە دینـدارەکان و ئەنـدامان و لایـەنگرانی پارتـە ئیـسلامییەکان بەشـداری تێـدا دەکـەن، بـە پێچەوانەشەوە بۆ لایەنە عەلمانییەکان کۆتایی پیّ بێت.

## ح- بایەخ پێدانی لایەنە ئیسلامییەکان بە دارایی

دارایی، سەرچاوەی ژیانە. چەندین ئایەت و فەرموودەی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) لەبارەی گرنگیی ماڵەوە هەیە، کە هەندێك کات لە گرنگیدا پێش نـەفس کـەوتوە: **"وَتُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ"**[1] یان خوای باڵادەسـت بـە چـاکە نـاوی بـردووە: **"فَإِذَا قُضِيَتِ الصَّلَاةُ فَانْتَشِرُوا فِي الْأَرْضِ وَابْتَغُوا مِنْ فَضْلِ اللَّهِ وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ"**.٢ ئەوانەی هەڵە خەرجن، قورئان بە برای شەیتان ناوی بردوون.٣ وەکو دەفـەرموێت: **"وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا إِنَّ الْمُبَذِّرِينَ كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا"**.٤ خـوای باڵادەسـت فـەرمان دەکات بەوەی کە ئەو ماڵەی خودا کردویەتیە مایـەی گوزەرانتـان، مەیدەنـە دەست کەمئاوەزان،[5] وەکو دەفەرموێت: **"وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا"**. یان پێغەمبەر (صلى الله علیـە وسـلم) دەفـەرموێت:

---

[1] الصف ١١.

[2] الجمعة: ١٠.

[3] قورئانی پیرۆز وەرگیرانی هەژار، ل:٢٨٤.

[4] الاسراء: ٢٧.

[5] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار، ل: ٧٧.

**"الْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى"**.[1] کۆ ڕای زانایانی ئوسوڵی فیقھ لەسەر ئەوەیە: دارایی یەکێکە لەو پێنج زەرورەت و مەبەستە شەرعییەی ئایین بۆ پارێزگاری لێکردنی هاتووە.[2] لەم پێشەکییەدا دەمەوێت بچمە نێو وەڵامی ئەو پرسیارەوە کە لە کاتێکدا دارایی ئەوەندە گرنگە، هۆکاری چییە هەندێك لە مسوڵمانان و بەتایبەت بەشێك لە بزاڤ و لایەنە ئیسلامییەکان، بەرانبەر بەدەستخستنی دارایی کەمتەرخەمن؟ نەبووە بە هۆشیارییەك کە لە پلان و بەرنامە و ئەو پڕۆژانەی ئەنجامی دەدەن، چ وەکو تاك، یان وەکو کۆ، نەبووەتە هەنگاوی یەکەمیان کە تا دارایی مسۆگەر نەکەن، هیچ هەنگاوێکی تر نەنێن! بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە، چەند هۆکارێك هەیە کەئاماژەیان پێ دەکەین:

- یەکێك لەو هۆکارانەی وای کردووە هەندێك لە لایەنە ئیسلامییەکان مادە و سامان پشتگوێ بخەن، هەڵە تێگەیشتنە لە تەوەکول و پشت بە خوا بەستن، کە وەکو تاك هەندێ جاریش وەکو کۆمەڵ، بە خۆیان بزانن یان نا، قەناعەتیان وایە خوای باڵادەست ڕزق و ڕۆزیی دابەش کردووە، هەر پێش ئەوەی ڕۆح بکرێت بە بەریدا، خوای باڵادەست ڕیزقەکەشی بۆ نووسیوە، ئیتر خۆماندووکردن و گەڕانی بۆچییە؟! وەکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: **"إِنَّ أَحَدَكُمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا، ثُمَّ يَكُونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَكُونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِكَ، ثُمَّ يَبْعَثُ اللَّهُ مَلَكًا، فَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كَلِمَاتٍ، وَيُقَالُ لَهُ اكْتُبْ عَمَلَهُ وَرِزْقَهُ وَأَجَلَهُ وَشَقِي أَوْ سَعِيدٌ. ثُمَّ**

---

[1] صەحیحی بوخاری: ٥/ ٣٩٤/ ١٤٢٧.

[2] ارشادالفحول، للشوكاني، چاپی ١٩٩٩: ٢/ ١٢٩.

**يُنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ".**[1] مەسەلەی قەدەر وردەکاریی زۆری دەوێت، بەڵام ئەوەی دەکرێت لێرەدا باسی لێوە بکەین، ئەوەیە: نووسینی کردار و ڕزق و ئەجەل و بەدبەختی و بەختەوەریی مرۆڤەکان، لە نووسینی فریشتەکانە، ئەونووسراوانە جێگیرو کۆتا نیین، بەڵکو فریشتەکان دوای ئەوەی لە نووسینی بوونەوە، بەرزی دەکەنەوە بۆ لای خوای بالادەست، پاشان خوای بالا دەست: **"يَمْحُوا اللَّهُ مَا يَشَاءُ وَيُثْبِتُ وَعِنْدَهُ أُمُّ الْكِتَابِ".2** واتە: لەناودان و هێلانەوە، بەستە بە ویستی خوداوە و ماکی هەموو کتێبانیش وا لای ئەوە.[3] دەستکاریی کۆتا لەو شتانەی فریشتەکان بەرزیان کردووەتەوە بۆ لای خوای بالادەست، لەژێر ویست و ئیرادەی خودایە. ئەو زانیارییانەی لە تەتەڵەی هەرە بەرزی پاراستوو( **لوح المحفوظ** )دایە، نە فریشتەکان و نە پێغەمبەران و کەسی تریش نایزانن. بە هەڵە تێگەیشتن هەیە لەنێوان ئەو شتانەی فریشتەکان دەینووسن و ئەوانەی لە لای خودا پارێزراوە. هەندێك بیروباوەڕی زۆرەملیٚ (**الجبرية**)یان بۆ دروست بووە و دەڵێن: ئێمە وەکو پەڕ و پووش واین، چۆن بەبیٚ ویستی خۆیان با دەیان جوڵێنێت، ئێمەش ئەوها قەدەری خودا بەبیٚ ویست و دەسەلاتی خۆمان ئەمان جوڵێنێت و دەڕۆین بەرێوە.[4] قەدەر جۆری زۆری هەیە، بۆ نموونە: تەمەنی مرۆڤەکان و ڕزقی مرۆڤەکان دەستکاری دەکرێت، پاشان سالانە وەك لە ئایەتەکەی پێشوودا هەبوو لە

---

[1] صەحیحی بوخاری: ١١/ ٣٥٢/ ٣٢٠٨.

[2] الرعد: ٣٩.

[3] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار، ل:٢٥٤.

[4] شرح العقيدة الطحاوية، صالح بن محمد آل الشيخ، ١/ ١٣٠.

شەوی فەڕ و بەرەکەتدا (**ليلة القدر**) لـە مـانگی ڕەمەزانـدا لەلایـەن خـوای باڵادەستەوە، هێڵانەوە و لەناودانی تێدا دەکرێـت.**1** وەکـو خـوای باڵادەسـت دەفـەرموێت: "**فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ أَمْرًا مِنْ عِنْدِنَا إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ**".[2] لەوانەیە ئەوەی تۆ بە جێگیری دەزانیت، لەلایەن خـوای باڵادەسـتەوە گـۆڕانی بەسـەردا بێـت، بـە بەڵگـەی ئـەوەی پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـه وسـلم) دەفـەرموێت: "**مَنْ أَحَبَّ أَنْ يُبْسَطَ لَهُ فِي رِزْقِهِ، وَيُنْسَأَ لَهُ فِي أَثَرِهِ، فَلْيَصِلْ رَحِمَـــهُ**".[3] کـە لەوانەیـە ئەگـەر خـوای باڵادەسـت وەری بگرێـت، سـەردانی کەسوکار، هەموو ئەو نووسـینانە پێـچەوانە بکاتـەوە کـە فریـشتەکان پـێش ڕۆحبەبـەرداکردنی مرۆڤـەکان نووسـیویانە، بۆیـە هـەموو ئـەو شـتانەی فریـشتەکان نووسـیویانە لـە لای خـودای باڵادەسـت، لـە (**لـوح المحفـوظ**) جموجوڵیان تێدا دەکرێت، بە شێوەیەك ڕزق و تەمەن و بەختەوەری و نەگبەتی لە یەك حاڵەتدا نامێننەوە.

- هۆکارێکی تری گوێ نەدان بە وەدەستخستنی دارایی، بـۆ سروشـتی کـاری پـارت و لایەنـە ئیـسلامییەکانی سـەردەمی ڕژێمـە خۆسـەپێن و دیکتاتۆرەکان دەگەڕێتـەوە، کـە لـەو کاتانـەدا بەشـێك لـە ڕێکخـستنەکان و ئەندامـەکانیان، لەبەرکـەم ئـەزمونیان بیریـان لـە مەسـەلەی مـاڵ و سـامان ناکردەوە، دوای ڕووخانی ڕژێمی بەعس و دوای ڕاپەڕین، لە کاتی لێبڕانیان بۆ کاری ئیسلامی و پەروەردە و بانگەواز، زۆربەیان بیریان لە ماڵ پەیـداکردن و

---

[1] المستدرك على الصحيحين، للحاكم، ٨/ ٣٥٠/ ٣٦٣٦.

[2] الدخان: ٥.

[3] صەحیحی بوخاری: ٢٠/ ٧٨/ ٥٩٨٦.

پشتبەخۆبەستن نەدەکردەوە، بەڵکو ئەو کەسانەی کە توانای پەروەردە و بانگەوازیان هەبوو، لەلایەن پارت و ڕێکخراوەکەیانەوە، لە بەرانبەر لێبڕانیان بۆ کاری حیزبی و بانگەواز، مانگانە نەمر و بژی هاوکارییەکی موتەوازیعانەیان دەکردن، ئەوانیش بیری شەو و ڕۆژیان لە لای کاری حیزب و پێگەیاندن و بانگەواز بوو، بە جۆرێك لە جۆرەکان خۆیان بە خزمەتکاری دینی خودا زانیوە و قەناعەتیان وابووە خوای باڵادەستیش زایەیان ناکات و ڕێنموونی و سەرپەرشتییان دەکات، بۆیە ئەو کەسانە حاڵەتێکی فیکری و دەروونی و کۆمەڵایەتییان بۆ دروست دەبوو، ئەوەی بیریان لێ نەدەکردەوە کەسابەت و داهات و مسۆگەرکردنی سەرچاوەکانی دارایی بوو. هەندێك کاتیش کۆمەڵگەی حیزبی و ڕێکخستنەکانی ئەو لایەنە و بانگخوازەکان، بە چاوێکی کەمتر لە خۆیان تەماشای ئەو کەسانەیان دەکرد، کە خەریکی کەسابەت بوون، وایان دەزانی کاری ئیسلامی پیشەی ڕۆژ و چەند ڕۆژ، یان چەند ساڵێکە و پاشان تەواو دەبێت، کە ئەم شێوەی کاری حیزبایەتی و ڕێکخستنانە تەنها تایبەت نەبووە بە پارت و ڕێکخستنە ئیسلامییەکانەوە، بەڵکو پارتە چەپ و ناسیۆنالیستەکانیش بە هەمان شێوە ئەندام و کادیر و پێشمەرگەی زۆریان هەبوو، هەندێك لە شاخ و هەندێك لە شار، کە ئەوانیش ماوەی خەریکبوونیان بە پیشە و کەسابەتەوە نەبوو، بەڵام ئەوان، دوای ڕاپەڕین بە حوکمی ئەوەی خاوەن دەسەڵاتی یەکەمی هەرێمی کوردستان بوون، توانیویانە بە ڕێژەیەکی بەرچاو ئەو کەلێنە پڕبکەنەوە، کە خەڵکێکی

زۆریان بە پلە و ئاستی جۆربەجۆری پێشمەرگەی دێرین خانە نیشین کرد، پاشان لە ٢٠٠٤ لە پەرلەمان کرا بە یاسا.[١] ئەوانەی خانەنیشینی نەی گرتنەوە، پلە و پۆستی حکومەتیان پێ دان، بەڵام بانگخوازان و کادیرە ئیسلامییەکان، بەو عەقڵیەتەی پێش ڕاپەڕین و ساڵەکانی نەوەدەکان، جارێکی تر چوونە ململانێی کاری حیزبی و سیاسییەوە، بە شێوەیەکی گشتی عەقڵیەتی قۆناغی کاری نهێنی و نەبوونی ئەزموونی بەڕێوەبردنی پارتی سیاسی، کۆمەڵێك شوێنەواری خراپی لەسەر کار و پڕۆژەی ئیسلامی بەجێهێشت، لەوانە: دوای ئەوەی بەشێکی زۆری ئەو کادیر و بانگخوازانە ئەرکی بەڕێوەبردنی ماڵ و خێزانیان کەوتە سەر شان، ناچار بوون دوای بژێویی ژیانی خۆیان بکەون، یان دەبوو پارتەکانیان ژیانیان بۆ مسۆگەر بکەن، لەبەر ئەوەیش پارتە ئیسلامییەکان سەرچاوەیەکی دارایی جێگیریان نەبوو، ژیانی ئەو بانگخوازانەش وەکو دارایی پارتەکانیان هەمیشە لە هەڵکشان و داکشاندا بووە و حاڵەتێکی جێگیری بەخۆیەوە نەبینیوە. دوای ئەوەی پارتە ئیسلامییەکان لە دەسەڵات نزیك بوونەوە، جارێکی تر خاوەنی پلان و بەرنامە نەبوون کە وەکو باوك و براگەورە، دڵسۆزییان بۆ بەخەرج بدەن و هەوڵی مسۆگەرکردنی پێگەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییان بۆ بدەن، بۆیە ئەوانیش بۆ مسۆگەرکردنی ئایندەی خۆیان و بوونی پێگەیەکی بەهێز

[١] چەند جارێك لە ئاستی باڵای د ەزگای پێشمەرگە دێرینەکانی هەرێمی کوردستان، پێشنیار کرا بوو بۆ کۆمەڵی ئیسلامی، کە ئەوانەی لە پێش ڕاپەڕیندا لە شارەکانی عێراقدا بە نهێنی کاری ڕێکخستنیان کردووە، بۆ ئەوەی وەکو هاوتاکانیان لە ڕێکخستنی لایەنەکانی تر مافیان نەفەوتێ دەتوانن بە شێوەیەکی یاسایی وەکو پێشمەرگەی شار هەوڵی خانەنیشین کردنیان بدەن.

لەنێو پارتەکانیاندا، هەرکەس لـە شـوێنی خۆیانـەوە بـوون بـە مـشوورخۆری خۆیان، لەبەر ئەوەی لەسەر پـلان و بەرنامەیـەکی دارێـژراوی حیزبـی نـەبوو، هەرکەس بۆخۆیان چۆنیان پـێ بـاش بوایـە وایـان دەکـرد. زۆربـەیان کەوتنـە هەڵپەکردن بۆ بەدەستخـستنی پلـە و پۆسـت، کـە ئـەوەش وای کـرد، لـەنێو تەوژمـــە ئیـــسلامییەکاندا، لـــە لایـــەك گلـــەیی و گازانـــدەو نیگـــەرانی و دوورکەوتنەوە و بێزاری دروسـت ببێـت، لـە لایـەکی تریـشەوە ئـەو کـادیر و بانگخوازانــە بەشــێکیان لەلایــەن ئەنــدامان و جــەماوەری پارتەکانیانــەوە، تێبینی و ڕەخنەیان بێتە سەر. خاڵێکی تری نێگـەتیڤی نـەبوونی سەرچـاوەی دارایی دروستبوونی دڵەڕاوکێ و ڕاڕایی ناو پارتە ئیسلامییەکان بـوو کـە بـە هاوشێوەی پارتە چـەپ و ناسیۆنالیـستەکان، دەسـتیان دایـە کـار و پـڕۆژەی سیاسی و کاری حیزبایەتی و کردنەوەی ئۆرگانی بەلێشاو و بڕینەوەی مووچـە بۆ ئەم و ئەو. هەر ئۆرگانێك کۆمەڵێك ئەندامی بۆ خۆی دیاری کـرد کـە بـە مووچـەیەکی مانگانــە بــۆ کــاری ئــەو ئۆرگانــە لێبڕابــوون، جگــە لــەوەش پارتەکانیان کەوتنە هەوڵی پەیـداکردنی سەرچـاوەی دارایـی بـۆ بـەڕێوەبردنی ئۆرگانی زۆر و ئەندامانی لێبڕاو کـە لای ئـەم پـارتی دەسـەڵاتدار و لای ئـەو پارتی دەسەڵاتدار، بۆ دەستەبەرکردنی بودجەی حیزب و بەڕێوەبردنی بـژێویی هەڵسوڕوانی حیزب. پارتە دەسەڵاتدارەکان چییان بۆ ئەندامـەکانیان دەکـرد، لایەنە ئیسلامییەکانیش لە ئاستێکی نزمتردا هـەر یەکـەیان بەشـێوەیەك لـە سنووری دەسەڵا ت و توانای خۆیاندا دووبارەیان دەکردەوە، ئەمـەش وای کـرد باری سەرشانی حیزب گران ببێت، بۆ بەڕێوەبردنی ئەو واقیعـە زۆربـەی کـات سـەرکردایەتییەکانی پارتــە ئیــسلامییەکان، خـەریکی چارەســەری کێــشەی

دارایـــی بـــن، ڕۆژانـــه خـــەریکی وەڵام و وەڵامکـــاری و نامـــه و داواکـــاریی ئۆگانـەکان و ئەندامـەکانیان بـن، کـە بـەرۆکیان پـێ دەگـرتن، یـەکێك بـۆ دامەزراندن، ئەوی تریـان بـۆ خانەنیـشینی، یـەکێکی تـر مووچـەکەی وەکـو مووچەی هاوتاکەی لێ بکرێـت، یـەکێکی تـر داوای گێڕانـەوەی مەسـروفاتی مانگانه دەکات. مسۆگەرنەبوونی سەرچـاوەی پـارە و مـاڵیش، وای کردبـوو بەردەوام سەرکردایەتیی سیاسـی و ئەنـدامـان و کـارگێڕانی ئـەو پارتانـە، لـە دڵەڕاوکێدا بـن. خـۆ پارتێـك هەرچـەند هـەوڵی سـەربەخۆیی سیاسـیی خـۆی دابێت، ناچار بووە هەندێك کات خۆی هەڵاوێرێت لە هەندێك بابەتی سیاسیی گرنگ، کە لەوانەیە هەڵوێست دەربڕین تێیدا ببێتە هۆی نیگـەرانکردنی ئـەو لایەن و هێزەی، لەوانەیە سەرچاوەی دارایی حیزب بخاتە مەترسییەوە. ئەگـەر ئەم حاڵەتە عەیبە بێت بۆ سەر پارتێك، ئـەوە چـەند جـار عەیبەیـە بـۆ سـەر پارتە دەسـەڵاتدارەکان، کـە سـەروەت و سـامانی وڵاتیـان قـۆرخ کـردووە بـۆ مانەوەی خۆیان و بەهێزکردنی پێگەی حیزبەکانیان، لـەو ڕێگەیـەوە ویـژدانی خەڵك دەکـڕن و هـەوڵی وابەسـتەبوونی ئـەم حیـزب و ئـەو حیـزب دەدەن بـە خۆیانـەوە! هەنـدێك کـات هەرچـەند هەنـدێك لایـەن نیگـەرانیش بێـت لـە واقیعێکی ئیداری و سیاسی و بوونی گەندەڵی، بەڵام بە جۆرێك لە جۆرەکان، پارتـــە دەســـەڵاتدارەکان بەشـــێوەیەکی ڕێـــژەیی هـــەموو پارتـــە چاکـــساز و دژەگەندەڵەکانیان لەخۆیانەوەگلاندووە. ئەگەر لە قۆناغێکـدا دەربـاز بـووبن، ئەوە لە پێچێکی تردا تێکـەوتوون. بۆیـە سـەربەخۆیی سیاسـی و هەڵوێـست دەربڕین لەم وڵاتانەدا، وەکو وڵاتێك نییە یاساسـەروەری هـەبێت، کـە پـارتی دەسەڵاتدار و دوور لە دەسەڵات، بە یاسا وەکـو یـەك دانپێـدانراو بـن و هـیچ

لایەنێکیان ماف و ئیمتیازێکی زۆرتریان لە حکومەت و دەسەڵاتدا نەبێت. قۆرخکردنی دەسەڵاتی سیاسی و دارایی، دەسەڵاتێکی دیکتاتۆر و خۆسەپێن دروست دەکات و بە ئاسانی دەستبەرداری دەسەڵاتەکانیان نابن، ئەمانەش وایان کردووە زۆربەی کات پارتە سیاسییەکانی دەرەوەی دەسەڵات لە قەیراندا بژین و هێزەکانی ئۆپۆزسیۆن تووشی شکستی گەورە ببن. بۆیە لە هەموو ئەگەرەکاندا، پارتی سیاسی لەم جۆرە وڵاتانەدا دەبێ بەدوای سەربەخۆیی داراییدا بگەڕێت، کە سەرچاوەی سەربەخۆیی سیاسییە. دارایی ئاوێنەی هەڵوێستی پارتە سیاسییەکانە، بۆیە دەبێ ئەو کەلێنانەی دەسەڵات لێوەی دزە دەکاتە نێو بڕیار و هەڵوێستی سیاسیی پارتەکانەوە، بگیرێن، ئەگەر نا ئەو پارتانە بەردەوام لە نێوان هەڵکشان و داکشان و بەهێزی و لاوازیدا دەمێننەوە، ئەوکاتە ئەو جەماوەرەی بە چەندین هەڵویستی سیاسی و کۆششی کادیرەکانی کۆیان کردوونەتەوە، لە قۆناغێکدا بەهۆی هەڵوێستێکی سیاسی، یان کێشەیەکی دارایی، هەمووی لەدەست دەدەن. سروشتی جەماوەریش وایە، پارتێك دامەزراو نەبێت و لە ڕاڕایی سیاسیدا بژی و هەر ڕۆژەو هەڵوێستێك دەرببڕێت، متمانەیان پێی نامێنێت. بۆیە ئەو بێبایەخییەی لەلایەن بزاڤ و ڕەوتە ئیسلامییەکانەوە دەربارەی ئابووری هەیە، تێڕوانینێکە سەرتاپای پێویستی بە پێداچوونەوە هەیە. ئەوەی تا ئێستا لەسەری ڕۆیشتوون، دەبێ بخرێتە قۆناغەکانی مێژووەوە، سەرلەنوێ بە تێگەیشتنێکی تازە و دونیابینییەکی ترەوە، بە میکانیزمی سەردەمییانە، پەیکەری پارتەکانیان و تێڕوانیان بۆ کاری حیزبی دابڕێژنەوە و لایەنی ئابووری و دارایی خۆیان لەو قاڵبەی پێشوو دەربکەنە دەرەوە. هەرچەند

هەندێك لە بزاڤە ئیسلامییەکان بایەخی باشیان بە لایەنی ئابووری داوە و توانیویانە لەو لایەنەوە هەنگاوی باش بنێن، لەوانە بزووتنەوەی ئیخوانولموسلیمین و هەندێك بزاڤی تر، بەڵام ئەو بزاڤە ئیسلامییانە، هەر یەکەیان لە ڕوویەکەوە پێویستی بە بەخۆداچوونەوە هەیە، بەڵام هەندێك بزووتنەوە و لایەنی تری ئیسلامی، ئەو بایەخەیان نەبووە، بۆیە ئەو لایەنانە جگە لە ڕووەکانی تری پارتەکانیان، دەبێ لەبواری ئابوورییشەوە جارێکی تر بەخۆیاندا بچنەوە.

چەندێك بۆ پێکەوەژیان پێویستمان بە تێگەیشتنی هاوبەش هەیە، بە هەمان شێوە پێویستمان بە تێگەیشتنێکی یەکگرتوو بۆ ڕێککەوتن و دیاریکردنی میکانیزمەکانی کارکردن هەیە. چۆن زۆر جار نەبوونی تێگەیشتنی هاوبەش بۆ پێکەوەژیان، دەبێتە هۆی شکستخواردنی پرۆژەکان و دونیابینیمان، بە هەمان شێوە نەبوونی میکانیزمی لەبار کە وەك یەك تیم پێکەوە گرێمان بدات، دەبێتە هۆی شکست پێهێنانی پرۆژەکانمان و ڕێگەی چوونە پێشەوەمان لیٚ دەگرێت.

میکانیزم لەدایکبووی ئەو تێگەیشتن و ژینگە سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەیە، کە تێیدا گەشە دەکەین، بۆیە هەرچەند میکانیزمەکانمان باش و گونجاو بن، ئەگەر ژینگەکەمان خراپ بوو، ناتوانین هەنگاوی بەرەو پێشەوە بنێین، ئەمە بە پێچەوانەشەوە ڕاستە، هەرچەند ژینگەی پێکەوەژیانمان سازگار بێت، ئەگەر میکانیزمەکان لەبار نەبن، بە هەمان شێوە لەمپەری پێکەوە کارکردن ڕێگەمان پیٚ دەگرێت. دەبیٚ لە میکانیزمەکاندا دوو بنەما ڕەچاو بکەین: بنەمای یەکەم: سادەیی و خۆ بەدوور گرتن لە گرێکوێرەکانی پلەبەندیی حیزبی و ڕێکخراوەیی ئاڵۆز. بنەمای دووەم: دابەشکردنی دەسەڵاتەکان و کۆنەکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لەدەست کەسێك یان ئۆرگانێکدا. بۆیە بۆ پێکەوەژیان، پێویستمان بە میکانیزمی گونجاو هەیە، پێویستمان بە سازانی ژینگەی لەبار هەیە.

## ١. پارت و ڕێکخراوەکان:

پارت و ڕێکخراوە سیاسییەکان، جومگەیەکی سەرەکیی پێکەوەبوونن. لەو ڕێگایەوە خەڵکی لەسەر هزر و قەناعەت و ئایدیا و پڕۆژەی خزمەتگوزاری و چاکسازیی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی کۆدەبنەوە. ئەم ڕێکخراو و پارتانەش، سەرەتایەکن بۆ گەیشتن بە دەسەڵات و چوونە نێو پەرلەمان و دەسەڵات و حکومەتەوە و دەستگرتن بەسەر هەموو جومگە هەستیار و سەرەکییەکانی وڵاتدا.[١] بۆیە پارت و ڕێکخراوەکان، سەرەتا و بنچینەی هەنگاوی یەکەمی پێکەوە کارکردنن. ئەگەر هەنگاوی یەکەم بە تەندروست و سەرکەوتوویی ئەنجام درا، ئەوکاتە هەنگاوەکانی تریش بە سەرکەوتووی ئەنجام دەدرێت، ئەگەر لە قۆناغی یەکەمی حیزبی و ڕێکخراوەیی، بە چەوتی ملی ڕێگەی نا و لاری و گەندەڵیی تێکەوت، ئەوە بە دڵنیاییەوە لە قۆناغەکانی تری بەڕێوەبردن و جومگەکانی دەسەڵاتدا، سەلامەت نابێت، وەکو کۆشکێك هەرچەند دیکۆری جوان بێت، کە بنچینەکەی قایم و توندوتۆڵ نەبوو، لەباتیی مانەوە و تەمەندرێژی، چاوەڕوانی ڕووخانی لێ دەکرێت. بۆیە لەم بابەتەدا، ئەوەندەی باس لە خاڵە نەرێنییەکانی پارتەکان دەکەین، ئەوەندە باس لە خاڵە ئەرێنییەکانیان و کاری حیزبایەتی ناکەین.

---

[١] کورد و پارتە سیاسییەکانی عێراق، حەسەن بارام، چاپی، ٢٠١١، ل: ١٥.

## أ- پەیکەری پارتەکان:

- مۆدێلی کۆمۆنیستی: هەر لە سەرهەڵدانی بیری کۆمۆنیستی و دوای ئەوەی دەگەیشتنە دەسەڵات، کەسی یەکەم لە یەك کاتدا سەرۆکی دەوڵەت و سەرۆکی حیزبیش بووە. لە یەکێتیی سۆڤیەتدا، لە کاتی سەرۆکایەتیی ستالیندا، کەسی یەکەم و نزیکەی ١٤ ئەندامێکی (م. س)، وڵات و حیزبیشیان بەڕێوە دەبرد.[١] تەنها ئەو پارتە سەرچاوەی هەموو ڕێنموونی و بڕیارێکی سیاسی و ئیداریی وڵات بوو، ڕێگە بە بوونی هیچ پارت و هێزێکی تری سیاسی نەدەدرا و بوون بە سەرچاوەی بیرۆکەی تۆقاندنی سیاسی.[٢] دەبوو هەموو خەڵك لە ڕیزەکانی ڕێکخستنندا بن، یان دژ نەبن. ژمارەی ئەندامی حیزب لە یەکێتیی سۆڤیەتدا، تا کۆتایی حەفتاکان گەیشتە زیاتر لە ١٧ ملیۆن ئەندام، کە ٤٢٪ی چینی کرێکار بوون.[٣] یەك لەسەر چواریان لێبڕاو بوون بۆ بەڕێوەبردنی حیزب. لەبەرئەوەی هەموو ئۆرگانەکان بە شێوەیەکی مەرکەزی پێکەوە گرێ درابوون، دەبوو ئۆرگانەکان و ئەندامان لە سەر تا خوار، چاوەڕوانی بڕیار و ڕێنماییەکانی حیزب بکەن. بەهۆی تۆکمەیی سیستمی پەروەردە و پێگەیاندن و باسکردنی ژیری و حیکمەتی سەرکردایەتی، متمانەیەکی تەواو بە سەرکردایەتی هەبووە و ڕێگەی ڕەخنە گرتن زۆر بەرتەسك بووە. زۆر جار وا وەڵامی ڕەخنەگران دراوەتەوە: ئەوەی تۆ دەیڵێیت سەرکردایەتی دەزانێت!

---

[١] موسوعة السیاسة، عبدالوهاب الكیالی، ٢/ ٤١٩ـ ٤٢٠.

[٢] موسوعة السیاسة، عبدالوهاب کەیالی وئەوانی تر، ٢/٤١٦.

[٣] موسوعة السیاسة، عبدالوهاب کەیالی، ٢/ ٤٢٣.

سروشتی پارتی مەرکەزی ئەوەیە: پارتێکی داخراوە، مەرکەزیەتی لە ڕادەبەدەری هەیە، ڕێگە نادات هیچ جۆرە ئۆپۆزسیۆنێك هەبێت، نەیارە سیاسییەکانی سەرکوت دەکات.[1] لە هەمان کاتدا بە بۆچوونی پارتە مەرکەزییەکان، سەردەمی ڕژێمە داپلۆسێنەرەکاندا هەندێك پاساوی پۆزەتیڤیشی هەبووە، لەوانە: پرۆسەی گەشەپێدان و بەرزکردنەوەی هێز و تواناکانی کۆمەڵگە، پاراستنی یەکێتیی نیشتمانیی وڵات، ڕێگریکردن لە پەرتبوونی وڵات، هەبوونی ئارامیی سیاسی و دژایەتیکردنی داگیرکەر، بوونی ژینگەی کۆمەڵایەتیی لەبار و ڕێگەنەدان بە فرەحیزبی،[2] پاراستنی نهێنییەکان و بە ئاسانی دابەزاندنی بڕیارەکانی سەرکردایەتی بۆ خوارووی خۆیان، ڕێگری لە خروقاتی ڕێکخستن و خروقاتی فیکری. پارتی هەرەمی هەموو گۆڕانکارییەك بە مەترسی بۆ سەر حیزب دەزانێت و بە هیچ شێوەیەك سەرکردایەتی خۆی لە قەرەی نادات. لە ئەدەبیاتی پڕۆسەی حیزبایەتیدا، حیزب ئامرازە نەك ئامانج، هەموو ماندووبوون و قوربانییەکان لەپێناو بەدیهێنانی ئەو ئامانجانەدایە کە پارتەکەی لەپێناودا دروست کراوە. هەر کات تێکگیران لە نێوان ئامانجەکان و بەرژەوەندیی پارت و ئەندامانەدا دروست بوو، لەو کاتەدا چەسپاندنی ئامانجەکان لە سەروو هەموو بەرژەوەندی و ئامرازەکانەوە دەبێت. بەڵام لە حیزبی هەرەمیدا زۆر جار حیزب و بەرژەوەندیی بەشێك لە ئەندامە باڵاکان دەبن بە ئامانج و هەموو قوربانییەك لەو پێناوەدا دەدرێت، لە کاتێکدا ئەگەر دوو هەڵبژاردە بخرێتە بەردەم

---

[1] پارتە سیاسییەکان و ڕای گشتی، ڕێبوار کەریم محمود، ل: ٩٤ ـ ٩٥.

[2] سەرچاوەی پێشو، ل: ٩٦.

سەرکردایەتیی حیزبێکی هەرەمی: یەکێکیان ئەنجامدانی گۆڕانکاری، ئەویتریان مانەوە لەو چوارچێوەیەی کە هەیە. بە دڵنیاییەوە پارتی هەرەمی، ئەگەری دووەم هەڵدەبژێرێت، ئەویش لەبەر ئەو مەترسییانەی لەبەردەم پارتی هەرەمیدا هەیە. پارتی هەرەمی، لە هەموو گۆڕانکارییەکدا لە چەند مەترسییەك خۆی لادەدات، بۆ نموونە دەبێ پێگەی کەسی یەکەم پارێزراو بێت. ئەگەر بنەماڵە کارکتەرێکی بەهێز بوون لەناو پارتەکەدا، دەبێ ئەوانیش پێگەیان پارێزراو بێت. بەشێك لە ئەندامانی سەرکردایەتی دەبێ حیساب بۆ خۆیان و ئەجینداکانیان بکرێت و نابێ بەرژەوەندیی ئەو جەمسەرانەش بکەوێتە مەترسییەوە. ئەو پەیوەندییە سیاسی و دیبلۆماسییانەی کە پێشتر کراوە و سەرچاوە داراییەکانی کە هەبووە، نابێ نادیدە بگیرێن. هەموو ئەمانە و چەندین خاڵی تریش، ڕێگرن لە ئەنجامدانی گۆڕانکاری، چونکە وەکو ئاماژەمان پێ کرد، لە پارتی هەرەمیدا جگە لە خودی پارتەکە، دەبێ ئەنجامەکان بە ویستی سەرکردایەتی بێت، لە هەمان کاتیشدا دەبێ گرەنتیی گۆڕانکاری نەکردن لەو جەمسەرانەدا هەبێت، ئەو کاتە ئامادەن هەندێك گۆڕانکاری بکەن!

- **پەیکەری هەرەمی:**

جیهانی ئیسلامی نزیکەی سەد ساڵە میکانیزمی کاروباری حیزبایەتی و ڕێکخراویی و بەڕێوەبردنی دەوڵەتیان، بە میکانیزمەکانی بەڕێوەبردنی پارت و دەوڵەتانی ئەوروپای ڕۆژهەڵات بەڕێوە بردووە، ئێستاش بەشێکی بەرچاوی جیهانی ئیسلامی لە بواری تەکنۆلۆژیادا، خاوەنی هیچ بەرهەمێکی خۆی

نییە، هەر لە دەرزییەکەوە تـا کەشـتییەك، هـاوردەکراوی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا و ئاسیای ناوەڕاستە. بە هەمان شێوە جیهانی ئیسلامی لە بـواری میکـانیزم و سیـستمی بەڕێوەبردنـدا، خـاوەنی پرۆژەیـەکی زادەی خـۆی نییـە، بـەڵکو لـە ماوەی سەدەی ڕابوردوودا، ئەو شێواز و سیستمانە کاریان پێ کـراوە کـە لـە وڵاتانی ئەوروپادا کراون بە مۆدێلی حوکمڕانی، پاشان وردە وردە لە جیهـانی ئیسلامیدا جێگەی خۆیان کردووەتەوە و کاریان لەسەر کـراوە. بـۆ نمونـە: لـە ساڵی ١٩٢٥ تا بـەهاری عـەرەبی لـە سـاڵی ١٩١٢، بـە شـێوەی مـەرکـەزی لەسەر یەك سیستمی تـاکحیزبیی هـەرەمی، مـۆدێلی حـوکمڕانیی یـەکێتیی سۆڤیەت، لە ئەوروپای ڕۆژهەڵات و بەشێکی بـەرفراوانی جیهـانی ئیـسلامی بــەڕێوە بــراوە، هەرچــەند دوای ڕووخــانی بلــۆکی ڕۆژهــەڵات و سیــستمی سۆسیالیستی لە ١٩٩١، پارتە چەپەکانی ڕۆژهـەڵات لەگـەڵ پارتـە سۆشـیال دیموکراتــــەکانی ڕۆژئــــاوادا، پەیوەنــــدییان هــــەبوو و لــــە چوارچــــێوەی ئەنتەرناسیۆنالدا خۆیان بینییەوە، بەڵام ئەم پەیوەندییانە زیاتر پەیوەندییەکی ئایدۆلۆژی بوو و مەعنەویەتێکیش بوو بۆ ئەو پارتانە، بـەڵام نـەیانتوانی لـە کاتی چوونە دەسەڵاتیان لە سیستمی بەڕێوەبردنی پارتە تاکڕەوەکان لابـدەن و ســـوود لــــە سیــــستمی حــــوکمڕانیی دیموکراســـیی ڕۆژئـــاوا وەربگـــرن و دەستاودەســتکردنی دەســەڵات پیــادە بکــەن، ئەمــەش بەڵگــەی ئەوەیــە: میکانیزمی دەوڵەتداری، هەندێك بیردۆزە و بابەتی خەیاڵی نییـە، هەرکـەس حەز بکات بـەگوێرەی مەبەسـت و قەناعەتـەکانی خـۆی دایبڕێـژێت، چـونکە سیستمی حوکمڕانی ئەزموونـە، نـەك قـاڵبێکی داڕێـژراو هـەرکات ویـستت، بچیتەوە سەری. ئەزموونی حوکمڕانیی ئیسلامیش، دوای ئەزموونی خەلیفـە

ڕاشیدەکان، تەواو بوو. ئەو شێوە حوکمڕانییـەی دوای ئـەوان لـە سـەردەمی: ئومەوییــەکان و عەباســییەکان و عوسمانییــەکان، پیــادە کــراوە، شــێوەی حــوکمڕانیی میراتــی و کودەتــا و پاشــایەتییە، پەیوەنــدیی بــە سیــستمی حـوکمڕانیی ئیـسلامەوە نییـە، بـەڵام هەنـدێ کـات هەڵکـەوتووە لـەو سـێ سەردەمەدا، کەسانی چاك و خواناس و دادپەروەر پەیدا بوون، لە چوارچێوەی بنــەما و ئاکــارە ئیــسلامییە بەرزەکانــدا، بــە شــێوەیەکی دادگەرانــە فــەرمانڕەواییان کــردووە و بەختــەوەرییان بــۆ خــەڵك پــێ بــووە، جیهــانی ئیــسلامیش لــە ســایەیدا حەســاوەتەوە، بــەڵام دوای نــەمانی دەســەڵاتی ئیسلامی، لە ماوەی ئەم سەد ساڵەی ڕابوردوودا، سیاسەتمەداران و بیرمەندان و پارت و ڕێکخراوەکانی جیهانی ئیسلامی، لەسەر میکـانیزمی حـوکمڕانیی ئــەوروپای ڕۆژهــەڵات بــەڕێوە بــراون، هەرچــەند ئــەو سیــستمە: خراپتــرین سیــستمی حــوکمڕانی بــووە، ســەرکردە و پــارتی دیکتــاتۆر و خۆســەپێنی بەرهەمهێناوە، کە جێگەی خۆیـەتی سـوود لـە هەڵـەکانی ببینرێـت و ڕێگـە نەدرێت ئەو جۆرە سیستمانە لە حوکمڕانیی هـیچ وڵاتێکـدا، جـارێکی دیکـە دونیــای ڕوون نەبینێتــەوە. ئیــستاش دوای نــەمانی بلــۆکی ڕۆژهــەڵات و هاتنەکایەی سیستمی دیموکراسی، چۆن بە بـێ مـشتومڕ جیهـانی ئیـسلامی لەســەر سیــستمی حــوکمڕانیی ڕۆژهــەڵات ڕۆیــشتووە، هەرچــەند سیــستمی حـوکمڕانیی دیموکراسـی، لەگـەڵ سیـستمەکانی حـوکمڕانیی سۆسیالیـستی و دیکتاتۆری و پاشایەتی بەراورد ناکرێت، تا ئێـستا باشـترین بەرهـەمی بـیری مرۆڤایەتییە و لە هەموو سیستمەکانی تری حوکمڕانی لـە ئیـسلام نـزیکترە. بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی، شارستانیەتەکان سوودیان لە یەکتر بینیـوە و

تەواوکـەری یـەکتر بـوون. شارسـتانیەتی ڕۆژئـاوا لـە ڕێگـەی ئەنـدەلوس و قوتابخانەی هاوشێوەی تولەیتیلە و هاتنی خاچپەرستان و سەرسامبوونیان بـە جیهانی ئیسلامی، زۆر بەهرەمەند بوون، هەر وەکو ئەرنۆڵد تویێنبی[1] دەڵێت: لە جەنگی خاچپەرستاندا ئیسلامی ژێردەستە و بارکـەوتو تێکـشکێنەرەکانی بەدیل گرت، هەموو هونەرەکانی خۆی خستە جیهانی مەسیحییەکانەوە و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، ئیسلام بە ڕەگ و ڕیـشەی جیهـانی مەسـیحیدا چـووە خـوارەوە.[2] تـا جـارێکی تـر دەسـەڵات دەکەوێتـەوە جیهـانی ئیـسلامی و شارەزایان و بیرمەندانی جیهانی ئیسلامی لە چوارچێوەی ئـەزمونی گـەلان و بنەما و ئاکارە بەرزەکانی ئیسلامدا، سیـستمێکی نـوێی حـوکمڕانی بەرهـەم دەهێنن، جێگەی خۆیەتی جیهانی ئیسلامی بـە پـارت و ڕێکخراوەکانیـەوە، کەڵك لە سیستمی حوکمڕانیی دیموکراسی ببینێت. ئێـستا خەریکـە قۆنـاغی سیـستمی تـاکحیزبیی داپڵۆسـێنەر بـەرەو لەناوچـوون دەڕوات، سیـستمی دیموکراسی و ئـازادیی ڕادەربـڕین و جیهانگـەرایی جێگـەی دەگرێتـەوە. لـەم گۆڕانکارییانەدا پێویستە جارێکی تر، پێداچوونەوە بەو پلەبەندی و پەیکـەرە حیزبایەتییانەدا بکرێتەوە، کە سەرکردایەتی لە خـەڵك دوور دەخەنـەوە، ئـەو میکانیزمانە لە جێگەیان دابنرێت کە میللەت دەکات بـە چـەقی بڕیـاردان و گەڕانەوەی شکۆیە بۆ تاك و کۆمەڵگا.

---

[1]. مێژونووسێکی هاوچەرخی بەریتانییە، خاوەنی کتێبێکی ١٢ بەرگییە کە لە ١٩٦١ لە نووسینی بووەتەوە

[2]قالوا عن الاسلام، ئامادەکردنی: د. عیمادە دین خەلیل، چاپی یەکەم:١٩٩٢، ل:٣٤٣ـ٣٥٠ـ٣٥٧.

### ب-    وەرگرتنی شەرعیەت لە جەماوەرەوە بێت:

پارتە سیاسییەکان قوتابخانەی فەلسەفیی بژاردەیەك نین کە گوتارەکانیان بۆ چینێکی تایبەت بێت و پێویستیان بە خەڵکی گشتی نەبێت، تا لە بیردۆزە و ئایدیا فەلسەفییەکانیان تێ بگات، وە پلەبەندیی زۆر لە پەیکەری هەرەمی پارتی سیاسیدا بۆ پاراستن و ئاسایشی ئەندامانی سەر بە ڕێکخستنەکانی پارتەکەیە، ئەو بیانووەش دوای نەمانی زۆربەی دەسەڵاتە خۆسەپێن و تۆقێنەرەکان، پاساوی نەما. بۆیە لێرەوە دەچینە نێو مەبەستەکەمانەوە، کە پێویستە پارتە سیاسی و ڕێکخراوەکان پێداچوونەوەیەکی توندوتۆڵ بە پەیکەری ڕێکخستنەکانی خۆیاندا بکەنەوە، ئەویش بەو شێوەیە دەبێت، ئەو پەیکەرە هەرەمییەکەی ئێستا کاری تێدا دەکرێت، کە کەسی یەکەم هەیە و لە هەندێك پارتدا جێگرێك یان چەند جێگرێکی هەیە، پاشان ئەنجوومەنی م.س و ئەنجوومەنی سەرکردایەتی و مەکتەب و ئۆرگانەکان، پاشان کۆکردنەوەی هەموو ڕێکخستنەکان لە مەکتەبێکدا بە ناوی مەکتەبی ڕێکخستنەوە، لە هەندێك پارتدا لە خوار مەکتەب ڕێکخستنەوە هەندێك ئاستی تری وەکو: ناوچە و پۆل و شانە هەن، کە ئەم هەموو پلە و ئاستانە، جگە لەوەی شتێکی کردەیی نین، تەنها لەسەر کاغەز و لە پەیڕەو و پرۆگرامە کۆنەکاندا ماوە، چونکە ئەم پلانە خزمەت بە ئەندام ناکات و ماندووبوونی نانرخێنرێت. بۆ نموونە چەندین کەس بەبێ بڕینی ئەو پلە و ئاستانە دەدات بە لای برایانی ڕێکخستنەکاندا، یەکێك دەبێت بە پەرلەمانتار، یەکێك دەبێت بە وەزیر، یەکێکی تر دەبێتە بەڕێوەبەری گشتی، هەندێکی تریش دەبن بە قایمقام و بەڕێوەبەری ناحیە، لە هەمان کاتدا ئەو خەڵکەی خوارەوەش بیر

دەکەنەوە بەم هەموو پلەکانێیەدا چۆن سەرکەونە سەرەوە! خۆ ئەگەر خەڵکی جامانەبەسەر و عامەی خەڵك لە خوارەوە تەماشای ئەو بورجە بەرزە بکەن، جامانەکەیان لەسەر دەکەوێتە خوارەوە! بۆیە ئەم جۆرە پەیکەرە جێگەی ئەو چینانەی تێدا نابێتەوە، ئەوانەش کەوا نوخبەن و ئاستێکی فیکری و ڕۆشەنبیری و زانستیی بەرزیان هەیە، بە زمانیش نەیڵێن، بە کردەوە بەو پارتانە دەڵێن: ئەو زانیارییانەی بە پێنج شەش پلە دەگات بە ئێمە، خۆم لە پێش سەرکردایەتی و پلەباڵاکانەوە، لە سایت و پێگە ئەلیکترۆنییەکانەوە ڕاستەوخۆ وەری دەگرم، بۆیە ئەم پەیکەرە نە بەکەڵکی خەڵکی گشتی ماوە، نە بەکەڵکی خەڵکی ڕۆشنبیر و نوخبە ماوە، هیچ ئامانجێکی تێگەیاندن، یان پاراستنی ئەمنیی ڕێکخستنەکانیش ناپێکێت، ئیتر پێم ناڵێن ئەم پەیکەرە دوور و درێژە بۆچی باشە؟! بۆیە دەبێ پەیکەری پارتەکان لەگەڵ ئامانجەکانیاندا یەکبگرێتەوە، کە ئەوان ئێستا گوتاری جەماوەرییان هەیە و خەڵك هان دەدەن بۆ سەر سندووقەکانی دەنگدان، دەبێ سەرکردە و ڕۆشنبیران و شارەزایانی پارتە سیاسییەکان هەموو ئەو پلانە جێ بهێڵن و ڕاستەوخۆ خەڵکی بدوێنن و گوێیان لێ بگرن و لە پەرلەمان و حکومەت کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکەن.

## ٢. پرۆژەی هاوبەشی ئیسلامی و عەلمانی

### أ- کۆبوونەوە لە پرۆژەیەکدا یان لە پارتێکدا؟

لە ئێستادا هەرێمی کوردستان ماوەیەتی بگاتە ئەو ئاستەی خاوەنی هەموو ئایدیۆلۆژیا و قەناعەتە جیاوازەکان لەسەر بنەمای چاکسازی و خزمەتکردن و پرۆژەی نەتەوەیی و نیشتمانی، پێکەوە لە پارتێکدا کۆببنەوە. مەرج نییە تەنها گردبوونەوە لە پارتێکدا، نیشانەی لێکتێگەیشتن و یەکتر قبوولکردن بێت، بە بەڵگەی ئەوەی جاری وا هەیە ئەوانەی لە پارتێکدان زۆر جار خاڵی هاوبەشی زۆریان هەیە، بەڵام پێکەوە ناتوانن درێژە بە کارەکانیان بدەن و لێك جیا دەبنەوە، بەڵام دەکرێت وەکو هەنگاوی یەکەم، لەسەر چەندین پرۆژەی نیشتمانی و خزمەتگوزاری و چاکسازی و دژەگەندەڵی و چۆنیەتی بەرەو پێش بردنی دۆزی ڕەوای گەل، هەڵوێستەکانیان یەکبخەن و ڕاگەیاندنەکانیان کاری لەسەر بکەن، پێکەوە لە کۆمیتە و ئەنجوومەنە جۆراوجۆرەکاندا ڕەنگی بۆ برێژین و پلانی هاوبەشیان هەبێت. ئەم هەنگاوە لەم قۆناغەدا دەنگدانەوەی گەورەی دەبێت و دەبێتە سەرەتایەکیش بۆ گفتوگۆی ئیسلامی و عەلمانی، کە ئەمڕۆ لە وڵاتانی عەرەبییشدا هەنگاوی بۆ نراوە. هەر لەساڵی ١٩٩٤وە لە وڵاتانی عەرەبیدا ناوبەناو کۆنگرەی لەسەر گیراوە.[١] لە ١٠/٤/ ٢٠١٦دا لە سلێمانی، ڕێکخراوی دابڕان دیبەیتێکی لە نێوان بەڕێزان: م. عەلی باپیر و کاك مەلا بەختیاردا ساز کرد، هەنگاوێکی باش بوو و توانیی تا ئەندازەیەك هەندێك بەستەڵەکی نێوان ئیسلامی و عەلمانی بتوێنێتەوە، هەرچەند بە ڕای ئێمە دەبوو ڕێکخەرانی

---

[١] الفکرالاسلامی، قرائات ومراجعات، زکی میلاد، چاپی: ٢٠١٢، ل:٧٢.

دیبەیتەکە، ناونیشانی لێکتێگەیشتن و کاری هاوبەشیان بدایە بە دیبەیتەکە، دیبەیتەکە بە کۆمەڵێك پێشنیاز و ڕاسپاردە کە بکرێتە ئەجیندای کاری هاوبەشی نێوان ئیسلامی و عەلمانی، کۆتایی بە کارەکانی بهێنایە، هیچ لایەکیان نەڕۆیشتنایەتە نێو هەڵوێست دەربڕین و خوێندنەوەی ئایدۆلۆژی و مێژوویی بۆ پەیوەندیی نێوان ئیسلام و عەلمانی، کە ئەو خوێندنەوانە، جگە لەوەی ئەنجامی زۆر کەمی دەبێت، نابێتە هەنگاوێکیش بۆ لێك نزیکبوونەوە و بنیاتنانی پرۆژەی کاری هاوبەش.[1] کە ئەگەر ئەو چوارچێوەیە دەوڵەمەندتر بکرایە و هەردوو لایان لەو چوارچێوەیەدا پرۆژەیەکی هاوبەشیان پێشکەش بکردایە، کە ئەجیندای کاریان لە هەرێمی کوردستاندا بەو شێوەیە بێت، ئەوە خزمەتێکی بەرچاوی بە ئێستای هەرێمی کوردستان دەکرد.

ب- **لایەنە ئیسلامی و عەلمانییەکان لە هەرێمی کوردستاندا وەکو دوو تەوژم بوونیان هەیە**، لێرەدا باس لە ئایدیۆلۆژیا و هەڵسەنگاندنی ئایدۆلۆژی ناکەین، ئەو بابەتە قسەی زۆری لەسەر کراوە و بەردەوامیش دەبێ قسەی لەسەر بکرێت، بەڵام لێرەدا قسە لەسەر کار و پرۆژەی هاوبەش دەکەین: ئایا دەکرێت ئەم دوو تەوژمە، کار و پرۆژە و بەڕێوەبردنی حکومەت و سیاسەتکردنیان پێکەوە هەبێت؟ یان تەنها لەگەڵ ئەو لایەنانەدا کاریان پێ دەکرێت کە هەڵگری یەك ئایدیۆلۆژیا و یەك قەناعەتن؟ هەرچەندە لایەنە ئیسلامی و عەلمانییەکانی کوردستان هەنگاوی باشیان لەو بوارەدا ناوە، بەڵام

[1] کتێبی تەوەژمی ئیسلامی و عەلمانی، خاڵە هاوبەش وجیاوازەکان، علی باپیر، چاپی یەکەم ٢٠٠٨، لەلاپەڕە ٢١٣ دا بابەتێکیان بەناوی: خاڵە لەیەکچووەکانی ئیسلام وسیکۆلاریزم دا یە، وەلەلاپەڕە:٢٩٥ ئاڵقەی حەوتەم لەبارەی تەبایی وپێکەوە ژیانەوەیە. لەوێدا باسی هەندێك خاڵی هاوبەش و پێکەوەژیانی کردووە، کە ئەکرا دیبەیتەکە لەسەر ئەو ڕێڕەوبرۆیشتایە .

ئەوەی گرنگە دەبێ لەوێوە دەست پێ بکەن کە وەکو دوو تەوژمی بەدیل تەماشای یەکتر نەکەن، کە بوونی لایەکیان یەکسان بێت بە نەبوونی ئەویتریان، بەڵکو وەکو دوو هێز بیر لە پرۆژەی هاوبەش و دونیابینیی سیاسیی هاوبەش بکەنەوە. لە ئاستی باڵاداشدا خۆیان لە هەندێك هەڵوێست و گوتار بپارێزن کە هەستیاری دروست دەکات و زەرەر لە پرۆژەی پێکەوەبوون دەدات. هەروەها هەموو ململانێ فیکری و ئایدۆلۆژییەکان جێبهێڵن بۆ سەنتەر و ڕێکخراوە مەدەنییەکان، با ئەوان زیاتر سەرقاڵی ئەو مەیدانە بن، پانتایی قبوولکردنی کار و پرۆژەی هاوبەش لە ئاستی نوخبەی سەرکردایەتییەوە بگوازرێتەوە بۆ ئاستی کادیر و خەڵکە پەیوەندیدارەکان.

**ت- بەکارهێنانی دەستەواژە و چەمکی هاوبەش**

لایەنە ئیسلامی و لایەنە عەلمانییەکان، دوو هێز و تەوژمی خاوەن ئایدیۆلۆژیا و دونیابینی جیاوازن، لە هەمان کاتدا هەردوو لایان پانتاییەکی بەرفراوانی جیهانی ئیسلامییان گرتووە. لایەنە ئیسلامییەکان، وەکو ئایین و بیروباوەڕ و سیاسەت و کەلتوور و فیکر، لایەنە عەلمانییەکان وەکو هێز و سیاسەت و چەمکی ناسیۆنالیستی، هەردوو لایان پێویستیان بە بەکارهێنانی هەندێك وشە و زاراوە و پێداچوونەوەی هەندێك چەمکی هاوبەش هەیە، تاوەکو ئەو هەنگاوە سەرەتایەك بێت بۆ گەیشتن بە پرۆژەی هاوبەشی نێوان هەردوو لایان. دەبێ هەردوو لایەنی ئیسلامی و عەلمانی، پێداچوونەوە بە هەندێ چەمك و زاراوەدا بکەن، بۆ ئەوەی سەرەتایەك بێت بۆ گفتوگۆ و لێکتێگەیشتن و یەکتر قەبولکردن، هەنگاوێکیش بێت بۆ دانانی بناغەی پرۆژەی کاری هاوبەش.

## یەكەم: ئەركی لایەنە ئیسلامییەكان:

### ١. پۆلێنكردنی پارت و تەوژمە عەلمانییەكان:

ئێستا دوو تەوژمی عەلمانی هەیە: تەوژمێكیان تێڕوانینێكی گشتگیری بۆ ئیسلام هەیە، كە هەموو چەمكە ئیسلامییەكانیانی لەلا ڕەفزە كە زیاتر دەچنە خانەی هەڵگری بیری ماركسی و دژە دینەوە. بەهۆی سەرسەختیی ئەم تەوژمە و هەڵوێست و تێڕوانینە نێگەتیڤەكانیان بەرانبەر بە ئیسلام، لەنێو نووسەران و ڕۆشنبیرە ئیسلامییەكانیشدا هەندێك ڕایان وایە كە گفتوگۆ و لێك نزیكبوونەوەی ئیسلامی و عەلمانی، بەشێكە لە خەیاڵ و لەسەر ئەرزی واقیع بوونی نییە، چونكە دەڵێن عەلمانییەكان بەبێ هەڵاواردن، ئەو خوێندنەوەیە بۆ ئیسلام دەكەن كە ئەوروپا بۆ كەنیسە كردوویەتی، لە كاتێكدا لە ئیسلامدا حوكمی كەنیسە نییە، دەسەڵاتی پیاوانی ئایینی نییە.[1] ئیسلام پێش هەموو ئایدۆلۆژییەكانی تر، لە ڕووی ستەم و زۆردا وەستاوەتەوە، بۆیە قیاسی ئیسلام لەسەر مەسیحیەت، قیاسێكی ناڕێكە و هیچ لە جێگەی خۆیدا نییە. ئەو هەموو پێداگیرییەی هەندێك لە چەپەكان لەسەر دژایەتیكردنی ئیسلام، یەكێكە لە هۆكارەكانی شكستخواردنی هێز و تەوژمە عەلمانییەكانی جیهانی ئیسلامی، كە لە ئەنجامدا بەهۆی هەڵەكانیانەوە، لە ڕووی مومارەسە و ئایدیۆلۆژیاوە لە جیهانی ئیسلامیدا شكستیان هێنا،[2] ئەم خاڵە بە یەكێك لە جیاوازییەكانی عەلمانیی ئەوروپا و

[1] حوارالاسلام والعلمانیة، د. عوسمان علی، ل: ٣٦٠.

[2] شۆڕشەكانی بەهاری عەرەبی، كە دژ بە بانگەشەكارانی عەلمانیەت كرا، باشترین بەڵگەیە.

عەلمانییەکانی جیهانی ئیسلامی ئەژمار دەکرێت. جیاوازیی دووەمی نێوان عەلمانیەتی ئەورووپا و جیهانی ئیسلامی، ئەوەیە: عەلمانیەت لە ئەورووپا بە شێوەیەکی سروشتی و خۆڕسك دوای ڕاپەڕینێکی جەماوەری لە دایك بوو، کە گەلانی ئەورووپا بەهۆیەوە لە کۆت و بەندی کەنیسە و دەرەبەگایەتی و پاشایەتی ڕزگاریان بوو، هیچ بەراوردێك لە نێوان گەلانی جیهانی ئیسلامی و گەلانی ڕۆژئاوادا نییە، چونکە لە جیهانی ئیسلامیدا دامودەزگا ئایینییەکان، نەك هیچ دەسەڵاتێکیان نییە، بەڵکو لە بێدەسەڵاتیان کراون بە بەشێك لە دامودەزگای دەسەڵاتە عەلمانییەکان و بۆ مەبەستی سیاسیی خۆیان بەکاریان دێنن، بۆیە پارت و تەوژمە عەلمانییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا، لەباتی دەست خستنە سەر برینەکان و سارێژکردنیان، بە وەستانیان دژ بە عەقیدە و بیروباوەڕی مسوڵمانان، برینەکانیان زیاتر قووڵ کردەوە.[1] لە هەمان کاتدا تەوژمێکی تری عەلمانی هەیە، بە شێوەیەکی جوزئی مامەڵە لەگەڵ ئیسلامدا دەکەن. جگە لە لایەنی سیاسی و حوکمڕانیی ئیسلامی، دژایەتیی چەمکە ئیسلامییەکانی تر ناکەن. ئامادەی هەموو هاوکاری و کار پێکەوەکردنێکن لەگەڵ تەوژم و لایەنە ئیسلامییە میانڕەوەکاندا، قەناعەتیان وایە سەرهەڵدانی لایەنە ئیسلامییەکان، حاڵەتێکە پێویستە بە شێوەی پۆزەتیڤ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت. بۆیە نابێ لە یەك گۆشەوە، ئەو دوو لایەنە عەلمانییە وەکو یەك تەماشا بکرێن. دەبێ هەڵگرانی بیری تەوژمی ئیسلامی، بەبێ جیاوازی لەگەڵ هەردوو باڵەکەدا

[1] حوارالاسلام والعلمانية، د. عوسمان علی، ل: ٥٩٠.

گفتوگۆ بکەن، ئەگەر لەگەڵ لایەنێکیان بۆ نموونە ١٠ خاڵی هاوبەش هەبێت، ئەوە لەگەڵ لایەنەکەی تریشدا چەند خاڵێکی تری هاوبەش هەیە کە کاری لەسەر بکرێت. دەبێ لایەنە ئیسلامییەکان، لە هەڵسوکەوت و مامەڵەیان لەگەڵ دەوروبەر، جیاوازی لە نێوان: دووان و ئەحکام و ڕێنماییەکانی خوای باڵادەست بۆ کاروبار و ژیانی دونیایی مرۆڤەکان، لەگەڵ دووان و ئەحکام و ڕێنماییەکانی خوای باڵادەس بۆ قیامەتی مرۆڤەکان بکەن، چونکە مەرج نییە ئەوەی بەکەڵکی قیامەت نەهات، بەکەڵکی دونیاش نەیەت. نابێ ئێمە سیستمی قیامەت کە خوا چۆن مامەڵە لەگەڵ مرۆڤەکان دەکات، بگوازینەوە بۆ دونیا، ئەوەی خوای باڵادەست بەرانبەر خەڵکی بێباوەڕ بۆ قیامەتی هەڵگرتووە، ئێمە پێشی بخەین و لە کاروباری دونیادا لەگەڵ خەڵکی دوور لە دین، ئیشی لەسەر بکەین. بەڵام ئەوەی ئێمە دەیڵێین و داوای دەکەین، لێکتێگەیشتن و پرۆژەی کاری هاوبەشە، چونکە بڕینی هەموو ڕێگەیەکی دوور، بە هەنگاوێك دەست پێ دەکات.

جیهانی بیردۆزە و واقیع، دوو شتی لێك جودان. مامەڵەی عەلمانی لە ڕووی تیۆرییەوە جودایە لەگەڵ تەوژمێکدا کە ڕۆژانە پێکەوە دەژین و پێکەوە هەڵسوکەوت دەکەن. پێکهاتەی ئیسلامی و عەلمانی، حاڵەتێکە پێکەوە لەسەر خاکێك دەژین، لە یەك وڵاتدان و یەك چارەنووسیان هەیە. هەموومان لە کەشتییەکداین، ئەگەر کەشتییەکە کون بێت، تەنها عەلمانییەکان یان ئیسلامییەکان ناخنکێن، بەڵکو هەموو سەرنیشینانی کەشتییەکە دەخنکێت، چارەسەریش ئەوەیە بە چاویلکەی ڕەش تەماشای یەکتری نەکەین و تەنها دیوی نەرێنیی یەکتر نەبینین، بەڵکو دیوی ئەرێنیی یەکتریش ببینین. ئەو گفتو گۆ و

لێکتێگەیشتنانەی ئەمڕۆ هەیە، لەوانەیە زۆر جیاواز بێت لە گفتوگۆکانی چەند ساڵێك پێش ئێستا، کە ئێستا هەردوو لا جۆرێـك لـە بەخۆداچوونەوەیان پێـوە دیارە. ئەوەی ئێمە دەمانەوێت، ئەوەیە دونیای قەناعەت و ئایدیۆلۆژیا جیاوازە لـە دونیـای مامەڵـە و کـاری ڕۆژانـە و دەوڵەتـداری، کـە ئەمــەیان پێکهاتــەی کۆمەڵگایە و هەموو کەس لەگەڵ بوونی جیاوازییەکانیشدا لەخۆی کۆدەکاتەوە، بەڵام کار و پڕۆژە لەسـەر یـەك بـاوەڕ و قەناعـەت، وەکـو هەنـدێك ڕێکخـراوی خاوەن ئایدۆلۆژی و پارتە سیاسییەکانی ئەم سـەردەمە پیـادەی دەکـەن، تـەنها ئەوانە لەخۆ دەگرێت کە لە بیروباوەڕ و قەناعەتدا لە یـەك دەچـن و جیاوازییـان نییە. هەرچەند خەڵکانی دژی ئیسلام هەڵە بکەن و بە پـیلان و بەرنامــەکانیان سەنگەر لە ئیسلام و مسوڵمانان بگرن، بانگخواز و لایەنە ئیسلامییەکان دەبێ وەکو گەیەنەرێکی پەیامی خودا، بە نەرمی و لەسەرخۆیی و زمانی شیرین، بـۆ دینداری بانگیان بکەن، نـابێ وەهـا مامەڵـە لەگـەڵ دژەدیـن و ڕا جیاوازەکـان بکەن، ئەوەی لێ بخوێنرێتەوە ئەمانە ڕقیان لەو خەڵکەیە، یان دەبـێ ئـەو دوور لە دینانە، پابەند بن بە دینەوە، یان دوژمنایەتی و سەنگەر لێگرتنیان بەردەوام بێت تا قەناعەت دەهێنن بە پەیامی خودا و مل بۆ ئیسلام دادەنەوێنن! کە ئەم شێوازە لە بانگەواز لە ئیسلامدا نییە، چونکە جۆرێك لـە تـۆبزی و زۆرەملێـی پێوە دیـارە، لـە کاتێکـدا لـە بانگـەوازی ئیـسلامیدا زۆر نییـە، بـەڵکو دەبـێ بانگخوازان لەسەر بنەمای زانستی و بە زمـانی شـیرینی سـەردەمییانە، وەکـو ئەرکی سەر شانیان ئیسلام و بنەما ئیـسلامییەکان بـۆ خـەڵك ڕوون بکەنـەوە، ئیتر دوای ئەوە، هەرکەس ئازادە بۆ خۆی دینداری هەڵ دەبژێرێت، یان بێدینی.[١]

---

[١].لەباسی زیانەکانی دەستەواژەی (نەسخ)، لەقورئاندا، باسکراوە.

## ٢. كاری ڕاست و دروست، بنەمای هەڵسەنگاندن و مامەڵەکردنمان لەگەڵ دەوروبەر بێت.

خزمــەتكردن بــە خــەڵك و ســودگەیاندن پێیــان، بنەمایــەكی گرنگــی پێكەوەژیانە. كـاری چـاكە پێناسـەی جۆراوجـۆری هەیـە، كـار (العمـل) لـە زمانەوانیدا بە هەر كارێك دەوترێت كە بە مەبەستەوە، یان بـەبێ مەبەسـت، ئەنجام بدرێت، بە جەستە ئەنجام بدرێت، یان بە دڵ وهۆش.[1]

لە زاراوەی شەرعیشدا كاری چاكە بە هەموو ئـەو كـار و وتانـە دەوترێـت كە: مرۆڤ، هەوڵی سەرخستنی دەدات و ئەو ئەركە بەجێ دەگەیەنێت كـە لـە پێناویدا دروست كراوە، وەكو خوای گەورە دەفەرموێت: **"قُــلْ إِنَّ صَــلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ"**.[2]

پێناســەی ئیــسلام بــۆ كــردار جیــاوازە لــە پێناســەی فەلــسەفە و ئایدۆلۆژییــەكانی تـر. نیـازی باشـیش كـاری بـاش دیـاری دەكـات، وەكـو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەفـەرموێت: **"إِنَّمَا الآعْمَالُ بِالنِّيَّــاتِ"**.[3] پێناسەی كار كاتێك پەسەندە لە ئیسلامدا كە بدرێتە پاڵ چاكە، بۆیە ئەگـەر تەماشای قورئان و فەرموودەكانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بكەین، لە هەر شوێنێك بـاس لـە كـار كـرا بێـت، ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ، بـە (وعملوا الصالحات) باس كراوە.

---

[1]. و المنجد فی اللغة والاعلام، لویس معلوف، حرف العین. ١١٦. ومقایس اللغة، احمد بن فارس بن زكریا، چاپی یەكەم: ٢٠٠٢، بابی (عمل) بەرگی ٤/

[2]. لانعام: ١٦٢.

[3] صحیحی بوخاری، ١/٤/ ١.

بەڵام لە ئیسلامدا کاری چاکە بە هەموو ئەو کارانە دەوترێت، سوودی بۆ خودی کەسەکە و خەڵکیش هەبێت، زەرەر لە خۆی و خەڵك نەدات. کاری چاکە بە هەموو کردار و گوفتارێك دەوترێت کە ئەنجامدەرەکە و خەڵك و ژینگە و گیاندارەکان سوودی لیّ ببینن و پێی بەختەوەر بن. لە ئەنجامدانی کاردا شەریعەتی ئیسلام تەماشای چاکی و پاکیی کارەکە دەکات، تەماشای نێو دڵ و قەناعەتی کەسەکە ناکات، ئەوە ی جێهێڵاوە بۆ خودا. چاکە هەر چاکەیە هەر کەس بیکات، هەروەها بە پێچەوانەشەوە. بۆ نموونە کەسانێك کە تەنها بە دوای بەرژەوەندیی شەخسیی خۆیانەوەن، یان بەرژەوەندیی گرووپێك، یان دەستەیەك، بەو شێوەیە پەروەردە کراون و پێگەیەندراون، ناکرێت داوایان لیّ بکەین بارودۆخی گەل و وڵات بەرەو باشی بەرن، یان کەسانێك لە خودی خۆیاندا چاکساز نین، ناکرێت ئەرکی چاکسازییان پیّ بسپێرین، وەکو قورئان بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: "**إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّي يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ**".[1] یاسایەکی کەونی هەیە کە قورئان بۆمانی باس دەکات و دەفەرموێت: "**إِنَّ اللَّهَ لَا يُصْلِحُ عَمَلَ الْمُفْسِدِينَ**".**2** واتە کەسانێك لە خودی خۆیاندا چاك نەبن، کاری چاك نایەتە ڕێگەیان. لێرەدا دەگەینە ئەو ئەنجامەی جیاوازی هەیە لە نێوان کەسێك کە کاری چاکە دەکات، لەگەڵ ئەوەی ئەو کەسە هەڵگری چ قەناعەت و باوەڕێکە، گرنگ ئەوەیە ئێمە ڕێك بکەوین لەسەر ئەنجامدانی کاری چاك، ئەوکاتە ئێمە کاری یەکترمان قبووڵە، بەڵام مەرج نییە قەناعەتی یەکترمان قبووڵ بێت. ئێمەش

---

[1] لرعد: ١١.

[2] یونس: ٨١.

کاتێك یاسا لێپرسینەوەمان لەگەڵ دەکات، لەسەر کارەکانمان دادگاییمان دەکات، نەك قەناعەتەکانمان. هەرکەس بۆخۆی ئازادە بە چ قەناعەتێك ژیانی خۆی بەڕێوە دەبات، بە مەرجێك زیان بە دەوروبەر نەگەیەنێت، خۆ ئەگەر لە ئەنجامدانی کاری چاکەدا مەبەستی ڕەزامەندیی خودا بێت، ئەوە لە قیامەتدا پاداشت دەدرێتەوە و لە دونیاشدا خوا کارئاسانی بۆ دەکات، ئەگەر مەبەستی خوایش نەبێت، خوای باڵادەست، یارمەتییە کەونییەکەی[1] لێی ناگرێتەوە، وەکو خوای گەورە دەفەرموێت: **"كُلًّا نُمِدُّ هَؤُلَاءِ وَهَؤُلَاءِ مِنْ عَطَاءِ رَبِّكَ وَمَا كَانَ عَطَاءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا"**.[2] واتە هەموو لایان ـ چ ئەوان و چ ئەمانە ـ لە خەڵاتی پەروەرندەت بێ بەش ناکەین، خەڵاتی پەروەرندەی تۆ هیچ لەمپەری لەبەردەمدا نییە.[3]

فەلسەفە و ئایدۆلۆژییەکانی تر، کاری چاکە دەبەستنەوە بە بەدەستهێنای بەرژەوەندیی چینێك، یان تاك، یان کۆمەڵگا.

---

[1] مەبەست لە یارمەتیی تەکوینی ئەوەیە کە خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە، هەموو ئەسبابیشی بۆ سازاندووە، بە بێ ئەوەی تەماشای ئەوە بکات چ ئایینێك هەڵ دەگرێت، هەموو پێداویستییەکی ژیانی پێ داوە.

[2] الاسراء: ٢٠.

[3] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: هەژار ل: ٢٨٤.

## ٣. ئـــايين و ئايـــديۆلۆژیا جیاوازەكـــان نەكرێنـــە بنـــەمای هەڵسەنگاندن و پۆلێنكردنی خەڵكی

أ- **ئايين و بەختەوەريى خەڵك:** نـاردنی هـەموو ئايينـەكان لـە پێنـاوی بەختـــەوەريی مرۆڤەكانـــدا بـــووە، پێغەمبـــەرانيش لـــەو پێنـــاوەدا هـــەموو قوربانييەكيان داوە و لە ڕووی تاغووت و خۆسـەپێنەكاندا وەسـتاون: **"وَلَقَـدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ".**[1] واتە: ناردنی پێغەمبەران بۆ ئەوەيە مرۆڤەكان خودا بپەرستن و مرۆڤێكی تری وەكو خۆيان نەپەرستن، پابەنـديی تاكـەكان بـە خوداپەرسـتييەوە ئيختيارييـە، بـەڵام بـۆ كەسانێك كە تواناى ئازادكردنی مرۆڤەكانيان هەبێت لە دەست ستەمكاران، ئيجبارييە. بۆيە دەبێ پارت و ڕێكخـراوە ئيـسلامييەكانيش لـە چوارچـێوەی بنەما و پرەنسيپە مرۆڤدۆستييەكانی ئيسلامدا، پـڕۆژە و بەرنامـە سياسـی، يان خزمەتگوزارييەكانيان، بۆ هەموو مرۆڤاكانی وڵاتی خۆيان پيادە بكەن.[2]

---

[1] النحل: ٣٦.

[2] ئيسلام وەكو بنەما و پرەنسيپەكانی، بۆ هەموو مرۆڤايەتبيە بەبێ جياوازی، يان دەمارگيری بۆ نەتەوەيەك، يان ڕەگەزێك، يان خاكێك، بۆيە هەموو مرۆڤايەتی بەبێ جياوازی، بەرپرسن لە جێبەجێكردن و پابەند بوون پێوەی، بەڵام مرۆڤەكان ئەركی سەر شانيانە لە دەورو بەر و ژينگەی خۆياندا كاری لەسەر بكەن، وەكو گەلی خۆيان و وڵات و نيشتمانی خۆيان، بە هيچ شێوەيەك ڕێگە نادات، بە ناوی برايەتبی ئيسلاميبەوە، هيچ كەس و نەتەوەيەك بستێك لە خاك و ئاو و ماڵی مسوڵمانێكی تر داگير بكات، لە حاڵەتێكی واشدا، خاوەن ماف بۆی هەيە دژی بجەنگێ، خۆ ئەگەر بابای دەستدرێژكار كوژرا، خوێنەكەی بە زايە دەڕوات، لە كاتی كوژرانی خاوەن مافيشدا دەچێتە ڕيزی شەهيدەكانەوە، كەس و لايەنە دەستڕۆيشتووەكانيش ئەركی سەرشانيانە پاريزێگاری و پشتيوانی لە گێڕانەوەی مافی زەوتكراوی برا ستەملێكراوەكەيان بكەن.

تەنها مرۆڤبوون و هاوولاتیبوون بنەمای کارکردنیان بێت. هەر جوداخوازی و پۆلێنکردنێك لەسەر ئینتیمای حیزبی، یان جیاوازیی بیروڕا و قەناعەت، جگە لەوەی پێچەوانەی فەرموودەیەی پێغەمبەرە (صلی اللەعلیە وسلم) کە دەڵێت: **"الْمُسْلِمُونَ عِنْدَ شُرُوطِهِمْ"**.[1] یەك ناگرێتەوە لەگەڵ دروشمی ئەو پارت و ڕێکخراوانەدا کەوا بە ناوی گەل و جەماوەرەوە قسە دەکەن، یان لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردنەکاندا، داوا دەکەن هەموو خەڵك پشتیوانییان لێ بکەن و دەنگیان پێ بدەن، چونکە لە کاتی بانگەشەی هەڵبژاردندا پەیمانت داوە بە بێ جیاوازی وەکو چۆن خزمەت بە ئەندامێکی ڕێکخراوەکەی خۆت دەکەیت، بە هەمان شێوە خزمەت بە هەموو هاوولاتییەکی ولاتەکەت بکەیت، وەکو فەرموودەکە ئاماژەی پێ کرد، ئەمە گرێبەستێکە لەگەڵ هەموو خەڵکیدا کراوە، ئەگەر هاتو لە هەڵبژاردنەکاندا دەنگیان پێ دایت، بە ئەندازەی دەنگ هێنانەکەت ئەرکی سەر شانی ئەو پارتەیە خزمەتی هەموو هاوولاتییان بکات، چونکە لە گرێبەستەکەدا خەڵکی ئەرکی خۆی بە ئەنجام گەیاندووە، ماوەتەوە سەر بەرانبەر ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات. بۆیە ئەرکی دەسەلاتە، بەبێ جیاوازیی ئایین و نەتەوە و ئایینزاو ئایدیۆلۆژیا جیاوازەکان، خزمەتی هەموو هاوولاتییان بکات، نەك وەکو دەسەلاتدارانی هەرێمی کوردستان هەموو داهات و ئیمتیازێکی هەرێمی کوردستان کە مافی هەموو هاوولاتییانە، لە پێناو ئەندامان و دۆست و لایەنگرانی خۆیاندا بەکار بهێنن، ئیمتیازات و پۆست و دامەزراندن و مووچە بڕینەوە، هەر بۆ ئەوان بێت،

[1] صحیح البخاری، ٨/ ٣٠١ / ١٤.

بەڵام ئەو هەزاران کەسە زەحمەتکێشەی تر کە سەر بە ئـەوان نـین، بـێ بـەش بکرێن. ئەم شێوە بەڕێوەبردنەی وڵات، جگە لـەوەی سـتەمێکە لـە بەشـێکی بەرچاوی هاووڵاتییان دەکرێت، لە هەمان کاتدا هۆکارێکیشە بۆ دروستبوونی دووبـەرەکی و بـەرپابوونی کینـە و ڕق بەرانبـەر بـە یـەکتری، لـە بـاتی خۆشەویـستی بـۆ ئـەو دەسـەڵاتە، هاووڵاتییـان وەکـو دێوەزمەیـەك بەسـەر شانیانەوە دەیبینن و چاوەڕوانن ڕۆژێك زووتر لە دەستی ڕزگاریان ببێت. هەر کاتێك هاووڵاتییان هەستیان کرد دەسەڵات لەسەر بنەمای ئایدۆلۆژیی حیزبی یان هەر ئایدیۆلۆژیایەکی تر، خزمەتی هاووڵاتییان دەکات، ئەوکاتـە ئـەرکی هاووڵاتییان و لایەنە پەیوەندیدارەکانە دوو ڕێگا بگرنە بەر:

ڕێگای یەکەم: بەکارهێنانی هەموو میکانیزمێکی شیاو و مەدەنییانە دژ بـە جیـاخوازی. کـار بکـەن بـۆ گـۆڕین و گۆڕانکـاری لـەو دەسـەڵاتەدا و هاووڵاتییان هۆشیار بکرێنەوە کە پـشتیوانی ئـەو جـۆرە دەسـەڵاتانە نـەبن و ڕۆحی خۆگری و دڵسۆزی و خۆشەویستیی گەل و وڵات لە هەست و هۆشیاندا قایم بکرێت و لە جێگەی نائومێدی و کۆچکردن بۆ هەندەران، فێری خـەباتی مەدەنییانە بکرێن.

ڕێگای دووەم: بۆ چارەسەری بێبەشـکردنی خـەڵکی، هـەوڵی پەیـداکردنی بـەدیل (ئەڵتـەرناتیف)ی جۆراوجـۆری وەکـو هەماهـەنگی لەگـەڵ هەنـدێك کۆمپانیای نێوخۆ و دەرەوە، لەلایەك بۆ دۆزینـەوەی هـەلی کـار بـۆ ئەوانـەی بێکارن و هیچ سەرچـاوەیەکی بـژێوییان نییـە، کاریـان بـۆ بدۆزرێتـەوە[1]، لـە

[1] کاتێك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم ) چووە مەدینە، بینیی مسوڵمانەکان خەریکی کشتوکاڵن و بازاڕیش لەلایەن جولەکەوە قۆرخ کاوە و بە سوو کڕین و فرۆشتنی تێدا دەکەن،

لایەکی تریشەوە دوور لە هەوڵ و خـەباتی سیاسـی، پـارت و ڕێکخراوەکـانی ئۆپۆزسیۆن  پێکەوە نەك بە جیا هەر پارتێك بۆ دۆست و لایەنگرانی خۆیـان، لەســەر پرۆژەیــەکی خزمــەتگوزاری و بەدەمەوەچــوونی جۆراوجــۆری وەکــو: هاوکاریکردنی ئـەو گەنجانـەی خێـزان پێکـەوە دەنـێن و کەمدەرامـەتن، یـان ئەوانەی هەتیون، یـان بێـوەژنن، ڕێـك بکـەون و هاوکـاریی ئەوانـە بکرێـت، متمانـە بـە کـە سـانی سـەرمایەدار و دەوڵەمەنـد بـدرێت، کـەوا هاوکـار و پشتیوانی ئەو جۆرە پرۆژانە بن، ئەوانیش بزانن لەباتی بەرژەوەنـدیی پـارت و وتوێــژێکی دیــاریکراو، لــە خزمــەتی هــەموو خــەڵکێکی بەشــخوراو و کەمدەرامــەتی وڵاتدایـە، بـە دڵنیاییـەوە بـە گەرموگوڕییـەکی زیـاتر و بـە بەرنامەیــەکی تۆکمــەترەوە لێیــان دەچــنە پێــشەوە، خـۆ ئەگـەر تەماشـای ئۆپۆزۆسۆنی وڵاتە پێشکەوتووەکانیش بکەیت، پرۆژەی لەو شـێوەیەیان زۆرە، ئەم جۆرە هەنگاوانـە دڵنیـایی دەدات بـە خـەڵك کـە لـە دەرەوەی دەسـەڵات لایەنەکانی ئۆپۆزسیۆن  خەمیان دەخۆن.

**ب‌-	هەڵسەنگاندنی دادگەرانە:** ئەو کارانەی ئەنجام دەدرێـن، تەماشـای پێکان و باشی کارەکە بکەین، لەسەر بنچینەی قەناعەتی ئەنجامدەرەکان، بە پۆزەتیڤ یان نیگەتیڤ هەڵنەسـەنگاندنیان، ئەوکاتـە تێڕوانینمـان بـۆ کـار و ئەنجامدەرەکانی دوور دەبێت لە هەستیاری و ستەمکردن لە دەوروبـەر.  لێـك جوداکردنەوەی چاکە و خراپە، حوکمی پۆزەتیڤ، یان نیگەتیڤ، بەسەر کـارە

---

بازرێکی بازرگانی و کڕین و فرۆشتنی بۆ مسوڵمانەکان کردەوە و فەرموی: **"هذا سُوقُكُمْ فَلاَ يُنْتَقَصَنَّ وَلاَ يُضْرَبَنَّ عَلَيْهِ خَرَاجٌ". سنن ابن ماجة:٢/٧٥١/ ٢٢٣٣.** واتە: ئەمە بازاڕی ئێوەیە لانابرێت و باجیش لەسەر کڕین و فرۆشتنی کەس دانانرێت.

ئەنجامدراوەکانـدا لەسـەر بنـەمای ئینتیمـای ئایینێـك، یـان پارتێـك، یـان ڕێکخراوێـك نابێـت، کـە ئەگـەر ئەنجامدەرەکـە سـەر بـەو ئایـدیا و پـارت و ڕێکخراوە بوو کە ئینتیمامان بۆی هەیە، بـە ڕەوا و نـاڕەوا، پارێزگـاریی لـێ بکەین، خۆ ئەگەر سەر بە پارت و ڕێکخراوەکەی خۆیـشی نـەبوو، هەڵەکـەی بپۆشێت و چـاوی کـارە چاکەکانیـشی نـەبینێت. جـاری وا هەیـە ئـەم جـۆرە تێڕوانینە، بنەماڵ یان هۆز، یان نەتەوەیەکیش دەگرێتەوە **"وَالَّذِينَ اجْتَنَبُـــوا الطَّاغُوتَ أَنْ يَعْبُدُوهَا وَأَنَابُوا إِلَي اللَّهِ لَهُمُ الْبُشْرَي فَبَشِّرْ عِبَـــادِ الَّـــذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ أَحْسَنَهُ أُولَئِكَ الَّذِينَ هَدَاهُمُ اللَّهُ وَأُولَئِكَ هُمْ أُولُو الْأَلْبَابِ". ١** ئەم ئایەتە پیرۆزە بە چاکە بە شان و باڵی ئـەو کەسـانەدا هـەڵی داوە، کە خۆیان لە تاغووت دەپارێزن، تاوەکو نەکەونە کاری هەڵە و ناڕەواوە، ڕەنجیان داوە کە بە شوێن ڕا و سەرەنج و پلانی چـاکدا گـەڕاون، بۆیـە خـوای باڵادەست، بە خاوەنی ئـاوەز نـاوی بـردوون.[2] خـوای گـەورە لـە دوو شـوێندا مـوژدەی بـە بەنـدەکانی داوە، یەکـەمیان بـۆ ئەوانـەی خۆیـان لـە تـاغووت دەپارێزن، دووەمیان بۆ ئەوانەی بە دوای ڕا و قسەی چاکدا دەگەڕێن.[3] یەکێك لە هەڵە کوشندەکان کە زۆر جار خەڵکی تێی دەکەون، لەسەر بنەمای باوەڕ و قەناعەت کار و خزمـەتی خـەڵکی هەڵدەسـەنگێنن و دەسـت لـە کارێـك وەر دەدەن کە لە توانای مرۆڤەکاندا نییە، کـە ئـەو کەسـانە بـە کـردەوە دەڵـێن: ئیمان تەنها دەربڕینە بە زمان و کرداری دڵە، کە ئەمە پێچەوانەی عەقیـدەی

[1] الزمر: ١٨.

[2] التفسير الوسيط، محمد سيد طنطاوی، بەرگی١٢/٢٠٩، چاپی یەکەم: ١٩٩٨.

[3] ايسرالتفاسير، جابر بن ابو بكر الجزائری، چاپی پێنجەم:٢٠٠٣، بەرگی ٤/٤٧٦.

جەماوەری مسوڵمانانە کە دەڵێن: کردار بەشێکە لە ئیمـان.[1] واتـە: کەسـێك کە بانگەشەی ئیمانداری دەکـات، کاتێـك ئیمانەکـەی ڕاسـت و ڕەوانـە، کـە کردارەکانیشی چاك و جوان و پەسەند بن، ئەو کارانـەی کـە پەیوەنـدیی بـە گەل و وڵات و خەڵکەوە هەیە، تەنها تەماشای مرۆڤبوون دەکرێت، تەماشای دڵ و دەروون و قەناعەتی کەسـەکان ناکرێـت. پێغەمبـەر (صـلى اللـه عليـە وسـلم) پـێش هـاتنی ئیـسلام، لـەناو (ڕێکخراوێکـی) مرۆییـدا بـە نـاوی (هاوپەیمانیی چاکە) هاوکاریی بێکەس و هـەژار و لێقـەوماوانی دەکـرد، کـە هەر یەکە لە بەشداربووان، بـاوەڕی جـودا لـەوی تـری هـەبوو، دوای هـاتنی ئیسلام و کۆچی مەدینە، فەرمووی: لە پـەیمانی چـاکەکاران بەشـداریم کـرد، ئەگـەر ئێـستاش بـانگم بکـەن بەشـداریی تێـدا دەکـەم[2]. چـونکە یاسـایەکی گشتیی پێکەوەژیان هەیە، کە جگە لە شکاندنی سـنووری شـەرعی، هـەموو هاوکارییەك پێکەوە بکەن، وەکو خوای باڵادەست دەفەرموێت: **"يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا لَا تُحِلُّوا شَعَائِرَ اللَّهِ وَلَا الشَّهْرَ الْحَرَامَ وَلَا الْهَدْيَ وَلَا الْقَلَائِدَ وَلَا آَمِّينَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنْ رَبِّهِمْ وَرِضْوَانًا وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآَنُ قَوْمٍ أَنْ صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَنْ تَعْتَدُوا وَتَعَاوَنُوا عَلَي الْبِرِّ وَالتَّقْوَي وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَي الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ"**[3]. کـە دوابـەدوای باسـکردنی پارێزگـاریی سـنوورە شـەرعییەکان، ئیمانـداران هـان

---

[1] شرح اصول السنة، احمد بن حنبل، بشرح: د. محمد بن سعيد رسلان، چاپی یەکەم: ٢٠١٣، ٥٨٧/٢.

[2] السنن الكبرى، للبيهقى، كتاب الطهارة: ٦/ ٥٩٦.

[3] المائدة:٢.

دەدات وەکو بێباوەڕان ڕفتـار نەکـەن، بـۆ ئـەوەی لـێکترازان دروسـت نـەبێ، ڕاستەو خۆ دەفەرموێت: "**تَعَاوَنُوا عَلَي الْبِرِّ وَالتَّقْوَي وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَي الْـإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ**". لێرەوە دەچینە نێو بابەتی سیاسەتی دووفـاقیی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا بەرانبەر بە جیهـانی ئیـسلامی. تێڕوانینمـان بـۆ سیاسـەتە پراگماتییـەکانی وڵاتـانی ڕۆژئـاوا جیـا بکەینـەوە لـە پیـادەکردنی مافـەکانی مـرۆڤ و میکانیزمەکانی بەڕێوە بردن، چونکە بەشێك لە هەڵسوکەوت و سیاسـەت و مامەڵەکردنی وڵاتانی ڕۆژئاوا لەگەڵ جیهانی ئیـسلامیدا، جێگـەی ڕەخنـە و هەڵوێستە لەسەر کردنە. هەڵسوکەوتی وڵاتانی ڕۆژئاوا بۆ مافـەکانی مرۆڤـی خۆیان، جودایە لە هەڵسوکەوتیان بەرانبەر بە مافەکانی مرۆڤی ڕۆژهـەڵات و جیهانی ئیسلامی. تێڕوانینیان بۆ ڕۆژهـەڵات، تێڕوانینێکـی بەرژەوەنـدخواز (نفعی)یە و ئاکاری تێدا نییە. ئەگەر بەرژەوەنـدیی وڵاتـەکانیان لـەوەدا بـوو پشتیوانی لە دەسەڵاتە ستەمکار و داپڵۆسێنەرەکان بکەن، ئەوان بەبێ سێ و دوو پشتیوانییان لێ دەکەن، وەکو هەڵوێستی ئەمریکا بەرانبـەر بـە شۆڕشـی کورد کە لە پیلانی ۱۹۷۵ کە بە نێوەندگیریی جەزائیر، لـە لایـەن عێـراق و ئێرانەوە، دژ بە شۆڕشی کورد داڕێـژرا، یـان وەکـو داوای لێبـوردنی سـەفیری ئەمریکا لە عێراق، لەسەر ئەوەی لەساڵی ۱۹۹۱ پشتی شۆڕشـی شـیعەکانی خوارووی عێراقی دژ بە ستەم و زۆرداریی سەدام حوسێن نەگرتووە.[1] یان وەکو هەڵوێـستی نێگـەتیڤیان بەرانبــەر بــە دەســەڵاتە خۆســەپێنەکانی بــەهاری عـەرەبی، کە بینییان بـزاڤ و ڕەوتـە ئیـسلامییەکان زیـاتر سـوودمەند دەبـن،

---

[1] ویکیپیدیا، فەرهەنگی ئازاد.

ئــەوانیش بەرژەوەنــدیی خۆیانیــان تێــدا نەدەبینییــەوە، بــە هــیچ جۆرێــك پشتیوانییان لێ نەکردن.[1] فەلسەفەی نەفعی کە براگماتیــشی پــێ دەوترێــت، لەسەر بەدەست خستنی بەرژەوەندییە، بەبێ ڕەچاوکردنی بنــەماکانی ئــایین و ڕەوشت، بەڵکو سوود گەیاندن بە تاك و کۆمەڵ پێــوەری ئاکــارە.[2] مەترســیی ئەم فەلسەفەیە ئەوەیە گەل و نەتەوە بێهێزەکان، تێیدا زەرەرمەند دەبن، وڵاتە زلهێزەکان بێبەزەییانــە خێروبێــری وڵاتــەکانیان بــۆ گــەل و وڵاتــەکانی خۆیــان دەبەن.[3] ئەم هەڵوێستە نەرێنییانەی وڵاتانی ڕۆژئاوایــە، ئــەو قەناعەتــەی لــە لای بیرمەندێکی وەکو ســەید قوتــب دروســت کــردووە، کــە میکانیزمــەکانی دیموکراسی لە هەڵوێستی سیاسیی وڵاتانی ڕۆژئاوا جودا نەکاتەوە، بۆیــە ئــەو قەناعەتەی بــۆ دروســت بووبــوو کــە سیــستمی دیکتــاتۆری دادپــەروەری پــێ باشــترە، لــە سیــستمی دیموکراســی.[4] ئــەو هەڵوێــستی وڵاتــانی ڕۆژئــاوا وێنــا

---

[1] الموقع الالكترونی:اضائات مصر العربیة، الاستراتجیات الدولیة والاقلمیة، للتعامل مع ثورات الربیع العربی.

[2] ئەم قوتابخانەیە ڕێڕەوێکی سیاسبیە، لە ساڵی ١٩١٤ دامەزراوە، سوود پێوەری حەقیقەتە، باوەڕیان بە هیچ ئایدۆلۆژیەك نییە، موسوعة السیاسة، الکیالی، ٦ / ٧٦٧ـ٧٦٨، کە ئەمەش فەلسەفەی سەرمایەدارییە بزوێنەری: بەرژەوەندی و دەسکەوتی مادییە، النظام العالمی الجدید، بین الوقع الحالی، والتصور الاسلامی، یاسر ابو شبانة، ل: ٦٢.

[3] موسوعة السیاسة، الکیالی، ٦/ثیتی نون، ل:٦٠٣، والمصطلحات السیاسیة، د. توفیق الواعی، چاپی، یەکەم:٢٠٠٧، ل:١٦٩.

[4] بیر و بۆچوونەکانی بیرمەندی گەورەی ئیسلامی سەید قوتب، بۆ ئەوەی ستەم لە خۆمان و لە ئەویش نەکەین، دەبێ چەپکێك لە: بیر و بۆچوونەکانی وەرنەگرین و لەیەك گۆشەوە خوێندنەوەی بۆ بکەین، چونکە سەید وەکو ئەو بۆچوونەی سەبارەت بە کۆمەڵگاکان هەیە، لە هەمان کاتدا ئەو بۆچوونەشی هەیە کە دەڵێت: گەڕانەوەی شارستانیەت و سەرکردایەتیی

دەکات، بە دوو پێوانە دەپێون، جیاوازی دەکەن لەنێوان مرۆڤی ڕۆژهـەڵات و ڕۆژئاوادا، یان بە واتایەکی تر، ڕەچـاوکردنی بەرژەوەنـدی بنـەمای ڕەوایـی و ناڕەواییە، ئـەو قەناعـەتی وایـە دیموکراسـیەت لەداڕوخاندایـە، چۆن دەبێـت ئەزموونی داڕوخاو لە وڵاتی خۆت دووبارە بکەیتەوە[1]؟ وە ئەو قەناعەتی وایە لەسەرزەوی دوو سیستمی حوکمڕانی هەیە: یـەکێکیان ئیـسلامیە، ئـەویتریان جاهلیە ئیتر هەر ناوێکی هەبێت[2]. وەبنەمای بەختەوەرکردنی گەلانی خۆیان، لەڕووی سیاسی و ئابووریەوە، لەسەر حیسابی گـەل ونەتـەوەکانی تـر، دژ بـە هەموو بنەما ئایینی و مرۆڤایەتییەکانـە، ئەمـەش وایکـردووە، بەشـێك لـە زانایـان و بیرمەنـدانی جیهـانی ئیـسلامی، ڕاڕاییـان بەرانبـەر بـە سیـستمی دیموکراسی هەبێت و بڕیارێکی ڕون و یەکلا کەرەوەیان نەبێت، ئەگـەر تـەنها لەڕوانگەی فەلسفەی مادەگەرایی و شـەڕی خـاچ پەرسـتان و ئیـستیعمارەوە بڕوانین، بۆڕۆژ ئاوا، ئەوکاتە دەبێ گـشتاندن بکـەین و بـەو شـێوەیەی سـەید

---

ئوممەی ئیسلامی، وا بە ئاسانی نییە، بەڵکو گرتنە دەستی ئەو سەرکردایەتییە، چەند سەدەیەکی دەوێت، معالم فی الطریق، سید قطب، ضاثی دقیقم ١٩٨٣، دارالکتب الاسلامی ل: ٩ مانای چەند سەدەی ئەگەر بە کۆکردنەوەی لۆژیکیش بێت، لە دوو سەدە کەمتر نییە، کە وابێ سەید بەتەما نەبووە لە ماوەی چەند ساڵێك بە توندوتیژی و هێز دەسەڵات بۆ جیهانی ئیسلامی بگێڕێتەوە و لە جێگەی سیستەمەکانی: سۆسیالیستی و دیموکراسی و پاشایەتی، سیستەمی ئیسلامی دابنێت، خۆ ئەگەر ئەو مەبەستەی هەبوایە، پێویستی بە دوو بۆ سێ سەدەی نەدەکرد، بەڵام دیارە مەبەستەکەی سەید ئەوەیە شارستانیەتی ئیسلامی لە هەموو ڕووەکانی: زانستی و تەکنولۆژی و سیاسی و ئابوری و ڕۆشەنبیری و ... هتد، دەگرێتەوە، بۆیە ئەو ماوە زۆرەی بۆ داناوە، ئەوەش بە هێزی لۆژیك و بەڵگە دەبێت، نەك توندوتیژی.

[1] الشرعیة السیاسیة، عزام التمیمی، ل: ٢٣٧.

[2] معالم فی الطریق، سید قطب، ل: ٩٨.

قوتب و هەندێك لەكەسايەتی و سەركردەی بزاڤە ئیسلامییەكان هەیانە، مامەڵە لەگەڵ ڕۆژ ئاوادا بكەین، تەنها خراپەكانیان ببینین، بەڵام ئەم گشتاندنە، لەگەڵ بنەما ئیسلامییەكان و سود بینین لەئەزمونی گەلاندا یەكناگرێتەوە، كە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەكاتی كۆچكردنی بەشێك لە هاوەڵانی بۆ حەبەشە، دەربارەی پاشاكەیان فەرموی: (بچن بۆ حەبەشە، پادشایەكی لێیە لە پەنایدا كەس ستەمی لێناكرێت، ئەووڵاتە خاكی ڕاستگۆییە)[1]یان وەكو موستەوریدی قورەیشی، كە یەكێكە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە لای عەمری كوڕی عاص وتی : لە پێغەمبەرم بیستوە، ئەی فەرمو:(**تقوم الساعة والروم أكثر الناس، فقال له عمرو: أبصر ما تقول، قال: أقول ما سمعت من رسول الله صلي الله عليه و سلم، قال: لئن قلت ذلك، إن فيهم لخصالا أربعا: إنهم لأحلم الناس عند فتنة، وأسرعهم إفاقة بعد مصيبة، وأوشكهم كرة بعد فرة، وخيرهم لمسكين ويتيم وضعيف، وخامسة حسنة وجميلة وأمنعهم من ظلم الملوك**) [2] لێرەدا چەند تێبینیەك لەسەر ئەم فەرموودەیە دەخەینە ڕوو:

١. گەشەكردن و زۆر بوون، نیشانەی دەستگرتنە بەهۆكارەكانی، مانەوە و خۆگری و خۆپاراستن لە هۆكارەكانی لاوازی و كەم حەوسەڵەیی و ستەم و زۆر و دووره پەرێزی لە هۆكارەكانی لەناوچون.

٢. عەمری كوڕی عاص بە تێبینی لە سەر ئەو فەرموودەیەی موستەوریدی قورەیشی باسی لەو ئاكار و بەها بەرزانە كردووە، كە هۆكارن

---

[1] سيرة ابن هشام، ١/ ٣٢١.

[2] صحیحی موسلیم، ٤/ ٢٢٢٢/٢٨٩٨.

بـۆ تەمـــەن درێــژی گــەل و نەتــەوەکان،  هۆکــاری زۆر بــوونی ڕۆمــەکان و پارێزراویان لە قاتی و قڕی و تیاچوون و مانەوەیان تا لەناو چوونی دونیا.

٣.  ئەوەمان فێر دەکات چاکی و خراپی گەل و ئایین و نەتەوەکان پـۆلێن بکەین و سوود لە ئاکارە بەرز و بنەما مرۆڤایەتییەکانیان ببیـنین، دیـسانەوە دەبـێ ئـەوە بلێینــەوە: شارسـتانیەتەکان تەواوکـەری یـەکترن، دەبـێ سـوود لەپێشکەوتنەکانیان ببینین و بەچاوی ڕێزەوە تەماشای بکەین، یاسـای خـوای بالأدەست لەبوونەوەردا وایە: قەت ئەم جیهانە بۆ یەك هێـز یـەکلا ناکاتـەوە، بـــۆ یـــەك دەســـەلأت تاســـەرنابێت، وەکـــو ئیبنوخەلـــدون دەلێـــت: شارسـتانیەتەکانیش وەکـو مرۆڤـەکان تەمـــەنی لاویـــەتی و گەنجیـــەتی و پیربوونیـــان هەیـــە [1]. دوای ئـــەو ســـووڕی تەمەنـــە چ گـــەل و نەتەوەیـــەك شایـستەتربوو دەسـەلأت دەکەوێتـە دەسـت ئـەوان، وەکـو خـوای بالأدەسـت دەفەرموێت: **(وَلَوْلَا دَفْعُ اللَّهِ النَّاسَ بَعْضَهُمْ بِبَعْضٍ لَفَسَدَتِ الآرْضُ وَلَكِـــنَّ اللَّهَ ذُو فَضْلٍ عَلَي الْعَالَمِينَ)** [2].

لەکۆتاییدا دەلـێین خـەلکی حەبەشـە مـسولمان نـەبوون و پادشاکەشـیان مسولمان نەبوو بەلأم پێغەمبەر (صـلی اللـە علیـە وسـلم) نەیفـەرموو ئـەوە ولأتێکی جاهیلیە، بـەلکو فـەرمووی: ئـەوەخاکی ڕاسـتگۆییە، یـان عـەمری کوڕی عاص نەیوت ڕۆمەکان کۆمەلگەیەکی جاهیلیە، هیچ خێرێکیـان تێـدا نییە، بەلکو پێنج ئاکاری بەرزیانی باسکردن کە شایەنی ئەوەیە سوودیان لـێ ببینین و چاویان لێ بکـەین، بـەلێ ڕاسـتە ئـەوروپا، دوو پێوەریـان هەیـە بـۆ

---

[1] مقدمة ابن خلدون، ضاثي:٢٠٠٦، ل: ٣٩١.

[2] البقرة: ٢٥١.

مامەڵە لەگەڵ وڵاتانی خۆیان و گەل و نەتەوەکانی تری دونیا، بەڵام سیستمی دەستاودەستکردنی دەسەڵات و دادگەری کۆمەڵایەتییان هەیە و گەلەکانیان دوورن لە ستەم و زۆر، دەبێ لەباتی ئەوەی بەڕەش هەموویان ببینین، سوود لەئەزموون و سیستمی حوکمڕانییان وەربگرین. بۆیە ئەبێ مامەڵەی ئێمەش لەگەڵ ڕۆژئاوادا هەڵسەنگاندنی جۆری کارەکانیان بێت.

## ٤. خزمەتەکان گشتگیر بن.

أ- بنەمایەکی گەورەی پێکەوەژیان بەبێ فەرقی تەماشاکردنی هاوڵاتیانە، نابێ شێوازی مامەڵەکردنی مەحرەمانەی حیزبایەتی بگوازرێتەوە بۆناو دەسەڵات وحکومەت، چونکە ئەمەی دووەم مافی هەموو خەڵکیە، بەڵام ئەوەی یەکەم مافی هەندێك لە خەڵکیە کە بەرەزامەندی خۆیان و بەشێوەیەکی خۆبەخشانە کاری تیادا دەکەن، کە ئەوەی یەکەم لەبنەڕەتدا بۆخزمەتی ئەوەی دووەم دروست دەکرێت، ئەمە دیارترین نیشانەی پارتی جەماوەری و پارتی نیشتیمانیە، کە بەداخەوە لە وڵاتەگەندەڵەکاندا پێچەوانە دەکرێتەوە، کە بەرژەوەندی خەڵکی و نیشتیمان بۆ خزمەتی حیزب بەکار دەهێنرێت، لە قورئاندا بەسەر هاتی یوسف پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) هاتووە، کە لە نێو گەلێکی بێباوەڕی بتپەرستدا، پڕۆژەیەکی چاکسازی ئابووری پیادە کردووە، بە بێ خوێندنەوە بۆ بیرو باوەڕ و قەناعەتیان، دەستی کردووە بە خزمەتکردنیان و پلانی داڕشتووە بۆ ڕزگارکردنی گەلی میسر لە برسیەتی و قاتی و قڕی، بەکردەوە بۆیانی سەلماندوە کە خوای گەورە ئایین و پەیامبەرەکانی دەنێرێت بۆ ئاسوودەیی و بەختەوەری خەڵکی، بە زمانی

کردار و هەندێك جاربە زمانی گوفتار و دواندن ڕاستگۆیی و پاکی و دڵسۆزی خۆی بۆ سەلماندون، هەروەکو قورئان بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت: (قَالَ تَزْرَعُونَ سَبْعَ سِنِينَ دَأَبًا فَمَا حَصَدْتُمْ فَذَرُوهُ فِي سُنْبُلِهِ إِلَّا قَلِيلًا مِمَّا تَأْكُلُونَ، ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ سَبْعٌ شِدَادٌ يَأْكُلْنَ مَا قَدَّمْتُمْ لَهُنَّ إِلَّا قَلِيلًا مِمَّا تُحْصِنُونَ، ثُمَّ يَأْتِي مِنْ بَعْدِ ذَلِكَ عَامٌ فِيهِ يُغَاثُ النَّاسُ وَفِيهِ يَعْصِرُونَ[1]). وتی: حەوت ساڵ لە کشتوکاڵ وچان نادەن، هەرچیەکی درووـ کەمێك نەبێ کە لێی دەخۆن ـ لەو شوێنی خۆیا بێڵنەوە!. لەپاش ئەمە حەوتی قاتی و قڕی دادێ، هەرچی پێشوو بۆ ئەمانەتان هێشتەوە، هەمووی دەخۆن، مەگین کەمێ لەوەی قایم هەڵیدەگرن. لەدوای ئەمە ئەمجارە ساڵێکی وادێ، بۆ هەمووکەس باران و ڕووەك مشەیە و لەودا مل لە گووشین دەنێن[2]. هەر بە ئەوە نەوەستا پاشان یوسف (درودی خوای لەسەربێت) خۆشی دەستی کردبە جێبەجێکردنی پلانەکەی و بەدەسەڵاتداری میسری وت: (قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَائِنِ الْأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ)[3] **گوتی:** بمکە بە سەرکاری نەغدینە و بەروبووی وڵات، چاودێری لێدەکەم و لێزانیشم.[4] ئەگەر تەماشای قورئان بکەین لەوشوێنانەی کە پەیوەندی بە مرۆڤەکانەوە هەیە بەگشتی بۆ لێکنەترازانی پەیوەندییەکانیان، خوای گەورە بەبێ جیاوازی لەزیاتر لە چەندین شوێن مرۆڤەکان بە گشتی بەبێ خوێندنەوەی ئینتیمای ئایینی دەدوێنێ و

---

[1] یوسف:٤٩

[2] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: هەژار ل:٢٤١

[3] یوسف: ٥٥

[4] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: هەژار ل: ٢٤٢.

مرۆڤبوونمان بیر دەخاتەوە، کە لەخودی خۆیدا پەیامێکە بۆ ئێمە، ئێمەش لەپێناوی بەرژەوەندی گشتیدا دەستبەرداری بەرژەوەندییە تایبەتییەکانمان ببین، وەکو دەفەرموێت:(**هُوَ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ**)[١]. واتە: هەر ئەو ئێوەی لە یەك کەس وەدی هێناوە[2]. (**يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَي وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**)[3]. ئەی خەڵکینە! هەر لە نێر و مێیەکەوە ئێوەمان وەدی هێناوە و کردومانن بە چەند گەلێك و چەند هۆزێك، هەتا یەکتری بناسن. بەرێزترینتان لای خودا پارێزکارترینتانن. خوا زانا و ئاگادارە[٤]. (**وَقُولُوا لِلنَّاسِ حُسْنًا**)[5]. بە مەردوم بڵێ قسەی باش بکەن[٦]. (**وَتَعَاوَنُوا عَلَي الْبِرِّ وَالتَّقْوَي وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَي الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ**)[7]. لەسەر چاکە و پارێزکاری یارمەتی یەکتری بدەن، نەك لە سەر تاوان و غەدر. دەشێ لە خوا بترسن، چونکە خودا نافەرمانان زۆر بە توندی تەمێ دە کات[8]. بۆیە دەبێ لە کاتی بەڕێوەبردنی کۆمەڵگای هەمەجۆر و دەوڵەتدارییدا، جیاوازیی بکرێت لە نێوان ئەم دوو گوتارەدا، نابێ قەناعەت و

---

[١] الاعراف: ١٨٩.

[٢] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار، ل: ١٧٥

[٣] الحجرات:١٣.

[٤] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار، ل:٥١٧.

[٥] البقرة: ٨٣

[٦] قورئانی پیرۆز " وەگێڕانی: هەژار، ل: ١٢

[٧] المائدة: ٢

[٨] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار، ل: ١٠٦

باوەڕێك كە تایبەتە بە كەسەكانەوە، یان بە شێكی خەڵكەوە، بسەپێنرێت بە سەر هەموو خەڵكدا، لە دەوڵەتدارییدا ئەو پرۆژە و بەرنامانە دەكرێت بە یاسا و دەوڵەتی لە سەر دەبرێت بەڕێوە، كە لە ڕووی سیاسیی و ئابووریی و كۆمەڵایەتییەوە پەیوەندیی بە بەرژەوەندیی و ژیان وگوزەرانی هەموو هاووڵاتیانەوە هەبێت، هەروەكو شارەزایانی ئوصولی فیقە دەڵێن: ڕەچاوكردنی بەرژەوەندییەكان بنەمایەكی شەرعیە و دەبێ ڕەچاو بكرێت[1].

هەروەكو گەورە زانایان دەڵێن: بەهەرشێوەیەك ڕاستیی و دادگەریی دەركەوت ئەوە شەرعی خوایە، چەسپانی دادگەری یەك شێوە نیە، شەریعەتیش بەدیهێنانی بەرژەوەندی خەڵكە[2].

### ب- ڕەچاوكردنی بەرژەوەندیی گشتیی پێش بەرژەوەندیی تایبەتی

بنەمایەكی تری پێكەوەژیان ئەوەیە لەبەر خاتری هەندێك خزمەتی بچووك، كە دەسەڵات بۆمانی كردووە، نابێ گەندەڵی و ستەم و زۆرەكانی پشتگوێ بخەین و منەتبارمان بكات، وەكو خوای باڵادەست بەسەرهاتی فیرعەونمان بۆ دەگێڕێتەوە، كە چۆن نەوەی ئیسرائیلی دەچەوساندەوە، خوای باڵادەستیش موسا پێغەمبەری (درود و سەلامی خوای لەسەر) نارد بۆ لای فیرعەون، پێی بڵێت واز لەو كارە ناپەسەندانە بێنێت و چیتر نەوەی ئیسرائیل نەچەوسێنێتەوە، وەكو دەفەرموێت: (**أَنْ أَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ، قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ، وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ**

---

[1] علم اصول الفقة، عبدالوهاب خلاف، دارالحدیث القاهرة، چاپی ٢٠٠٣ ل: ٩٤.

[2] اعلام الموقعین، ج ٤/ ٣٧٣، والموافقات، للشاطبی، ١/ ١٩٩.

﴿وَأَنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾[1]. تۆرەمەی ئیسرائیلیێمان ڕەگەڵ بخە، فیرعەون گوتی: تۆ هەرمندالّەکەی نەبووی کە ئێمە پەروەردەمان کردی و چەند ساڵێکیش لەناوماندا مایتەوە؟ ئەوکارەشت کرد کە کردت، دیارە ئەتۆ لە ڕیزی ناسوپاسانی[2]. موسا لەولاّمدا وتی: ﴿وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ﴾[3]. واتە: تۆ منەتی ئەو چاکەیەم لەسەر دەنێی، کە تۆرەمەی ئیسرائیلت هەموو کردووەتە بەندەی خۆت؟![4].

**لە کۆی ئەم دەقە پیرۆزانە دەگەینە دوو ئەنجام:**

ئەنجامی یەکەم: سروشتی دەسەلاّتی خۆسەپێن وایە، بەردەوام ئەوە بەچاوی خەڵکیی و پیاماقوڵ و دەمڕاستەکانی خەڵکیدا دەداتەوە، کە ئێوە بۆچی چاکەکانی ئێمە نابینن؟ هەندێك جار لە ڕێگەی ڕاگەیاندنەکانیانەوە باس لە پالّەوانیەتی نەتەوایەتی و سەرکردەی ڕۆژی تەنگانە و خزمەتگوزارییەکانیان دەکەن، جگە لەوەی لە کۆڕ و کۆبوونەوە تایبەتەکاندا گلەیی و گازەندە لە پارت و لایەنە سیاسیی و سەرۆك هۆزەکان دەکەن، کە ئێوە تەنیا باس لە کەموکورتییەکان دەکەن، ئەی بۆ باسی کارە چاکەکانیشمان ناکەن؟ قابیلە کارێکی باشیشمان نەبێت؟! هەندێك خزمەتگوزاری و پڕۆژەی جۆراوجۆری بچووك کە ئەنجام دراوە بە نموونە دەهێننەوە، وەکو ئەوەی دەسەلاّتداران سەروەت و سامانی ولاّت بەمیراتی بۆ

---

[1] الشعراْ:١٩.

[2] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: هەژار٣٦٧، ل: ٣٦٧ . ١٠٣

[3] الشعراْ: ٢٢.

[4] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی: هەژار: ل: ٣٦٨.

ئەوان مابێتەوە، ئەگەر خزمەتێکی لاوەکیان بە هاوولاتیان کرد بـە چـاویاندا بدەنەوە، کە هەمووی بەراورد بکەیت، لە چـاو داهـاتی ولات و ئـەو هـەموو بەزایەدانی موڵك و ماڵی گشتییە، لە پێناو پارتەکانیان و سەرکردە و خزم و کەس و ئەندامان و دەست وپێوەندەکانیان، هیچ قورساییەکی نییـە، ئـەم بـە چاودادانەوانە زۆر لە قسەکەی فیرعەون دەچێت، کـە دەیویـست لـە بەرانبـە خزمەتێکی بچووکدا لە گەورەترین ستەم چاوپۆشی لێ بکرێت، کە وتی: (**أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ، وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْـتَ وَأَنْتَ مِنَ الْكَافِرِينَ**)[١]. چۆن دەسەلات کاتێك شەرعیەت وەردەگرێت، کە ڕای زۆرینـەی خـەڵك و میللـەتی لەگـەڵ بێـت، بەهـەمان شـێوە کاتێـك خزمەتگوزارییەکانی دەسەلات، دیارە و خەڵکی دڵی پێی خۆش دەبێـت، کـە زۆرینەی داهاتی ولات لە خزمـەت زۆرینـەی هاوولاتیانـدا بێـت، خـۆ ئەگـەر ڕێژەیەکیشی دیار نەبێت، بۆ سەرکردە و پارتەکانیان خەرجی بکەن، خەڵکیی زۆر لەسەردڵی گـران نابێـت، بـەلام بەپێـچەوانەوە، زۆرینـەی داهـاتی ولات، لـەپێناو بەرژەوەندییـەکانی خۆیانـدا بێـت و کـەمێك لـە داهـاتی ولات، لـە هەندێك پڕۆژەدا خەرج بکرێت و خەڵکیی چەوسـاوە و برسـی و ڕەشـوڕووت و بێکـار بێـت، لـە هەمانکاتیـشدا ئـەو خزمەتـە کەمـە، بەچـاوی خەڵکیـدا بدرێتەوە! ئەمە لە گوتار و هەلوێـستی فیرعـەون و دەسـەلاتە خۆسـەپێنەکان دەچـێت و پێویـستی بـە ولامێکـی هاوشـێوەی ولامەکـەی موسـایە (درودو سەلامی خوای لەسەر): (**وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ**) ١.

---

[١] الشعراْ:١٩.

١. ئـەوە چ چـاكەيەكە بـە چـاوميدا دەدەيتـەوە لەكاتێكـدا، كـە نـەوەی ئیسرائیلت کردووە بەکۆیلە؟! لەو حاڵەتەدا خەڵك و جەماوەر، دڵ بـەو جـۆرە خزمەت و چاكانە خۆش ناكەن و بـەوەش لەدەسـەڵات خـۆش نـابن، كـە لـەم حاڵەتانەدا ئەوكەس و لایەنانە دوو هەڵبژاردەیان لەبەردەستدایە، یـان ئەوەیـە هـیچ دیـاریی و هاوكارییـەك لـەو جـۆرە دەسـەڵاتانە وەرنـەگرن، یـان ئەگـەر وەریانگرت بە موڵك و مـاڵی دەسـەڵاتی نـەزانن و چـاو بـەرەو ژێریـان بـن و چاوپۆشی لە ستەم وگەندەڵییەكانیان نەكەن.

ئەنجامی دووەم : هەندێكجار لە نـاو خـەڵك و میللەتـەوە، دەنگێـك بـەرز دەبێتەوە، ڕای وایە ناكرێت ئێمە هەموو ئـەرك و مانـدووبوونێكی دەسـەڵات نادیدە بگرین و چـاومان چـاكەیەكی نـەبینێت؟ ئەمـە لەگـەڵ دادپەروەرییـدا زۆریەكناگرێتەوە، ئەوە نییە خوای باڵادەست دەفـەرموێت: (**وَلَـا تَبْخَـسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ**)[٢]. یـان دەفـەرموێت: (**وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآَنُ قَوْمٍ عَلَـي أَلَّـا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَي**)[٣].

دەبێ ئێمە جیاوازی لە نێوان دوو جۆر چاكەدا بكەین: چاكەیەك كەسێك، یان ڕێكخراوێك، یان پارتێك، وەكوخۆی دەیكات كە ڕەنجی شەخسی خۆیەتی و لەسەر حیسابی هاووڵاتیان نییە، ئەمـە مـافی خۆیـەتی سـوپاس بكرێـت و پێویست ناكات هەڵەكانیشی باس بكرێت، ئەگەر هەڵـەكانی زیـانی بـۆ گـەل وڵات نەبوو مافی خۆیەتی چاكەكانی باس بكرێـت، چـونكە باسـی چـاكەكانی

---

[١] الشعراء:٢٢.

[٢] هود: ٨٥.

[٣] المائدة: ٨.

ئەو، شاردنەوەی مافی هیچ کەسێکی تری تێدا نییە و نابێتە بزمارێك بۆ قایمکردنی جێ پێی ستەم، بەڵام باسی ئێمە لەو جۆرە دەسەڵاتانەیە، لە سەر حیسابی موڵك و ماڵی گشتی چاکە دەکەن و لەهەمانکاتیشدا دەیانەوێت وەکو خزمەتێکی شەخسی ئەنجامی بدەن و بەرهەمەکەی بخەنە سەر پارێزگاری لە پێگە و دەسەڵاتەکانیان، کە لەبیریان چووە دەسەڵات ئەرکی سەر شانیەتی بەبێ جیاوازیی هەموو خومەتێك بە هەموو هاووڵاتیان بکات، هیچ ستەم و زۆرێکیشیان لێ نەکات. کەسایەتی و پارتە سیاسییەکان، لە کاتی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ پایەکانی دەسەڵاتدا، زۆر گرنگە ماوە نەدەن بە خراپی سوود لە پێگەکەیان وەربگیرێت و بەرژەوەندیی گشتیی بکرێت بە قوربانی بەرژەوەندیی شەخسی، یان حیزبی، یان قوتابخانە و ڕێڕەوێك، زۆرجار دەسەڵاتە خۆسەپێنەکان، بەتایبەت ئەوانەی شەرعیەتی گەلیان لەدەستداوە، دەیانەوێ لەباتی ڕازیکردنی میللەت، هاوکاری و خزمەتی سەخاوەتمەندانە پێشکەش بە پیاوماقوڵ و بنەماڵە و کەسایەتییە ئایینی و نەتەوەییەکان بکەن، ئامانجیش بەدەستخستنی پشتیوانی و بێدەنگکردنی، ئەو چین و توێژانەیە کەوا خەڵك گوێیان لێ دەگرێت و دەتوانن شەقام بجوڵێنن. بۆیە قبوڵکردنی هەر جۆرە خزمەتێکی شەخسی لە بری بێدەنگبوون و بێکەسکردنی خەڵکی ڕەشوڕووت، دووجار تاوانە، جارێك لەسەر حیسابی خەڵکییە و جارێکیش بۆ نەهێشتنی نارەزایی ئۆپۆزسیۆن بوون و ڕاوەستان لە بەردەم ستەم و زۆردایە. لەو ولاتانەی کە سیستمی دەستاودەستپێکردنی دەسەڵات هەیە هاووڵاتیان خەڵکێکی هوشیار و چاودێرن بەسەر حکومەتەوە، خزمەتی هاووڵاتیان پێوەری چاکی و خراپی دەسەڵاتە، ئەگەر کەمێك لە

بـەجێهێنانی ئـەرکی سەرشـانی خـۆی کەمتەرخـەم بـوو دوای چـوار سـاڵ لەهەڵبژاردنەکانـدا لەسـەر کورسـییەکەی دەیهێننـە خـوارەوە. خـۆ ئەگـەر گەندەڵیشی هەبوو دوای دادگاییکردنی لەبەندیخانەشی قـایم دەکـەن. هـەموو ئەم ولاٌمانه ڕاڤەی فەرموودەکەی خوای بالاّ دەسته لـەکاتی گفتوگـۆی نێـوان فیرعەون و موسا، که قورئان بۆمانی دەگێڕێتەوە: (**وَتِلْكَ نِعْمَةٌ تَمُنُّهَا عَلَـيَّ أَنْ عَبَّدْتَ بَنِي إِسْرَائِيلَ**) [1].

## ٥. له کوێی بەدەستهێنانی بەرژەوەندییەکانی خەڵکیدان ؟

هیچ تەوژمێك بەتەنیا دوور لەچاکردن و بەرەوپێشبردنی ژیان و گـوزەرانی خەڵك، ناتوانێت قەناعەت بە خەڵك بهێنێت، هەڵگری پەیامەکەین، چـونکە هەموو ئایینەکانیش کە هاتوون بـۆ چـاکردن و ڕێکخـستنی بـاری گـوزەرانی خـەڵك بـووە. هـەموو ئـەوخاوەن پەیامانـەی لـە هـەنگاوی یەکەمـدا، کـە خزمەتکردنی خەڵکە، شکستیان هێنـاوە، مەگـەر ژمارەیـەکی کـەم نـەبێت، ئیتر جەماوەر پێیان سەرسام نەبوون و پەیامەکەیانیان وەرنەگرتووە، ئـالێرەدا جیاوازیی هەندێك لە پێغەمبەران، (درودی خوایان لەسەربێت) لـە هەنـدێکی تریان دەر دەکەوێت، هەموو ئەو پێغەمبەرانەی جەماوەرێکی زۆریان هـەبووە و ژمـارە زۆرەکانیـان تۆمـار کـراوە، ئەوانـە بـوون، لـە کێـشە و خەمـەکانی خەڵکیـدا بـوون و لـە ڕووەکـانی سیاسـی و ئـابووری و سـەروەری مرۆڤـەوە، چاکسازیی باشیان کردووە. ئەمە پرسیارێکە پێویستە ناوبەناو تەوژم و بزاڤـە

---

[1] الشعراء:٢٢.

ئیسلامییەکان لە خۆیانی بکەن، کە ئێمە بۆ هەین؟ لە کوێی ڕووداو و پێشهاتەکاندایین و تاچەند بەشێکین لە چارەسەر؟ بۆیە ئەو شکست و تێکشانانەی ڕوو دەکەنە بەشێك لە بزاڤە ئیسلامی و غەیرە ئیسلامییەکانیش، هۆکارەکانی خودین، هەر وەکولە بڵاوکراوەیەکی ndi لە بارەی ڕێکخستنی پارت و ڕێکخراوەکانەوە هاتووە: هەڵەیەکی پارت و ڕێکخراوەکان ئەوەیە: ئەو هەموو پارە و خۆماندوکردنانەی لە هەڵبژاردنێکی کورتخایەندا، بۆ بەدەستهێنانی دەنگی خەڵکیی خەرجی دەکەن، با ئەوە بۆ ڕێکخستن و چاکردن و تۆکمەکردن و واقیعیبوونی پارتەکانیاندا خەرجی بکەن،[1].

چونکە گەلی هوشیار، حوکم لە سەر ئەوە دەدەن کە دەیبینن، نەك ئەوەی کە دەیبیستن، بۆیە پارت و ڕێکخراوەکان بایی چەنێك لەناخی خەڵکدا هەن، بایی ئەوەندە بوونیان هەیە. ئێستا هەموو دونیای ئیسلامی بەدەست گەندەڵی و دەسەڵاتی خۆسەپێن و زۆر و ستەمەوە دەناڵێنن، لەکاتێکدا هەموو ئەوانەی خاوەنی دەسەڵاتن و کاروباری خەڵکیان بەدەستە پارت و تەوژمە ئیسلامییەکان نین، بەڵکو هەموویان پارت و ڕێکخراوە عەلمانییەکانن، بەکردەوە سەلماندویانە، کە ئەوان لە بەڕێوە بردنی وڵاتدا، سەرکەوتو نەبوون، بەو ئایدیۆلۆژیاو تێڕوانین و ڕێکخستنەی ئەوانەوە، وڵات ناچێت بەڕێوە، بۆیە ئەگەر پارت و تەوژمە ئیسلامییەکان، بەخۆداچونەوەیەکی چاك لە خۆیاندا بکەن، بە جۆرێك گۆڕانکارییەکی بەرچاو

[1] الاحزاب السياسية، والانتقال الى الديمقراطية، ل: ١٧.

و دیار بەرجەستە بکەن، لە قالّبە کۆنەکانیان بێنە دەرەوە، بەشێوەیەك بۆ ناسینەوەیان بوترێت: فلان لایەنی ئیسلامی کۆن، یان تازە؟ بە پلان و بەرنامە کلاسیکییە کۆنەکانەوە خەڵکیی نەدوێنن و بەو شکڵ و شێوەیەی کە جێگەی تەماحی خەڵك نەبوون نەچنەوە ناو خەڵك، بە بەرنامە و پلانی تازەوە گۆڕانکاری بکەن، ئەگەر لایەنە ئیسلامییەکان لەخۆیان ڕادەبینن، ئێستا کاتی پێشکەشکردنی ئەو گۆڕانکارییانەیە، نیشانەی گۆڕانکارییش پێداچوونەوەی خەباتی سیاسی، پەیوەندییە سیاسییەکان و دیبلۆماسیەت و گوتارەکانیانە بەرانبەر بە ناوخۆ و دەرەوە، پارتە ئیسلامییەکان چ هەنگاوێکیان ناوە بۆ چارەسەری ململانێی ئایدۆلۆژی، تا چەنێك هەنگاویانناوە بۆکرانەوە بە ڕووی خەڵکیدا و بازیانداوە بەسەر داخرانی فیکری و حیزبیدا؟ تاچەنێك زەمینەسازیان کردووە بۆلێکتێگەیشتن لەگەڵ پارت و ڕێکخراوە نێوخۆییەکان؟ جاران بۆ قایمکردنی جێپێی خۆیان یەکەم گوتاری پارتە ناسیۆنالیستە عەرەبییەکان، هەڕەشە بوو لە ئیسرائیل و سەنگەرگرتن لە ئەمریکا و ڕۆژ ئاوا و خۆماڵیکردنی نەوت و یەکخستنی گەلی عەرەب بوو، لە بەهاری عەرەبییشدا هەندێك لایەنی ئیسلامی کەوتنە دوبارەکردنەوەی ئەو دروشمانە و بڕینی پەیوەندیی سیاسیی و ئابووری لەگەڵ ئیسرائیلدا، پیاچونەوەی پەیوەندییەکانیان لەگەڵ وڵاتانی ڕۆژ ئاوادا و سەرلەنوێ گۆڕینی خەریتەی سیاسی و ئابووری ناوچەکە بوو! ئێستاش هەرێمی کوردستان بە هەمان ڕێڕەوی گوتارە کۆنەکانی وڵاتانی عەرەبیدا گوزەر دەکات، ئەمانیش جگە لە بەشان و باڵی خەبات و سەروەرییەکانی شاخدا، باس باسی جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ و سەربەخۆیی ئابووریی و

ڕاگەیاندنی دەوڵەتی کوردییە، بۆگەیشتن بەم ئامانجانەش نەفەسدرێژیە لەگەڵ دیموکراسیەت و پەلە نەکردنە لە دیموکراسیبوون و دەستاودەستپێکردنی دەسەڵات و بنەبڕکردنی گەندەڵی و بەسزاگەیاندنی گەندەڵکارانە، ئەم دروشمانە هەموو لە خودی خۆیاندا بەشێکی باشیان لە ڕاستی تێدایە، بەڵام ئەم پارتانە هەموویان پارتی سیاسین و لەچوارچێوەی خەباتی سیاسیدان، وشەی سیاسەت، وەکو لە فەرهەنگ و سەرچاوەکاندا هاتووە: واتای حیکمەت و بەدەستخستنی بەرژەوەندیی و باش بەڕێوەبردنی خەڵك دەگەیەنێت[1]. حیکمەت و سیاسەتیش واتە: نەکردنی، یان دەرنەبڕینی قسەیەك، یان هەڵوێستێك کە لە لۆژیکدا جێگەی نابێتەوە[2]. خۆ ئەگەر پێوەری زانستی بکەین بە محەك، دەبێ بڵێین هەڵوێست دەربڕینی، ئەو جۆرە پارت و سەرکردانە لە سیاسەتدا جێگەی نابێتەوە، سروشتی سیاسەت دەگەڕێتەوە بۆ خاڵێکی جەوهەری کە هێزە، ئەویش بەوە دەبێت هەرکەس بە ئەندازەی لێزانین و حیکمەتی کەسە سیاسییەکانی، پشکی بەر دەکەوێت، بەجۆرێك سوود لە خاڵە بەهێزەکانی خۆی وەربگرێت و هەلیش بدۆزێتەوە بۆ کەڵك وەرگرتن لە خاڵە لاوازەکانی بەرانبەر[3]. بۆیە بوونی هەر پارت و لایەنێك لەسەر ئەوە وەستاوە تا چەنێك دروشمەکانی پێ دەکرێت بەکردار، هەر پارت و لایەنێکیش ئەگەر بیەوێت بەزیندویی بمێنێتەوە دەبێ هەموو هەوڵەکانی بخاتە کار بۆ ئەوەی دروشمەکانی بکات بەکردار، کەواتە زۆر گرنگە کارەکتەرە

---

[1] تاج العروس، الزبیدی، ١/ ٣٩٧٥.

[2] مدخل الی علم السیاسة، د. خالد عابد رسول، ل:٢٨.

[3] سایتی: نقطة یقظة، قواعد ممارسة السیاسة، د. جاسم سلطان، ل: ١٢.

سیاسییەکان، خاڵە لاوازەکانی خۆیان و پارتەکانیان و خاڵە بەهێزەکانیان لێك جودا بکەنەوە، لایەنە ئیسلامییەکان هەرچەند ئەوانیش پارتی سیاسین، بەڵام هەندێك تایبەتمەندییان هەیە جیایە لەلایەنەکانی تر. بۆیە خاڵی لاوازی لایەنە ئیسلامییەکان، جگە لەو خاڵانەی هەموو پارتێکی سیاسی تێیدا هاوبەشە، بەڵام بە حوکمی پاشخانی ئیسلامیبوونیان پێویستیان بە لێکۆڵینەوەی بابەتیانە و ئەکادیمیانە هەیە، پارتە ئیسلامییەکان، جگە لە ڕا و سەرەنجی ئەندامان و کادیرە باڵاکانیان، کە دەبێ لە کۆنگرە و کۆبوونەوەکانی خۆیاندا، گوێیان لێبگرن، لەهەمانکاتدا دەبێ کەسانی پسپۆڕ و ناوەندەکانی ڕاگەیاندن و سەنتەرەکانیش، لەوبارەیەوە حەملەیەکی تەواو بکەن، بەخۆداچوونەوەی لایەنە ئیسلامییەکان بکرێت بە ئەرکێکی دینی و داوایەکی جەماوەری. ئەنجامنەدانی ببێت بە عەیبە، بەسەر پارت و تەوژمە ئیسلامییەکانەوە، ئێستا ئەوە چەسپیوە لاوازترین خاڵی پارتە دەسەڵاتدارەکان، بە هەموو ناونیشانەکانیانەوە، نەبوونی دەستاودەستپێکردنی دەسەڵات و خۆسەپاندن و پیادەکردنی گەندەڵی و نەبوونی خزمەتگوزارییەکانە، بەشێوەیەك هەموو دروشمە میسالییەکانیان کەتوونەتە ژێر پرسیارەوە. بۆیە زۆر گرنگە بۆ لایەنە ئیسلامییەکان کار لەسەر ئەم چەمکانە بکەن، نابێت پارتێکی ئیسلامی بێت، پڕاوپڕ بەخۆداچونەوە و گۆڕانکارییەکان بە باڵای خۆی بگرێت، بەڵکو دەبێ ڕای چاودێران و بەرهەم و پەرێزی بکرێت بە بەڵگە و شایەت، شایەتی یەکەم: کەمکردنەوەی فشارە نێوخۆییەکان و نەمانی ڕای نەیارەکانە و درێژەدانی کەسانی زویر و خاوەن ڕەخنە و چاکسازە، لە ڕیزی پارتەکاندا، شایەتێکی تر

بـــوونی گۆڕانکارییـــە لـــە هەڵوێـــستی جـــەماوەر و چـــاودێران و پارتـــە سیاسییەکاندا، کە ئەمەش سەرەتایەکە بۆ گۆڕانکاری، لە پـلان و بەرنامـەی وڵاتـانی ناوچـەکە و ڕۆژئـاوا، بۆنموونـە ئەگـەر پـێش بـەهاری عـەرەبی، گۆڕانکارییەکان بکرانایە، متمانەی نێوخۆ و دەرەکی دروستبکرایە، زۆر نزیك بوو بەهاری عەرەبی بەم ئاقارەی ئێستادا نەڕۆیشتایە، لـەباتی ئـەو هـەموو خـوێن و ئارەقـە لەوانـە بـوو زۆر بەئاسـانتر تـەواو ببوایـە، کەواتـە لایەنـە ئیسلامییەکان بە پلەی یەکەم بەشێکی باش لە بەر پرسیارێتی ئەو ژاوەژاوەی لەبەهاری عەرەبیدا ڕوویاندا دەکەوێتە ئەستۆی ئەوان.

شایەتێکی تر خۆ دەربازکردنە لە قەیرانی دارایـی نـاوخۆ، شـایەتێکی تـر لەباتی جەوهەرخۆ خەریکنەکردنە بەهەندێك ڕواڵەتی ئیسلامی و دەربازبوونە لێی، شایەتێکی تر بەهێز بوونی ئەو تەوژم و لایەنانەیە کە لەسەر تـرس لـە گەشەکردنی ئیسلامی خۆیان هێشتووەتەوە و بوونەتە متمانـەپێکراوی وڵاتـە خاوەن بەرژەوەندییەکانی ناوچەکە و ڕۆژئاوا.

شایەتێکی تر دەرچونە لە قۆنـاغی پیـادەکردنی پلانـی تـەکتیکی کـورت خایەن، بەڵێ هەندێك جار بە هەڵوێستێکی سیاسـی بۆماوەیـەکی دیـاریکراو هەندێك لەکێشەی ناوخۆ و دەرەوە چارەسەر دەکرێت، بەڵام دەبێ لـەوە دڵنیـا بین پلانی تایبەت بە قۆناغێك بـەکۆتاییهاتنی ئـەو قۆناغـە ئـەویش کۆتـایی پێدێت. سروشتی پلانی تەکتیکی وایـە تـۆ خـاوەنی هـەمووی نیـت، بـەڵکو بەهۆی هەلومەرجێکی تایبەتیەوە کە لایەنێك یان چـەند لایـەنێك دروسـتیان کردووە، ئەو هەلومەرجە دروست بووە، تۆش سوودت لێ بینیوە، بەڵام مەرج نییە ئەم حاڵەتە بەردەوام بێت، لەوانەیە هەر ئەو لایەنانە هەلومـەجێکی تـر

بهێننه پێشەوە، لەبەر ئەوەی تۆ دروستکەری هەلومەرجی یەکەم نەبوویت، هەرچی ڕێسراوی تۆ هەیە بیکەنەوە بە خوری. بۆیە نابێ چاوەڕوان بن بەهەندێك هەڵوێستی کاتیی هەموو دەرەنجامەکان پۆزەتیڤ بن و خێر و بەرەکەت بباریت بەسەریاندا، گۆڕانکاریی و بەخۆداچونەوە دیاردەیەکی لۆژیکیە، تا سەرەتایەکی ڕێکوپێکی نەبێت، ئەنجامێکی ڕێکوپێك نادات بەدەستەوە، بەواتایەکی تر ئەگەر لایەنێکی ئیسلامیی لە قەناعەتی خۆیدا گۆڕانکاری کرد، بەڵام ئەنجامی نەدا بەدەستەوە، ئەوە کەموکورتی لەگۆڕانکارییەکەدا هەیە، چونکە ئەوەی پەیوەندی بە بەڕێوەبردنی ژیانی خەڵکەوە هەیە، هەمووی هۆ و هۆکارە (السبب والمسبب)، ناکرێت خۆر هەڵبێت بەڵام ڕووناکی نەبێت، یان ئاگر هەبێت بەڵام گەرمی نەبێت، خۆ ئەگەر وابوو ئەوە کەموکورتییەکە لە دارێژەرانی پلانەکاندایە بۆیە لەو کاتەدا ئەبێ بیر لە گۆڕینی خەریتەی ئەو پارتە ئیسلامیانە بکرێتەوە کە ڕەنگرێژی ئەو پلان و بەرنامانەن، چونکە لەوانەیە پارتە ئیسلامییەکان بەم قاڵب و پێکهاتەیەی ئێستا تەحەمولی گۆڕانکارییەکی بەرچاو نەکەن، ئەوان تەنیا بەهەندێك گۆڕانکاری بچووك واز بێنن.

## ٦. خۆ بەدورگرتنی لایەنە ئیسلامییەکان لەخۆبەخاوەنکردنی هەڵە مێژووییەکان.

مێژووی مسوڵمانان خاڵی نیگەتیفی زۆری تێدایە کە لەم سەردەمەدا باس دەکرێن، جێگەی داخ و خەفەتە، بەڵام بەحوکمی ئەوەی بەشێکە لەمێژووی مسوڵمانان لایەن و تەوژمەعەلمانییەکان وا ئەزانن ئەوە بەشێکە لە هزری

ئیسلامی هەر ڕۆژێك مسوڵمانەكان دەسەڵاتیان پەیدا كرد بەهەمان ڕێتمدا دەڕۆنەوە، بۆیە پێویستە ڕوونكردنەوە لەسەر ئەو تێبینی و ڕەخنانە بدرێت، كە ئەوانە بەشێك نین لە بنەما ئیسلامییەكان لەهەموو قۆناغێكدا مسوڵمانان لێی بەرپرسبن، وەكو: چەمكی دەسەڵاتی خۆسەپێن، یان ئەو ڕفتارانەی هەندێك لەدەسەڵاتدارانی مێژووی ئیسلامی پێی هەستاون، یان ڕای زاناكانی سیاسەتی شەرعی، كە بەپشتیوانی خوا هەر یەك لەو سێ خاڵە باس دەكەین:

**أ- چەمكی دەسەڵاتی خۆسەپێن (ولایة المتغلب)**

لە بواری گفتوگۆ و لێكتێگەیشتنی نێوان لایەنە ئیسلامی و عەلمانییەكان، ئەركێكی تری تەوژمی ئیسلامی ئەوەیە مێژووی سەدان ساڵەی حوكمڕانی مسوڵمانان، پڕە لە دەسەڵاتی خۆسەپێن، كە بە زەبری هێز دەسەڵاتیان وەرگرتووە و تا شمشێریشیان بڕی كردبێت، حوكمڕانیان كردووە، كێشەی گەورەی بەشێكی زۆری شارەزایانی سیاسەتی شەرعی و زانایانی جیهانی ئیسلامی دیاریكردنی كەسی یەكەم (خەلیفە) بووە، كە بە چ میكانیزمێك شەرعیەت وەردەگرێت، لەو سەردەمەدا سێ ڕێگا هەبووە بۆ دانانی كەسی یەكەم، كە زانایانی ئیسلامی لەناچارییدا شەرعیەتیان داوە بە هەرسێ ڕێگاكە.

ڕێگای یەكەم: هەڵبژاردنی كەسی یەكەم، لە ڕێگەی ئەهلی حەل و عەقدەوە، هەندێك لەزانایان هەڵبژاردنی كەسی یەكەمیان لە ڕێگەی ئەهلی حەل و عەقدەوە، كردووە بە مەرج، بەڵام ئەو زانایانە لە دیاریكردنی ژمارەی ئەهلی حەل و عەقدا سەریان لێ تێكچووە، هەندێكیان دەڵێن دەبێ

ژمارەکەی پێنج کەس بێت، هەندێکی تریان دەڵێن زیاتر یـان کـەمتر بێـت[1]. ئیمامەکانی: حەرەمەین، ئامیـدی، جـوەینی، جورجـانی، ئیمـامی نـەوەوی، ئیمامی شافیعی، ماوەردی و شەوکانی، هیچ مەرجێکیان دانەناوە، بۆ بـوون بەسەرۆك (خەلیفە)، ئمامی شەوکانی لە ئیرشـاد الفحولـدا دەڵێـت: هـاوەڵان ئەبووبەکریان دیاری کرد وەکو خەلیفە، خیلافەتەکەی دامەزارا بـە کـۆدەنگی ئامـادەبوان، کـە هـەیانبوو لـە دەرەوەی مەدینـە بـوو. ئیمـامی نـەوەوییش دەڵێت: ئەوەی ڕاستی بێت، ئیمامەت بە بەیعەتی ئامادەبوان لە ئەهلی حـەل و عەقد، دا دەمەزرێت،[2].

ڕێگـای دووەم: دانـانی کەسـی یەکـەم (خەلیفـە) بـە وەصـیەت لەلایـەن کەسێکی ترەوە، وەکـو بەغـدادی لـە (الفـرق بـین الفـرق)دا دەڵێـت: کەسـێك دەتوانێت خیلافەت بسپێرێت بە کەسێکی شایستە و پێـشی دادەمـەزرێت،[3]. ئیبنوحـەزم لـە کتـێبی (الملـل والنحـل)دا دەڵێـت: دانـانی خەلیفـە لەلایـەن خەلیفەی مردووە زۆر چاکترە[4].

ڕێگای سێیەم: دەستگرتن بەسەر دەسەڵاتدا بە زەبری هێز، ئەبوو یـەعلای فەرا دەڵێت: ئیمـامی ئەحمـەد وتویـەتی: کەسـێك بـەزەبری شمـشێر دەسـتی بەسەر دەسەڵاتدا گرت، بە گەورەی ئیمانداران و خەلیفەی مسوڵمانان ناسـرا، دروست نییە بۆ کەسێك باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێت، ڕۆژ بکاتەوە و

[1] الشرعية السياسية، عزام التميمي، ل:١٢.

[2] سەرچاوەی پێشو، ل:١٢.

[3] سەرچاوەی پێشو، ل: ١٢.

[4] سەرچاوەی پێشو، ل: ١٣.

ئەو کەسە چاك بێت یان خراپ بێت، بە ئیمامی خۆی نەزانێت[1]، تا وای لێهاتووە هەندێك لە شەرعزانەکان، هەڵوێستی خۆیان لە وشەیەکی کورتدا کۆکردووەتەوە کە وتویانە: کەسێك جێپێی خۆی قایم کرد واجبە گوێڕایەڵی بکرێت[2]. ئەم میکانیزمانە، پێچەوانەی دەقە شەرعییەکانن، کە فەرمان بەدادگەری دەکەن و ڕێگری لە ستەم و زۆر دەکەن و پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر بێت) و کرداری خەلیفە ڕاشیدەکانیشە، هەروەها یەك ناگرنە وە لەگەڵ سیستمی دیموکراسیشدا، کە ئەمڕۆ وەکو سیستمێکی حوکمڕانی لە جیهاندا جێگەی خۆی کردووەتەوە، بنەما ئیسلامییەکان و سیستمی دیموکراسی یەکدەنگن لەسەر ڕەتکردنەوەی وەرگرتنی دەسەڵات بە ڕێگەی هێزوکودەتا، لە سیستمی دیموکراسیدا سەڵاحیەتی سەرۆك دیاریکراوە و دەسەڵاتەکان لێکجودا کراونەتەوە و ماوەی سەرۆکایەتی دیاریکراوە، لە هەمانکاتدا، دەبێ ئەنجومەنی نوێنەران لێپێچینەوە لەگەڵ سەرۆك بکات، کەسی یەکەم لەسەر ڕەزامەندی زۆرینەی خەڵك، یان پەرلەمان دیاری بکرێت، دەبێ ئۆپۆزیسۆن هەبێت و مافیشیان پارێزراو بێت،[3]. هەندێك ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەکەن بە بەڵگە لەسەر بێدەنگی بەرانبەر ستەمی دەسەڵاتدارەکان، کە دەفەرموێت: (**سَتَكُونُ أُمَرَاءُ فَتَعْرِفُونَ وَتُنْكِرُونَ فَمَنْ عَرَفَ بَرِئَ وَمَنْ أَنْكَرَ**

---

[1] سەرچاوەی پێشو، ل:١١.

[2] سەرچاوەی پێشو، ل:١١.

[3] سەرچاوەی پێشو، ل: ١٣.

سَلِمَ وَلَكِنْ مَنْ رَضِيَ وَتَابَعَ قَالُوا أَفَلاَ نُقَاتِلُهُمْ قَالَ: لاَ مَا صَــلَّوْا)[1]، واتـه: سەرکردە پەیدا ئەبن کاری چاکیان لێ ئەبینن وکاری خراپیشیان لێ ئـەبینن، هەرکەسـێك هەڵـەکانیان بناسـێت ئـەوە ڕێگـەی بەرائـەتی دۆزیوەتـەوە، وەهەرکەسـێك ملکەچـی خراپـەکانیان نـەبێت، ئـەوە سـەلامەتە لەخراپـەو تاونیان، بـەڵام ئـەو کەسـە تاوانبـارە ڕازی بێـت بـە خراپـەکانیان وشـوێنیان بکەوێت، ووتیان ئەی شەڕیان لەگەڵ نەکەین؟ فەرموی نا تا نوێژ بکەن.

ئەم فەرموودەیە ڕێنمایی ئەوەمان دەکات کە: جگە لەبەکار هێنانی چـەك بەشێوەی مەدەنیانە و دوور لە توندوتیژی هەموو ڕێگەیەکی تر بگیرێتـە بـەر بۆ گۆڕینی دەسەڵات، وەکو: چوون بەگـژ خراپەکانیانـدا، نـاڕەزایی دەربـڕین بەرانبەریان، ملکەچنەکردن بۆیان، لەیەککاتـدا ڕێگـەی داوە بـە زەبـری هێـز دەسەڵات بگوڕدرێت، ئەویش ئەوکاتەیە کە سەرۆکی مسوڵمانان نوێژ ناکات، ئەوە لەو کاتەدا کۆڕایی هەیە لـەنێو مـسوڵمانانـدا، بـە هـیچ پاسـاوێك هـیچ مسوڵمانێك پشتیوانی لەوجۆرە سـەرۆکانە نەکـەن، ئـەویش ئەوکاتەیـە کـەوا سەرۆکی مسوڵمانان نوێژ ناکات، لەوکاتەشدا کە ڕێگە بە بـەکارهێنانی هێـز دراوە، چـونکە ئەگـەری خـوێنڕژان زۆر کەمــە، لەبـەر ئـەوەی سـەرۆك لــە ئیسلامدا واتایەکی ئـایینی هەیـە هـیچ مـسوڵمانێك ڕازی نییـە گەورەکـەی نوێژنەکـەر بێـت و ئەرکـە دینییەکانیـشی بـۆ بەئـەنجام بگەیـەنێت، ئـەم فەرموودەیە تێگەیشتنی پێچەوانەی لێ وەرناگیرێت، کە هەر نوێژ بکات ئیتر چەنێك ستەم و زۆربکات و دور بێت لە دادگەرییەوە قەینـەکات و چاوپۆشـی

[1] صەحیحی موسلیم، ٦/٢٣/ ٤٩٠٦.

لێ بکرێت، هەر ڕێگەیەکی گۆڕانکاری بەرژەوەندی خەڵکی تێدا بەدی بکرێت و زیانی کەمتر بێت لەقازانجی، ئەوە لە ئیسلامدا ڕێگە پێدراوە. هەموو ئەو میکانیزمانەی کە بەناچاری و وەکو ئەمری واقیع لە مێژووی ڕابوردووی مسوڵمانانندا کاری پێکراوە و زانایان و بیرمەندانی جیهانی ئیسلامیش هەریەکەیان لەو کاتەدا، بە دەر بڕینێك پشتیوانیان لێکردووە، ئەوە نابێت بە یاسا و ڕێسا، بۆجیهانی ئیسلامی تا قیامەت لەسەری بڕۆن، ئەو جۆرە حوکمڕانیە دەرچونە لە سیستمی حوکمڕانی ڕەسەنی ئیسلامی و پێچەوانەیە لەگەڵ ڕێنمایی و فەرمانەکانی خودا و پێغەمبەر و ڕێڕەوی خەلیفە ڕاشیدەکان، بۆیە هەموو ئەو ئیشکالە مێژووییانەی لە سیستمی حوکمڕانی ئیسلامیدا، ڕوویانداوە ئیستا بە ئەزموونی مرۆڤەکان و میکانیزمەکانی حوکمڕانیی سەردەم چارەسەر دەکرێت، نابێ هەڵگرانی گوتاری ئیسلامی بەهیچ شێوەیەك خۆیان بکەن بە خاوەنی ئەو سیستمە حوکمڕانیانە، بەڵکو ئەوە ڕووداوێك بووە، ئیسلام وەکو بەرنامە و سیستم، مسوڵمان و بزاڤە ئیسلامییەکان لەومێژووە بەرپرسیارنین، چۆن لەو سەردەمەدا مسوڵمانان ئەو ڕێگەیەیان پێ پەسەند بووەو هەڵیان بژاردووە، ئەمڕۆش ڕەوت و بزاڤە ئیسلامییەکان لەژێر ڕێنمایی و چاوساغی شارەزایان و بیرمەندانی جیهانی ئیسلامیدا جارێکی تر چاوخشاندنەوە بە سیستمی حوکمڕانی ئیسلامیدا دەکەن، ئەو سیستمە هەڵ دەبژێرن، کە لەگەڵ سیستمی حوکمڕانی سەردەمیانەدا تێك نەگیرێت و خزمەت بەمەبەستە شەرعییەکان و کۆی مسوڵمانان بەتایبەتی و مرۆڤایەتی بەگشتی بکات، ئەمە پەیامی ئێمەیە بۆ دەستە و تەوژمە عەلمانیی و چەپەکان و ناسیۆنالیستەکان.

## ب- ڕەخنە گرتن لە ئیسلام و مێژووی مسوڵمانان

لەکاتی گفتوگۆ و ڕاگۆڕینەوەمان لەگەڵ تەوژمە عەلمانییەکاندا، نابێ ئەوەندە هەستیار بین بەرانبەر بەو ڕەخنانەی لە مێژووی مسوڵمانان دەگیرێن، نابێ بیر و باوەڕی ئاینی و مێژووی مسوڵمانان تێکەڵ بە یەك بکەین، لەکاتێکدا کەسێك ڕەخنە لە مێژووی مسوڵمانان دەگرێت، بە بێ بیرلێکردنەوە، لەوەی ئەو ڕەخنەیە لەجێگەی خۆیەتی یان نا؟ یان ڕەخنەکە بێ بنەمایە و لە تێڕوانینێکی ئایدۆلۆژی دژ بە دینەوە هەڵقولاوە؟ موومان گرژ دەبێت و دەماری ملمان ئەستوور دەبێت، هەندێك پەرچەکرداری توندمان دەبێت، خۆ ئەگەر تەماشای چۆنیەتی هەڵسوکەوتی، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بکەین، دەبینین ڕەخنەگرتن، لە خودی دینەکەش زۆر بەسانایی تەماشا کراوە، هەروەکو جارێك مەسیحییەکانی نەجران لە کاتی گفتوگۆیان لەگەڵ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەربارەی عیسی (سەلامی خوای لەسەربێت)، کە بەخوایان ناو دەبرد، بەڵام پێغەمبەر، ڕووی لێ گرژ نەکردن، بەڵکو بە بەڵگە وەڵامی دەدانەوە، [1].

ئەبو ئەعلای مەودودی[2] دەڵێت: لە دەوڵەتی ئیسلامیدا شوێنکەوتووی ئایینەکانی تریش، بەبێ جیاوازی، وەکو مسوڵمانەکان ئازادی دواندن و نووسین و ڕادەربڕین و بیرکردنەوە و کۆڕوکۆبوونەوە و ئاهەنگ گێڕانیان هەیە،

---

[1] الطبقات الکبری، ابن سعد، چاپی یەکەم، بەیروت، ٣٥٧/١.

[2] لە: ١٩٠٣ لە دایکبووە، بنیاتنەری کومەڵی ئیسلامی پاکستانە، ئەندامی زانکۆی ئیسلامیە لە مەدینەی درەوشاوە، ئەندامی دامەزرێنەری ڕابیتەی جیهانی ئیسلامیە، .www.geocitis.com

لـەم بابەتانـەدا کـۆت و بەنـدی سـەر ئـەوانیش، وەکـو کـۆت و بەنـدی سـەر مسولّمانەکانە، بۆیـان هەیـە لـە چوارچـێوەی یاسـادا، ڕەخنـە لەدەسـەلاّت و کاربەدەستان بگرن، چۆن مـسولّمانان دەتـوانن ڕەخنـە لـە ڕێـڕەو و ئـایینزا ئیـسلامییەکان بگـرن، ئـەوانیش دەتـوانن ڕەخنـە لەئیـسلام بگـرن، دەبـێ مسولّمانانیش لە چوارچێوەی یاسادا ڕەخنە لە ئـەوان بگـرن، هـەروەکو ئـەوە ئەرکی غەیرە مسولّمانەکانیشە، تەواوی ئازادی ئەوەیان دەبێت بەشان و باڵی ئایینەکەیانـدا هەڵبـدەن،[1]. دیـارە مەبەسـتی ئـەبوو ئـەعلا ئەوەیـە دەرگـای گفتوگـۆ لەگـەڵ هـەڵگری ئاینـەکانی تـردا کراوەیـە، وەکـو چـۆن ڕێـڕەوە ئیسلامییەکان لەنێوخۆیاندا، ئاساییە ڕەخنە لەیەکتر بگـرن، ئـەوانیش بۆیـان هەیە ڕەخنە لە ئیسلام بگرن، ئـەوە بـەڕێوەبردنی جیاوازییەکانـە. ئەگـەر لـە دەقە ئیـسلامیە ڕاسـتەکان ورد ببینـەوە، دەقێـك یـان ئاماژەیـەك نابینیـت، سووکایەتی بە ئایین و ئایـدیا جیاوازەکـانی تێـدا بێـت، بـەلاّم گرفتەکـە لـەم پرسیارە و وەلاّمی ئەم پرسیارەدایە، ئایا مـسولّمانەکان ئاسـتی هوشـیارییان گەیـشتووە بـەو ئاسـتەی بـە ڕێکـوپێکی لـە چوارچـێوەی ئـەم دەقانـەدا، هەڵسوکەوت لەگەڵ جیاوازییەکاندا بکەن؟ ئـەو ئازادیـەی ئـەمڕۆ هـەڵگرانی بیری دیموکراسیەت بانگەشەی بۆ دەکەن زیاتر لە هەزار ساڵە، خوای بالاّ دەس بۆ پێغەمبەری (دروودی خوای لەسەر) ناردووە، کـە دەبـوو مـسولّمانەکانیش لەو چوارچێوەیەدا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ غەیری خۆیاندا بکردایە، خـۆ ئەگـەر بڵێین ڕاستە ئـازادی ڕادەربـڕین، بنەمایـەکی گرنگـە لـە هـزری ئیـسلامیدا،

---

١ نظرية الاسلام وهديه، فى السياسة والقانون الدستورى، ل: ٢٩٩.

ئەوکاتە دەبێ بیسەلمێنین، مسوڵمانەکان لە ئاستی ئیسلامدا نین! وە دەبێ لامان ئاسایی بێت، لە پراکتیزەکردنی بنەما تیۆرییەکاندا سوود لە گەلانی تر ببینین و بزانین ئەوان چۆن بنەما تیۆرییە جوانەکانیان لە ژیانی خۆیاندا کردووە بەکردار، ڕاستە ئێمە وەکو باوەڕ و قەناعەت مسوڵمانین، بەڵام هیچ نەنگیەکی تێدا نییە ئەگەر نەتەوە و خاوەن ئایین و ئایدیاکانی تر، لەئێمە جوانتر پەیوەندییە مرۆڤایەتییەکانیان ڕێکخست بێت، ئێمەش لەجێبەجێکردنیاندا چاویان لێ بکەین!. هەموو ئەمانە ئەوەمان پێ دەڵێن: ئێمەی مسوڵمان لە ئێستادا دوو ئەرکمان هەیە:

ئەرکی یەکەم: هەڵوێستە لە سەر هەموو دەقەکانی قورئان و فەرموودە بکەین و تێیان ڕامێنین و خوێندنەوەیەکی سەردەمیانەیان بۆ بکەین، وەکو ئەوەی ئێستا ئەو ئایەتانە هاتبێتنە خوارەوە، هەموو ئەو چڵك و چەپەڵیانەی بە درێژایی مێژووی زیاتر لە هەزار ساڵی ڕای زاناکان و هەڵسوکەوتی دەسەڵاتدارانی مێژووی مسوڵمانەکان پێوەی لکاوە، لێی بکەینەوە.

دووەم: کاری چاك و پڕشکۆ مولکی هەموو مرۆڤەکانە، پێمان شەرم نەبێت هەرگەل و نەتەوەیەك بەجوانی لەژیانی خۆیاندا ڕاڤە و پیادەیان کردبوو ئێمەش چاویان لێ بکەین، با تەماشای هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) بکەین، کەسانی وەکو عەبدوڵڵای کوڕی عەباس و عومەری کوڕی خەتاب، (خوالێیان ڕازی بێت) وە هەندێك لە هاوەڵانی تریش، مانای هەر ئایەتێکیان لێ عاسێ ببوایە، کە لەتەوراتدا هەبووە، جگە لە عەقیدە و ئەحکام و ئەو بابەتانەی تێکگیران لەگەڵ قورئاندا دروست ناکات، وەکو:

بابەتە مێژوویی و بەسەرهاتەکان، دەگەڕانەوە بۆلای خاوەن کتێبەکانی تر، بەتایبەت جوولەکەکان، پرسیاریان لەوان دەکرد، لە زمانەوانیشدا دەگەڕانەوە بۆ شیعری جاهیلی، کە پێش هاتنی ئیسلام گوتراون، تا لەو سەرچاوانەوە، مانای ئایەتەکان وەر بگرن، ئەم دوو سەرچاوەیە، بەیەکێك لەسەرچاوەکانی ڕاڤەکردنی قورئان دادەنرێت [1].

**ت- جیاکردنەوەی ڕای زاناکانی سیاسەتی شەرعی لە ئیسلام وەکو دین**

هەنگاوێکی تر کە ئەرکی سەر شانی ڕەوتە ئیسلامییەکانە لێکردنەوەی جیاوازییەکانە لە خۆیان و گەڕان بەدوای خاڵە هاوبەشەکانی نێوان شارستانیەتەکان و ئەزموونی مرۆڤەکاندا، ئاوێتەکردنی لەگەڵ بنەما مرۆڤ دۆستەکانی ئیسلام وەکو: ڕاوێژکردن و ڕێزگرتنی مرۆڤ و دادگەری و سەروەریی یاسا و یەکسانی، کار و پرۆژەی بزاڤە ئیسلامییەکان تەنیا بە ناو و ناونیشان پیرۆز نابن، بەڵکو بە ئەنجامدانی کاری پیرۆز پیرۆز دەبن، هیچ ڕێڕەوێك، یان قوتابخانەیەك، یان بنەماڵەیەك، یان پارتێك، خاوەنی ئیسلام نییە، هەموو مسوڵمانان بۆ چارەسەری کێشە جۆربەجۆرەکانیان، دەتوانن سوودی لێ بینن، بۆیە ئیسلام جیاوازە لە ڕای هاوەڵان و زانایان و موجتەهید و بیرمەند و پارت و ڕێکخراوەکان، ئیسلام پێوەرێکە، کرداری مرۆڤەکانی پێ بەراورد دەکرێت، ئەوەی لەگەڵ ڕاستیی ئیسلامدا یەکی گرتەوە ئەوە قبوڵە، ئەوانەش پێچەوانەی بوون، ئەوە هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە، ئەوانەی ناونیشانە ئیسلامییەکان بەخۆیانەوە دەلکێنن، بەڵام کردارەکانیان لەگەڵ ئسلامدا یەکناگرنەوە، دووجار تاوانبارن، جارێك تاوانبارن کە هەڵەیان کردووە، جارێکی

[1] التفسیر والمفسرون، د. محمد حسین الذهبی، ١/٦٦- ٦٩- ٧٠.

تـریش تاوانبـارن کـە ئیـسلامیان ناشـیرین کـردووە. ئەوکەسـانەی ئیجتیهـاد لەمەسەلەیەکدا دەکەن، بەڵام ناپێکن ئەوانە پاداشتی ماندوبوونەکەیان هەیـە، بەڵام ئەوانەی بە کرداری هەڵە ئەبنە هۆی ناشیرینکردنی ئیـسلام، وەکـو خـوای گەورە باسی هاوسەرەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) دەکـات: (**يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ**)[1]، ئەوە دووجار تاوانبارن، بۆیـە هێمـا و ناونیشان و ڕواڵەت و شارەزابوون لە زانستە ئیسلامییەکان و بایەخدان بە بـە ڕەنگ و ڕوو و ڕواڵەت و سیما و بوونی پاشگری لایەنە ئیسلامییەکان، پێوەری ڕاستیی بزاڤە ئیسلامییەکان نین، هـیچ پیرۆزییـەکیش بـەو ڕەوتانـە نابەخـشن، بـەڵکو پـیرۆزی لـە خزمـەت و پێکـانی ڕاسـتی و ئامانجەکاندایـە، تـا چـەنێك ناوەرۆکی پلان و بەرنامەکانیان لەگەڵ مەبەستە شەرعییەکاندا یەك دەگرنـەوە. مسوڵمانان ئـەرکی سەرشـانیانە پارێزگـاری لـە ئیـسلام بکـەن، ئیـسلام وەکـو سەرچـاوە جـێگیر و نـەگۆڕەکان، کـە قورئـان و سـوننەتە ڕاسـت و ڕەوانـەکانی پێغەمبــەرە (دروودی خـوای لەسـەر) لای ئیمانـداران پـیرۆزە و بـە سەرچـاوەی دینەکەیانی دەزانن، هەموو مسوڵمانانیش بـەبێ جیـاوازی لـە بەرانبەریـدا لـە ئـەرك و مافـدا یەکسانن، خـوای باڵادەسـتیش گـرەنتی پاراسـتنی داوە، وەکـو دەفەرموێت: (**إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ**)[2]، ئیتر جگە لـەو دووانـە ئەوە ڕا و سەرنجی مسوڵمانەکانە و ئیسلام وەکو ئایین و بەرنامـەی خـودا، لێـی بەرپرسیار نییە.

---

[1] الاحزاب: ٣٢.

[2] : الحجر: ٩.

## ٧. گەڕان بە دوای پلان و میکانیزمی سەردەمیانەدا.

**دەستپێك:**

لە پێکەوەژیاندا زۆر گرنگە لە بە ئەنجام گەیاندنی ئەرکەکانماندا لە ڕیزی سەرکەتووەکاندا بین، لە پێشی خەڵکییەوە دەست بگەیەنین بە میکانیزمەکانی سەرکەوتن، ئەمەش بەوە دەبێت هیچ ئەرکێك لە دینداری جیا نەکەینەوە، کارە دینییەکان لە مزگەوت و شوێنە تایبەتییەکانی خۆی ئەنجام بدەین، ئەرکە دونیاییەکانی وەکو بەڕێوەبردنی دەوڵەت و پارتەکان و ڕێکخراوەکان و کاروباری سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی بە دینداری نەزانین و لە چەمکە دینییەکانەوە بۆی نەڕوانین، ئەمەش بەوە دەبێت هەرکەسێك بەرپرسیاریەتێکی کەوتە سەرشان، ئەرکێتی کاتەکانی تەرخان بکات، بۆ ئەوەی بەتەواوەتی مافی بەرپرسیاریەتیەکەی بدات، خۆی بپارێزێت لە هەر کار و پرۆژەیەکی تر کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم پێشخستنی ئەرکی بەرپرسیارێتیەکەیدا، ئەگەر ئەو ئەرکەی لە سەر شانیەتی بەتەواوەتی بەجێی هێنا، ئەوکاتە دەتوانێت هەندێك لەکاتەکانی بە پرۆژە و بەرنامەی نمرە دوو و لاوەکی ترەوە خەریك بکات، چونکە بۆ سەرکەوتن لەکاردا زۆر گرنکە ئەرکەکانت پۆلێن بکەیت و دیارییان بکەیت کامیان کاری پلە یەکە و کامەشیان کاری پلە دوو و پلە سێیە، (**مَا مِنْ أَمِيرٍ يَلِي أَمْرَ الْمُسْلِمِينَ ثُمَّ لاَ يَجْهَدُ لَهُمْ وَيَنْصَحُ إِلاَّ لَمْ يَدْخُلْ مَعَهُمُ الْجَنَّةَ**)[1]. واتە: هەربەرپرسێك

---

[1] صەحیحی موسلیم، ١/٨٨/ ٣٨٣.

کاروباری مسوڵمانانی کەوتە دەست و پاشان کەمتەرخەمی کرد و دڵسۆزی تەواوی بۆ نەنواندن، ئەوە بە دڵنیاییەوە لەگەڵیان ناچێتە بەهەشتەوە.

جگە لە بەرپرسیاریەتی سەرەکی، یان کاری پلە یەك، ئەوانی تر هەموویان بەکاری لاوەکی تەماشا بکات، بەگرنگ تەماشاکردنی بەرپرسیاریەتی، بەتەنیا تایبەت نییە بە لێپرسراوی دەوڵەت، یان پارتێك، بەڵكو لێپرسراویەتییەکان، لە سەرۆکی دەوڵەتەوە، تا بە ڕێوەبردنی پارتێك، یان سەرۆك خێزانێك بە شێوەیەکی ڕێژەیی دەگرێتەوە، مەبەستمان لەم پێشەکیەش بەگرنگ تەماشاکردنی لێپرسراویەتیە تا هەوڵی پێویست بدرێت بۆ بەرەو پێشبردنی، لێرەشەوە بە پشتیونی خوا دەچینە ناوبابەتەکەمانەوە:

گەڕان بە دوای میکانیزمەکانی سەرکەوتندا. کە هەموو شەو و ڕۆژێك مسوڵمانان زیاترلە١٧ جارلەنوێژەکانیاندا ئەپاڕێنەوەودەڵێن: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**)، موجاهید کە یەکێکە لەڕاڤەکارانی قورئان دەڵێت: واتە ڕاستیمان پیشان بدە، ئیبنوکەسیر لە وڵامی پرسیارێکدا کە: چۆن دەبێت ئیماندار لە نوێژ و غەیری نوێژدا، بەردەوام داوای ڕێنمایی بکاتەوە؟ ئایا ئەمە بەدەستهێنانی شتێك نییە کە خۆی بە دەست هاتووە؟ لە وڵامدا وتی: نەخێر ئەگەر لە شەو و ڕۆژدا ئیمانداران پێویستیان بەگەڕان بەدوای ڕێگەی ڕاستدا نەبوایە، خوای باڵا دەست ڕێنموونی نەدەکردن داوای بکەن؟ چونکە بەندەکانی خودا لە هەموو کات و ساتێکدا، پێویستیان بە خودایە لە سەر ڕێگەی ڕاست دامەزراویان بکات و بەرچاو ڕۆشنیان بکات تا بەردەوام بن

لەسەری،[١]. هەندێك لە ڕاڤەكارانی تـری قورئـان دەڵـێن: (**اهْــدِنَا**) بـەمانای ڕونكردنەوە و ڕێپیشاندان دێت، (**اهْدِنَا الــصِّرَاطَ الْمُــسْتَقِيمَ**)، واتـە ئـەی پەروەردگارا، لە كارەكانماندا ڕێگەی ڕاستمان پیشان بدە،[٢]، ئەو ڕایەش هەیـە كە مەبەست لە ڕێگەی ڕاست: پێكانی ڕاستیە. [٣].

(**صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْــتَ عَلَــيْهِمْ**)[٤]، ئیبنومـەنزوور دەڵێـت: (**النعــيم، والنعمي، والنعماء، والنعمة،**) هەموویان بە مانـای خۆشـگوزەرانی و بـوونی ماڵ دێن، كە دژەكەی: هەژاریی و كەمدەرامەتیـە[٥]، و (**نعمة العيش حسنة، ونعمة الله منَّه وعطائه**)[٦]، كە لێرەشدا هـەر بـەمانای ژیـانی خـۆش هـاتووە، ڕاڤەكارانی قورئانیش دەڵێن: (**أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ**) واتە هەموو ئەو دەستكەوت و مەنفەعەتانەیە كە شایەنی شوكركردنە[٧]. هەنـدێك لەڕاڤـەكارانی تـر دەڵـێن: مەبەست لە ڕێگەی ڕاست، ڕێگەی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەكان و پیاوچـاكانە،[٨](**وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَــيْهِمْ**

---

[١] تفسيرابن كثير، ١/ ١٤٠.

[٢] التفسيرالوسيط، محمد سيد طنطاوى : ٧/١.

[٣] تفسير ابن كثير، ١/ ١٣٩.

[٤] الفاتحة:٧.

[٥] لسان العرب، باب: نعم، ٥٧٩/١٢.

[٦] تهذيب اللغة، الازهرى، باب نعم، ١/ ٣٠٨.

[٧] احمد بن محمد الهائم المصرى، دارالصحابة، قاهيرة چاپى يەكەم، ٥٢/١. التبيان، فى تفسير غريب القران،

[٨] تفسيرالثعاليبى، ٣٢٦/١.

**مِنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَئِكَ رَفِيقًا** [1].
ئیمامی زەمەخشەریش دەڵێت: هەر کاتێك (انعام) بە ڕەهایی هاتبوو نەبەسترابوو بە شتێکی دیاریکراوەوە، ئەوە هەموو نیعمەتێکی مادی و مەعنەوی دەگرێتەوە [2].

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) لە فەرموودەیەکی قودسیدا، دەفەرموێت خوای بالادەست دەفەرموێت: (**قَالَ اللَّهُ تَعَالَى قَسَمْتُ الصَّلاَةَ بَيْنِي وَبَيْنَ عَبْدِي نِصْفَيْنِ فَنِصْفُهَا لِي وَنِصْفُهَا لِعَبْدِي**) [3].

ئیبنوعوسەیمین دەڵێت: سێ ئایەتی یەکەمی سورەتی فاتیحا، بۆ خودایە و سێ ئایەتی دووەم بۆ بەندەکانە، ئایەتی ناوەڕاستیش (**إِيَّاكَ نَعْبُدُ وَإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ**) لەنێوان خودا و بەندەکاندایە [4]، ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە، نوێژ تەنیا تایبەت نییە بە بەندایەتی ئیمانداران بۆ خودا، بەڵکو نیوەی یەکەم بەندایەتیە، نیوەی دووەم بۆ ڕێکوپێککردن و باش بەڕێوەبردنی کاروباری ژیانە، چونکە ئەگەر کاروباری ژیان و پێداویستی مرۆڤەکانی تێدا نەبوایە، ئەوە نیوەی دووەمی سورەتی فاتیحا، وەکو نیوەی یەکەم هەمووی بە حەمد و سوپاس تەواو دەکرد، خۆ ئەگەر نیوەی یەکەمیش وەکو نیوەی دووەم هەر سوپاسگوزاریی بوایە، خوای بالادەس دابەشی نەدەکرد.

---

[1] النساء: ٦٩.

[2] الكشاف، ١/ ٩.

[3] صەحیحی موسلیم، ٢/ ١٠/ ٩٠٦.

[4] تەفسیر محمد عثيمين، ، ٢/ ٤.

له ئەنجامی وردبوونەوە لە ئایەت و فەرموودەکان و شیکاری شارەزایانی زمان و ڕاڤەکارانی قورئاندا، دەگەینە ئەو ئەنجامەی: (**نعمة**) بە هەموو دەستکەوتێکی مادی و مەعنەوی، دەوترێت، تەنیا تایبەت نییە بەدەستکەوتە ڕوحییەکانەوە، بۆیە کە ئێمە نوێژ دەکەین، داوا دەکەین خوای بالآدەست، هەموو چاکە و دەستکەوت و خێرێکی مادی ومەعنەوی بخاتە دڵمانەوە، ڕێگەی بە دە ستهێنانیشیانمان پیشان بدات.

بۆیە دەڵێین مرۆڤ بۆ سەرخستنی جومگە گەورەکانی ژیان، وەکو: بەڕێوەبردنی وڵات و چارەسەری کێشەی ڕۆژانەی خەڵك و چاکردنی ئابووری و بژێویی ژیان و گوزەرانی خەڵك، کە هەموو ئەمانە پەیوەندییان بەژیریی و زانستیی و ویژدانی هەڵسوڕێنەرانیەوە هەیە، پێویستە هەمووکات، خۆیان ماندوو بکەن و بگەڕێن بە دوای باشترین ڕێگا و چاکترین میکانیزمدا، بۆ ئەوەی لە ئەنجامدانی کارەکاندا ئامانج بپێکێت و ئەرکی سەرشانی وەکو خوای بالآدەست داوای کردووە ئەنجامی بدات، پێویستە لە بواری بەر پرسیاریەتیەکەیدا، زانیاری و شارەزایی کۆ بکاتەوە و ڕاوێژ بە کەسانی شارەزا و پسپۆڕ بکات، هەرکەس و کۆمپانیا و وڵات و ڕێکخراوێك، لەو بووارەدا ئەزموونێکی سەرکەوتووی هەیە، خۆیان ماندوو بکەن بۆ بەدەستخستنی، چۆن ئەوان لە ئەنجامدانی ئەو کار و پرۆژە و بەڕێوەبردنانە سەرکەوتوو بوون، تۆش هەوڵ بدە بەهەمان شێوە سەرکەوتوو بیت، وەکو خوای بالآدەست دەفەرموێت: (**فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِنْ كُنْتُمْ لَا تَعْلَمُونَ**)[1]، جا

[1] النحل: ٤٣.

ئەوکەسەی ئەو زانیارییەی لەلایە، بۆی هەیە فەلە، یان جوو، یان هیندۆسی، یان بوودابییەك بێت، چونکە هەرکەسێك لە هەرکارێکدا، وەکو بەڕێوەبردنی وڵاتێك، یان پارتێك، یان ڕێکخراوێك، یان وەزارەتێك، یان هۆز و بنەماڵە و خێزانێك، سەرکەوتوو بوو دادگەری چەسپاند، بەبێ تەماشاکردنی ئایدیۆلۆژیا و قەناعەتی ئەوکەسە، پێویستە تۆش ئەو ئەزموون و زانستەی لێوە فێربیت و لە سنووری ئەرکەکەتدا جێبەجێی بکەیت، ئەوکاتە نیشانەی ئەوەیە تۆ ڕێگەی ڕاستت دۆزیوەتەوە و پاڕانەوەی: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**)ت، لێوەرگیراوە، بۆیە: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**)ی سەرۆك کۆمارێك جودایە لە: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**)ی سەرۆك پارتێك، هەردوکیان جودان لە دوکتۆرێك، یان ئەندازیارێك، یان مامۆستایەکی ئایینی، یان نوسەر و بیرمەندێك، یان وتاربێژێك، یان بازرگانێك، یان ڕۆژنامەنووسێك، یان جوتیارێك، یان شوانێك، واتە چەند جۆری کار هەیە، ئەوەندەش ڕێگەی ڕاست هەیە، چونکە ڕێگەی ڕاستی هەموو کارێك بەدەستخستنی میکانیزمەکانی سەرکەوتنی کارەکەیە. بۆیە ئەبێ خاوەن پیشەکە بگەڕێت بیدۆزێتەوە لە شەو و ڕۆژێکدا چەند جۆری کار هەیە، دەبێ ئەوەندە جارە ئیمانداران، بە جوانی و بە پاکی و بە چاکی، بیر بکەنەوە، تاوەکو لە ئەنجامدانی هەر کارێکی تازە: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**)ێکی تازە بەدەست بخەن و سەرلەنوێ بیری تازە و بەرنامەی تازەی بۆ پەیدا بکەن، دەبێ هەمووکەس کۆشش بکات لە جێبەجێکردنی ئەرکەکەیدا، باشترین میکانیزم و جوانترین ئەزموونی خەڵکی بهێنێت و سوودی لێ ببینێت، کاتێك سەرۆکی حکومەت ڕێگەی ڕاستی دۆزیوەتەوە، لە سنووری ئەرکەکەیدا، زانیاریی

پێویــست و ئــەزموون ســەرکەوتووی کەســەکان وڵاتــان بهێنیێــت و وڵات ببوژێنیێتــەوە و بــەبێ جیــاوازی خزمــەت بــە وڵات و هاووڵاتیــان بکــات، بــە هەمانــشێوە ســەرۆك پارتیێــك کاتێــك ڕێگــەی ڕاســتی دۆزیوەتــەوە، هــەموو میکانیزمێکی شـیاو بگرێتـە بـەر بـۆ بەرەوپێـشبردنی پارتەکـەی، هـەروەها هەموو پلە و بەرپرسیاریەتییەکانی تر، وەکـو ئیبنوتەیمیـە دەڵێـت: بەنـدەکان پێویستیان بە پاڕانەوە هەیە، تاوەکو خوای باڵادەست بیخاتـە دڵیانـەوە چـی بکەن و چۆن کاروباری ڕۆژانەیان بەڕێ بکەن[1]. بۆیە چـەند جـۆری کـار هەیـە ئەوەنـدە جـۆرەش ڕێگـەی ڕاسـت هەیـە، بـەڵام گـرنگ ئەوەیـە بگـەڕێین بـۆ دۆزینەوەی ئەو ڕێگە ڕاستە، ئەوەش حیکمـەتی دووبارەکردنـەوەی نوێژەکانـە لە شەو و ڕۆژێکدا، کە تێیدا دەڵێین: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**).

وەئەم ڕاڤەیەش هیچ تێکگیرانێك دروست ناکـات لەگـەڵ ڕای ڕاڤـەکارانی قورئان کە دەڵێن: مەبەست لەڕێگەی ڕاست ڕێگەی پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و چاکەکارانە،[2] چونکە پێغەمبەران: (درووود و سەلامی خوایان لەسەربێت) هەیان بووە خـوای باڵادەسـت لـەکاروباری سیاسـیدا شـارەزایی و پسپۆڕی پێداوە، هەیان بووە لـەکاروباری کۆمەڵایەتیـدا شـارەزایی پێـدراوە، هەیان بووە لەکاروباری ئابوورییدا شارەزایی و پسپۆڕی پێدراوە.

---

[1] مجموع الفتاوى، ابن تەيمية، ٣/ ٩٩.

[2] تفسيرالثعالبي، ١/٣٢٦.

## ٨. سەرچاوەکانی دۆزینەوەی پلان و میکانیزمی ڕاست:

بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست چەند جۆر ڕێگا و میکانیزم هەیە دەبێ ئەو ڕێگایانە بدۆزینەوە.

جۆری یەکەم: لەلایەن خوداوەیە، وەکو ناردنی کتێبەکان و پێغەمبەرەکان و ڕوونکردنەوەی حەرام و حەڵاڵ و چاك و خراپ، بۆ بەرچاو ڕوونی بۆ مرۆڤەکان.

جۆری دووەم: دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست بە هەوڵ و کۆششی مرۆڤەکانەوە بەستراوەتەوە، خوای باڵادەست دەفەرموێت: (**وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى**)[1]. یان دەفەرموێت: (**وَالَّذِينَ جَاهَدُوا فِينَا لَنَهْدِيَنَّهُمْ سُبُلَنَا وَإِنَّ اللَّهَ لَمَعَ الْمُحْسِنِينَ**)[2]. کە ئەم ئایەتە پیرۆزانە ڕاڤەی: (**اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ**) دەکەن، چونکە ناوەرۆکی ئەم داوایە، لەم ئایەتەشدا خوای باڵادەست وەعدی داوە بەوانەی بە دوای ڕێگەی ڕاستدا دەگەڕێن، ئێمەش ڕێنماییان بکەین، وشەی:(**اهْدِنَا**) فەرمانە، فەرمانیش بەرانبەر بە خودای باڵادەس بۆ داواکارییە، بەڵام داواکارییەکی بەردەوام و بێ بڕانەوە،[3]. واتە گرنگ نییە بۆ قۆناغێك، یان لەکارێکدا خۆت ماندوو بکەیت و کارێکی باش ئەنجام بدەیت بەڵکو گرنگ ئەوەیە بەردەوام بیت بۆ هەموو قۆناغەکانی تر، بەردەوامیش بەبێ گۆڕانکاری ئەستەمە، بۆیەکاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: (**فَاسْتَقِمْ**

[1] النجم، ٣٩.

[2] العنكبوت، ٦٩.

[3] المحرر الوجيز، ابن عطيةالمحاربي، ٣/ ٤٧١.

كَمَا أُمِرْتَ وَمَنْ تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ)[1]، یان دەفەرمویێت:(اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ) واتە خوایە یارمەتیم بدە لەکار و پڕۆژەکانمدا، بە بێ پسان بەردەوام بم، بەردەوامیش مانای وانیە، لەکاروباری ڕۆژانەی سیاسی و ئابووری و کۆمەلآیەتی و... هتد لە یەك باردا بمێنیتەوە، بەلْکو مانای بەردەوامی ئەوەیە ڕێگە نەدەیت، لە پڕۆژەکانتدا لە دەوروبەرت دوا بکەویت، ئەویش بەوە دەبێ بەردەوام تازەگەری بکەیت لە چۆنیەتی کێبڕکێ و میکانیزمەکانی بەڕێوەبردندا، چونکە سروشتی مرۆڤ وایە لەیەك جۆر خواردن بێزار دەبێت، لەیەك جۆرجلوبەرگ، یان ڕۆیشتن بێتاقەت دەبێت، ناتوانێ لە یەك قالب و لە یەك ئاستدا بمێنێتەوە، بەلْکو دەبێ بەردەوام نوێگەری بکات لە پێناو بەردەوامبووندا، خۆ ئەگەر وڵات، یان پارت، یان پڕۆژە ئابورییەکانت، لاواز بوون و بەرەو تیاچوون ڕۆیشت، با شەوورۆژیش نەوەستی و بەبێ ماندوبوون لە کاردا بیت، ئەوە مانای بوونی ئیستیقامە ناگەیەنێت، چونکە کەمتەرخەم بووی لەدۆزینەوەی ئەو میکانیزمانەی بەرەو پێشت دەبەن، کە ئەو میکانیزمانەش نەبوو تۆ ئەوەستی کە وەستای ئیتر کوا ئیستیقامە هەبووە؟!.

جۆری سێیەم: جگە لەوەی ئیماندار و بێ ئیمان لە بەکارهێنانی کەرەستەکاندا یەکسانن و جیاوازییان تەنها لە لێزانین و چاك بەکارهێنانی کەرەستە و ئامرازەکاندا هەیە، ئەگەر هەردوولا لەو خاڵەدا یەکسان بوون،

---

[1] هود، ١١٢.

یارمەتیەکی مەعنەوی هەیە بۆ ئیمانداران کە پێی دەوترێ: (توفیق)[1]، کە بۆ ئەوانەیە زۆر لەکاری چاکەدا قاڵ بوون و خواپەرستێکی باشن و دڵ و دەروونیان بە خاوێنی هێشتۆتەوەو ئەرکەکانیان بە جوانی ئەنجام داوە، خوای گەورە یارمەتیان دەدات و ڕێنموونیان دەکات،[2] وە پەیوەندیان بەخودا و جیهانی فریشتەکانەوە، هەیە، وەکو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێت: (إن للشيطان لمة وللملك لمة فأما لمة الشيطان فإيعاذ بالشر وتكذيب بالحق وأما لمة الملك فإيعاذ بالخير وتصديق بالحق فمن وجد ذلك فليحمد الله ومن وجد الأخري فليتعوذ من الشيطان).[3]

---

[1] موعتەزیلە باوەڕیان بە توفیق و ئیلهام و کەرامەت نیە، وە باوەڕیان وایە خوا یارمەتی مرۆڤەکانی داوە بە ناردنی پێغەمبەران و کتێبەکان، وە هەموو مرۆڤەکانیش لەم یارمەتیە خواییەدا یەکسانن، وەلوتف و تەوفیق لای ئەوان یەکێکە کە خۆی لە ڕێنمایی پێغەمبەردا ئەبینێتەوە، وە جگە لە پێغەمبەران، قەناعەتیان بەهیچ سەرچاوەیەکی تری مەعنەوی نیە، ڕێنمایی تایبەتی ئیمانداران بکات، چونکە ئەوان، وەکو تێڕوانینێکی عەقلأنی قەناعەتیان وایە مرۆڤەکان بەدیهێنەری کارەکانی خۆیانن، وە هیچ سەرچاوەیەکی نهێنی کاریگەری نیە لەسەریان . حقيقة التوحيد، بين اهل السنة والمتكلمين، عبدالرحيم بن صمايل السلمی، ل: ٢٥٠ ـ ٢٥٤.

[2] شرح العقيدة الطحاوية، صالح بن عبدالعزيز ال الشيخ، ٤٢٩/١ـ ٤٣٠.

[3] صحيح ابن حيان، ٢٧٨/٣/ ٩٩٧.

## دووەم: ئەركی لایەن و تەوژمە عەلمانییەكان

لەكاتێكدا ئەمانەوێت لەجیهانی ململانێوە هەنگاو بنێین بەرەو جیهانی هاوكاری و تەبایی، پێویستە هەر لایەنەو بەجیا لەوی تر لە مەیدانی پراكتیكدا بۆ ئەوەی تەنها هەندێك دروشمی بێ ناوەڕۆك نەبێت، هەندێك ئەركی هەبێت، وەكو لایەنە ئیسلامییەكان هەندێك ئەركیان هەیە، بەرانبەر بە بزاڤ و تەوژمە عەلمانییەكان هەبوو بەهەمان شێوە لایەنە عەلمانییەكانیش، هەندێك ئەركیان هەیە بەرانبەر بە تەوژمی ئیسلامی، نەرمی نواندن لەم بوارەدا لەبەر خاتری كەس نییە، هیچ لایەنێكیش، كە بەشێوەیەكی لۆژیكیانە مامەڵەی لەگەڵ ئەویتردا كرد، نابێ منەتی بەسەردا بكات، چونكە حیكمەت بەخەرجدان خاترگرتن نییە، بەڵكو مەدالیایەكە بەیەخەی خاوەنەكەیەوەو نیشانەی فێربوونی شێوازی پێكەو ژیانە، تائێستا لەو ئاستەدا نەبووین، ئەوە كەم وكورتیەك بووەو هەستمان پێ نەكردووە، لەوانەیە هەریەكەمان لەقۆناغێكدا باجی قورسمان لەسەری دابێت، هەرلایەنێك چەنێك لەگەڵ لایەنەكەی تردا حیكمەت بەكار بێنێت، ئەوە خاتری ئەوی نەگرتووە، بەڵكو پێگەیشتن و گەورەبوونی خۆی پیشان داوەو ئارامی و ئاسایشی ڕوحی و فیكری بۆ خۆی بەرجەستە كردووە، لایەنە عەلمانییەكانیش ئەتوانن لەم تەوەرانەدا پێدا چونەوە، بە هەڵوێست و گوتارەكانیاندا بكەنەو بۆ ئەوەی ئەم لێكتێگەیشتنانە دەرگایەك بێت، بۆهەنگاونان بۆدروستكردنی پرۆژەی هاوبەش و كاری هاوبەش، لەباتی ئەوەی وەكو ئەلتەرناتیف تەماشای یەكتر بكەن، با وەكو هاوكار و تەواوكەری پرۆژەی نیشتیمانی و سیاسی و ئابووری، تەماشای یەكتر بكەن.

## ١. جیاکردنەوەی ئیسلام لە دەوڵەت:

پارتە عەلمانییەکان زۆر باس، لەخاڵە هەستیارەکانی وەکو: گۆشەگیرکردنی ئیسلام و جیاکردنەوەی ئیسلام و دەوڵەت و ئیسلام و سیاسەت، یان ئەوەندە پێداگیری لەسەرئەوە دەکەن، دەستوور پابەند نەبێت، بە بنەمانەگۆڕەکانی ئیسلامەوە، یان بانگەشەکردن بۆهەندێك بابەتی ڕێگەپێنەدراوی وەکوو: بوونی سوو لەبانکەکاندا، یان بەناوی بەدەستخستنی ئازادییەکانەوە، پێداگیری لەسەر هەندێك بابەت دەکرێت، کە لەکۆمەڵگا مسوڵماننشینەکاندا، سەر دەکێشێت بۆ تێکچوونی شیرازەی خێزان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لەکاتێکدا بوونی ئەو ئازادییانە، هیچ مەسەلەیەکی نەتەوایەتی چارەسەر ناکات، نەبوونیشی هیچ زیانێك بەچارەنوسی گەل و وڵات و مادەی ١٤٠ ناگەیەنێت، یان لەهەر بۆنەیەکدا کە باسی ئیسلام بێتە پێشەوە ئەوان بەتونێلەکانی مێژووی مسوڵماناندا دەچنە خوارەوەو هەرخەلیفە و والیەك پێی خوار دانابێت، ئەوان لەسەر ئیسلام هەژماری دەکەن! بەڵکو پێداگرتن لەسەر ئەم بابەتانە جگە لە لایەنی نیگەتیفی وەکو: تووڕەکردنی مسوڵمانان و خەڵکە دیندارەکەو لایەنە ئیسلامییەکان، هیچ دیوێکی پۆزەتیڤی نییە، کە لایەنە عەلمانییەکانیش سوودی لێ ببینن.

## ٢. پێکەوەگرێنەدانی دیموکراسیەت بەعەلمانیەوە:

لە جیهانی ئیسلامیدا گرێدانی عەلمانیەت بەدیموکراسیەوە، ڕۆڵی گەورەی هەبووە لە شێواندنی دیموکراسی، کاریگەری بەرچاوی هەبووە لەدوورکەوتنەوەی نێوان هەردوولایان، لەنێو بەشێکی زۆری بزاڤە ئیسلامییەکاندا، ئەگەر ئەو پێکەوەگرێدانە نەبوایە، بە شێوەیەکی پۆزەتیڤانەتر مامەڵەیان لەگەڵ سیستمی دیموکراسیدا دەکرد، زیاتریش هاندەر دەبوو لە سیاسەت و کاری حیزبایەتی و حوکمڕانیاندا ڕەنگ بداتەوە، بەڵام پارت و تەوژمە عەلمانییەکانی جیهانی ئیسلامی وایان وێناکردووە دیموکراسی و عەلمانی دوانەیەکن لێك جیا نابنەوە. دیموکراسیەتی ڕاستەقینە عەلمانیەتی ڕاستەقینەیە، ئەمەش ئەو بۆ چوونەی لەسەر لایەنە عەلمانییەکان دروست کردووە، کە دەیانەوێت ڕاوبۆچوونە چەپگەراییەکانیان، بەناوی دیموکراسیەوە لەجیهانی ئیسلامیدا ساغ بکەنەوە، تائێستا بەهەمان قەناعەت و تێڕوانینی بیری مارکسیەوە کە لە پێش دارمانی بلۆکی ڕۆژهەڵاتدا هەیان بووە، مامەڵە لەگەڵ بیری ئیسلامیدا دەکەن و تائێستاش ئەو سەنگەرەیان چۆڵ نەکردووە، ئازادی و مافی مرۆڤ و دەستاودەستپێکردنی دەسەڵات و حوکمی دیموکراسیان بەستووەتەوە بە فرێدانی بیروباوەڕ و هزر و شەریعەتی ئیسلامی، دانانی عەلمانیەت لە جێگەکەی، وەکو جۆرج تەرابیشی[١] دەڵێت: دیموکراسیەت بەبێ عەلمانیەت نییە، چونکە تەنها لەژێر سایەی عەلمانیەتدا، مرۆڤ دەتوانێ لە

---

[١] کەسێکی نووسەر و ڕەخنەگرەو، خاوەنی بیری عەلمانی شمولیە، لە ١٩٣٩، لەسوریا لەدایك بوە، ئێستا لەفەرەنسا دا ئەنیشێت، وەرگێڕانێکی زۆری لەکتێبەکانی: فرۆیدو، هێگڵ و، رۆجیە گارۆدیدا کردوە، سەرچاوە: ویکپیدیا الموسوعە الحرە.

عەقڵیەتی تائیفیەت دەرچێت،[1]. یان صادق عەزم[2]و عـەزیز عەزەمـە[3] ڕایـان وایە: عەلمانیەت دیدگایەکی کەونیـە، لـە هـەموو جیهـانی ئیـسلامیدا بـووە بەئـەمری واقیـع، هـەموو گـەڕانێك، جگـە لـە ڕێگـەی عەلمانیـەت، بـەدوای تایبەتمەندییەکانی مرۆڤبووندا، کاتزایەکردنە و لە ئۆقیـانووس و شـەپۆلە بـە هێزەکاندا مەلەوانیکردنـە بـە پێـچەوانەی تەوژمـەوە، عەلمانییـەکان دەڵـێن: مەرجەکانی دیموکراسی وەکو: دانـان بەپێگەی تاك لەنێو کۆمەڵگادا و بوونی گرێبەستێکی ئارەزومەندانە لەنێوان تاك وکۆمـەڵگادا بـە یەکـسانی ئـەرك و مافەکان دابین بکات، بەبێ گوێدانە: ڕەگەز و ئایین و بیروباوەڕی تایەفەگەری، ئەوە بەبێ عەلمانیەت نابێ، چونکە ئەو دونیای ئایین و سیاسـەت لێـك جـودا ئەکاتەوە،[4]. وەئەگەر مەبەست لەعەلمانیەت لەگرێدانی عەلمانی بەدیموکراسـی و سیـستمی حوکمڕانیـەوە بێلایـەنبوونی دەسـەڵات بێـت؟ ئەوەلـە کـاتی سەردەمی کەمال ئەتاتورك و شـای ئێـران و سـەدام حوسـەین و دەسـەڵاتدارە عەلمانییـەکانی تـری جیهـانی ئیـسلامی بێلایـەن نـەبوون، تەنانـەت کـەمال ئەتاتورك دەستی خستە نێو خوداپەرستی و عیبادەتەکانەوە، هەڵوێستەکانی بۆرقیبەش لە تونس نزیك بوون، لە هەڵوێستەکانی کەمال ئەتاتورك[5]، بە هاو شێوەی ئەم نووسەر و بیرمەندانە، نووسەر و ڕۆشنبیرە عەلمانیـە شمولییـەکانی

---

[1] حوارالاسلام والعلمانية، د. عوسمان علی، ل: ٢٨.

[2] بیرمەندێکی سوریە، لەدایکبوی ساڵی ١٩٣٤، خاوەن بیرێکی عەلمانی شمولیە.

[3] نوسەرێکی خاوەن فیکری عەلمانی شمولیە، لە١٩٤٧ لە سوریا لەدایك بوە، دوکتۆرای لە زانستە ئیسلامیەکاندا هەیە، سەرچاوە: پێگەی: القنطرة.

[4] حوارالاسلام والعلمانية، د. عوسمان علی، ل:٥٦ ـ ٥٧.

[5] سەرچاوەی پێشو، ل: ١٢٦.

هەرێمی کوردستانیش تیرۆانینیان بۆ بزاڤ و ڕەوتە ئیسلامییەکان وایە، کە پاساوی بوونیان نیە، بۆیە پێویستە نەمێنن و سەرچاوەی بوونیان وشك بکرێت، بەم شێوەیە عەلمانییەکان، گەلان و جیهانی ئیسلامیان خستۆتە نێوان، دووڕێیانێکەوە، یان دیموکراسیەتی زاخاودراو بەعەلمانیەت و دوورخستنەوەی ئیسلام و شوێنکەوتوانی لە دەسەلات. یان هەلبژاردنی بیری ئیسلامی و ئیسلامییەکان و لە گۆڕنانی ئازادی و مافی مرۆڤ و دیموکراسی، جارێکی تر گێڕنەوەی، گەلانی ناوچەکە بۆ سەردەمی تاریکی و سەدەکانی ناوەڕاست و حوکمی دیکتاتۆری.

هۆکارێکی تر کە ڕێگرە لەبەردەم گرێدانی چاکسازی بە عەلمانیەتەوە، ئەوەیە: کە زیاتر لە نیو سەدەیە، ئەو نەهامەتیانەی بەسەر گەلانی ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاستدا بە گشتی و گەلی کورد بەتایبەتی هاتووە، هەمووی بەناوی عەلمانیەتەوە بووە، کە جگە لە دیکتاتۆریەت و داپلۆسین و مالوێرانی، هیچی تری بۆ جیهانی ئیسلامی نەهێناوە، ئەوەبوو لە بەهاری عەرەبیدا، خەلکی تەحەمولیان نەما، لە ٢٠١٢ شۆڕشی جەماوەرییان دژ بەسەرکردە و دەسەلاتەکانیان دەستپێکرد، عەلمانییەکان لە ماوەی زیاتر لە پەنجا سالی حوکمڕانایان نەیانتوانی، یەك نمونەی جوان لەدوای خۆیان جێ بهێلن کە کەس و تەوژمە عەلمانییەکان لە ڕوویان بێت، لە ئەدەبیاتی سیاسی و حوکمڕانی خۆیاندا باسی لێوە بکەن. ئەو دوژمنایەتیەی ئەوان کردیان بەرانبەر بە دروشمەکانی عەلمانی و یەکسانی و مافی مرۆڤ و دلسۆزی بۆ نیشتیمان، هیچ دوژمنێکی سەرسەخت بەرانبەر بە ناحەزەکەی خۆی نایکات، جا بۆیە ئایدیۆلۆژیایەك ئەوەندە هەستیاری دەوروبەری بەرانبەر بە

خۆی جێهێشتبێت، هەر خۆماندوکردنێك لە پێناویدا کات بەزایەدانـە، بۆیـە کەسانی بیرمەند و دڵسۆز بەچاکسازی و دیموکراسی باش وایە خۆیان لەقەرەی نەدەن. بۆیە ئێمە دوپاتی دەکەینەوەکە: دیموکراسیەت وەکو میکـانیزمێکی، دوور لە هەر ئایدیۆلۆژیا و فەلسەفەیەك، هیچ تێکگیرانێکی لەگەڵ ئیسلامدا نییە، بەم پێناسەیەش وەکو بەشێك لەنووسەر و بیرمەندە ئیـسلامییەکانیش[1] ڕایـان وایـە، کەلوپـەلێك نیـە هـاوردەی ڕۆژئـاوا بێـت، بـەڵکو کەلوپـەلێکی خۆمانەیـەو بۆمـان گەڕاوەتـەوە،[2]. گـەورەترین شکـستی جیهـانی ئیـسلامی ئەوەیە کەنەتوانراوە شـوورا وەکـو ئاکارێـك لەناومانـدا، بخرێتـە چوارچـێوەی دامەزراوەیەکی سیاسی و حوکمڕانیـەوە، بـەڵام ڕۆژ ئـاوا توانیـان لـەئاکارەوە بیگۆڕن، بۆدامەزراوە و بەڕێوەبردنی دەوڵەت، بۆیە بـە دوور لەئایـدیۆلۆژیا و فەلسەفەی عەلمانی ڕۆژئاوا، پێویستە ئێمە سوودی لێ وەربگرین[3].

---

[1] وەکو شێخ ڕاشید غەنوشی.

[2] الفکرالاسلامی، قرآت ومراجعات، زکی میلاد، چاپی: ٢٠١٢، بەیروت ـ لوبنان، ل:٧٠،

[3] الفکرالاسلامی، قرآت ومراجعات، زکی میلاد، ل:٧٠، وة المصطلحات السیاسیة، ئامادەکردنی: توفیق یوسف الواعی، چاپی: ٢٠٠٧، ل: ١٨٠، وة الشرعیة السیاسیة، فی الاسلام مصادرها وضوابطها، ئامادەکردنی: عزام التمیمی، چاپی:١٩٩٧، ل: ٢٣٩.

## ٣. عەلمانییەکانیش لێکۆڵینەوە لەسەرچاوەکانی هزری ئیسلامی بکەن.

وەکو لەپێشەوە ئاماژەمان پێکرد[1]، سەرچاوەی هزری بەشێکی بەرچاو لـە عەلمانیـە کوردەکـان، لێکۆڵینـەوە و نووسـینەکانی عەلمانیـە عەرەبەکانـە، سەرچـاوەی ئـەوانیش لێکۆڵینـەوە و تێرامـانی بیرمەنـد و نووسـەرە ڕۆژئاواییەکانە، بۆیە ئەگەر ویستی لێکتێگەیشتن و پـڕۆژەی کـاری هاوبـەش هەبێت، چۆن ئەرکی سەرشانی کەسایەتی و بزاڤـە ئیـسلامییەکانە بـە خـۆدا چونەوە بکـەن، بەهەسـتیاری ئایدیۆلۆژیانـە مامەڵـە لەگـەڵ گوتـاری لایەنـە عەلمانییەکانـدا نەکـەن، لەهـەر شـوێنێکەوە ئـەزموونی باشـی مرۆڤـەکانیان دەسکەوت سوودی لێ ببینن و مێژووی خۆیان لـێ نـەبێت بـەدین، ئـەزمونی گەلانیشیان لەلا تێکەڵ نەبێت بەدین و ئایدۆلۆژییەکانیان، بـەڵکو وەکـو دوو شتی لێك جودا تەماشایان بکەن، بەهـەمان شـێوە لایەنـە عەلمانییـەکانیش، نابێ بەچاویلکەی ڕەش تەماشای ئیسلام بکەن و هەموو ئیسلامیان لێ ببێت بەهەندێك ڕووداوی مێژوویی و مومارەسە و هەڵـسوکەوتی دەسـەڵاتدارەکانی مێژووی مسوڵمانان و هەندێك تێڕوانینی هەڵەی زانایـان و کەسـایەتییەکانی مێژووی ئیسلامیان لێ ببێت بە یەکسان لەگەڵ ئیسلامدا، ئەوکاتە لـە بـاتی خوێندنەوەو هەڵسەنگاندنیان بۆ ئیسلام، خوێندنەوەو هەڵسەنگاندن بۆ مێژوو کەسایەتیە مێژووییەکان بکەن، بۆیە دەبێ ئەوانیش بگەڕێنەوە سەر سەرچاوە ڕسـەن و ئـەو لێکۆڵینـەوەو هەڵـسەنگاندنانەی بیرمەنـد و شـارەزا متمانـە پێکراوەکانی چوارچێوەی هزری ئیسلامی سەردەم کردویانە، بەدواداچـوون بـۆ

[1] لە سەر چاوەی فیکری عەلمانی.

نووسراو و ڕا و سەرنجەکانیان بکەن، جێگەی خۆیەتی هەردوولا لە کۆڕ و سیمینار و دیبەیتی یەکتردا بەشداربن و ڕا و سەرەنجەکان بگۆڕنەوە، ئەم هەنگاوە هەستیاری تەوژمە ئیسلامی و عەلمانییەکان کەم دەکاتەوە، کەسایەتیە عەلمانییەکانیش بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەو تێڕامانەکانیان لە سەرهەڵە بنیات نانێن، هەڵەیەکی گەورەی، عەلمانییەکان دادگاییکردنی ئیسلام و مسوڵمانەکانە لەسەر مێژوو وەخوێندنەوەی مێژوو تەنها دەبێ بۆ پەند لێ وەرگرتن و سود وەرگرتن لەشتە باشەکانی بێت، هەڵەیەك ڕویداوە دوبارە نەکرێتەوە، نەك ئەو هەڵەیە بکرێتە بڕیاری پێش وەخت و سەرچاوەی پلان و پڕۆژەو بەرنامە ڕێژی و هەڵوێست وەرگرتنی ژیانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی.

**١. جیا نەکردنەوەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لە پارتی سیاسی:**

پارتەسیاسییەکانی هەرێمی کوردستان دەبێ چەترێك بن بۆ هەموو ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدنی و زانایانی ئایینی ئیسلامی و ناوەندە زانستی و ئەکادیمییەکان و ناوەندەکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی، هەموو ئەم ئاستانە لە چوارچێوەی یاسا و بڕیارە چارەنووسسازەکاندا کار بکەن بۆ پێگەیاندنی کۆمەڵگا، بۆ ئەم ئامانجەش نابێ پارتە سیاسییەکان دەست وەربدەنە بەرنامەی پەروەردەیی و پێگەیاندنەوە بە جۆرێك هەر لایەنێك بە گوێرەی قەناعەت و دونیابینی و ئایدیۆلۆژیای پارتەکەی پلانی پەروەردە دابڕێژێت و خەڵکی دابەش بکرێن بەسەر پارتەکاندا و خەریکی ململانێی ئایدۆلۆژی و حیزبایەتی بن و ئاگایان لە پارتە سیاسییەکان نەمێنێت چی دەکەن و وڵات بەرەو چ ئاقارێك دەبەن و پڕۆژەی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و خزمەتگوزاریان چیە؟ لێرەدا کە باس لەپارتە ئیسلامییەکان دەکەین لەو دەرگایەوەیە کە دەمانەوێت ئەوان دوور بکەونەوە لەپارتی شمولی، بەشێوەیەك جگە لە سیاسەت خۆیان بەدوور بگرن لە هەموو کارەکانی تر کە ئەرکی ئەوان نییە پێی هەستن، خۆ ئەگەر بێتە سەر بەراوردکردنی نێوان پارتە ئیسلامییەکان و پارتە عەلمانییەکان، پارتە ئیسلامییەکان ئەگەر لەپێش پارتە عەلمانییەکانەوە نەبن لەدوایانەوە نین، کە تەرکیزی زیاتر دەخەینە سەر پارتە ئیسلامییەکان لەبەر ئەوەیە کاتی ئەوە هاتووە لایەنە ئیسلامییەکان پلان و بەرنامەیان هەبێت وەکو پارتە سیاسیە پێشکەوتووەکانی جیهان مامەڵە لەگەڵ سیاسەت و کۆمەڵگەی مەدەنی و دەوروبەریاندا بکەن، ئێستا کاتی ئەوە هاتوە لە باتی ئەوەی پارتە

سیاسییەکان لە سەر بنچینەی ئینتیمای حیزبی و ململانێی ئایدۆلۆژی پلان بۆ ئیستیعابکردنی جەماوەر دابنێن، با لەنێو خۆیاندا کێبڕکێ بکەن لە سەر داڕشتنی باشترین سیاسەت بۆ وڵات و چاکترین پڕۆژە و زۆرترین خزمەت و دابینکرنی ئاسایشی و لات و دابینکردنی گوزەران و بژێوی خەڵکی، ئەو بەرنامەو پڕۆژانە لە کاتی هەڵبژاردنەکاندا، لە جێگەی وتار و لێدوانی بریقەدار، بنەمای هەڵسەنگاندنی پارتە سیاسییەکان بێت، لێرەدا دەگەینە ئەوەی جیاوازی هەیە لەنێوان ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و پارتی سیاسیدا. بۆنمونە: ئامانجی کۆمەڵگەی مەدەنی گەیاندنی دەنگی تاکەکانە بەدەسەڵاتی، سیاسی و ئابووری و کەلتوری و کۆمەڵایەتی ئەوکۆمەڵگەیە، کەواتە کاری ئەو کۆمەڵگەیە لەسەر دوو ڕەهەندی سەرەکیە، ئەوانیش: (تاك) و(دەسەڵات)ن، بۆیە کۆمەڵگەی مەدەنی ناکرێت هەوڵ بدات بۆگەیشتن بە دەسەڵات چونکە بواری کارەکەی تەسك دەکاتەوەو ڕەهەندی سەرەکی کارەکەی لەدەست دەدات. بەڵام پارتی سیاسی هەوڵ دەدات بۆدەسەڵات و لەوێوە بنەما و پرەنسیپە سەرەکییەکانی خۆی دەچەسپێنێت، بەڵام کۆمەڵگەی مەدەنی هێزی گەیەنەری نێوان تاك و دەسەڵاتە، جگە لە پارتی سیاسی هەموو دەزگا و سەنتەر و ڕێکخراوەکانی تریش بزوێنەری کۆمەڵگەی مەدەنین،[1] وەڕەگەزە سەرەکییەکانی کۆمەڵگەی مەدنی پێك دێت لە: هەوڵدان بۆ ڕێکخستنی ژیانی خەڵکی و کاری خۆبەخشانە و سەربەخۆبوون و هەوڵنەدان بۆ گەیشتن بەدەسەڵات،[2] دەبێ لێرەدا هەڵوێستەیەکی باش بکەین

[1] پارتەسیاسیەکان وڕای گشتی، ڕێبوارمەحمود کەریم، ل: ١٩٥ ـ ١٩٦.

[2] سەرچاوەی پێشو، ل: ١٩٣ ـ ١٩٥.

لەســـەرجیاکردنەوەی ڕێکخراوەکـــان و دەرهێنانیـــان لەچوارچـــێوەی پارتـــە سیاسییەکان کە ئەمە لـەڕووی تیـوری و سـەرکاغەزەوە ئاسـانە بـەڵام وەکـو واقیع و پراکتیك کـارێکی گرانـە، چـونکە وەکـو بـاو و نـەرێتی حیزبایـەتی، لەوڵاتی ئێمە باو نیە، نەگەیشتوین بە ئاستێکی لێکتێگەیشتنی وەها سـود لــە خــاڵی بــەهێزی یــەکتر ببیــنین، ڕێگەچــارەش ئەوەیــە ڕێکخراوەکــان بەڕاوێــژکردن و گفتوگــۆ لەگــەڵ کەســایەتیە پۆزەتیڤــەکانی نــاو پارتــەکان سیاسییەکان بەردەوام بن، بەتایبەت ئەو کەسانەی لەگەڵ بوونیان لەناو کایـە سیاسـیەکەدا، ئاگـاداری ڕێکخراوەکـانی کۆمـەڵگـەی مـەدەنین و بەبایەخـەوە بۆیان دەڕوانن، لەگەڵ ڕەچـاوکردنی ئـەوەی ئـەوانیش بـە حـوکمی دونیـابینی جۆراوجۆریان، کە هەر یەکەیان خوێندنەوەی تایبەتی خۆیـان بـۆ واقیعەکـە و حاڵەتە ئیسلامیەکە هەیە، هەریەکەیان، ئەزمونی تایبەتی خۆیانیـان هەیـە، مەرج نیە هەموویان یەك ڕا و بۆچوون و خوێندنەوەیان بۆ واقیعـە سیاسـی و کۆمەڵایەتیەکـە هــەبێت، بەشـێوەیەکی پۆزەتیڤانــە بڕواننــە ڕێکخراوەکـانی کۆمەڵگەی مەدەنی، بەڵام هەموو گفتوگـۆ و لێکحـاڵێبوونێکی بەپرسـیارانە دەبێتە هۆی کەمکردنـەوەی هەسـتیاری و گەیـشتن بـەخاڵی هاوبـەش لەگـەڵ یەکتر، لێـرەدا مەبەسـت ئـەوە نیـە ڕاوێـژ بـە کەسـایەتی و سـەرکردایە تیـە دیارەکانی ناو لایەنە ئیسلامییەکان بکرێت، تا وەکو هاوکاربن بۆ هـەنگاوی داهاتویان، بەڵکو مەبەست لێکدانەبڕان و ئاگا لەیـەك بوونـە، چـونکە جگـە لەوەی هەموو لایەنە ئیسلامییەکان هەریەکەیان بایی خۆیان کێشەو گرفتیـان هەیـە، کـە لـەم هەلومەرجـەدا، نایـان پەرژێتـە سـەر ئـەوەی بـە ڕێنمـایی تەندروست، هەڵگرانی پلان و پڕۆژەی تـازە بەرچـاو ڕۆشـن بکەنـەوە، کـە لـە

کاتێکدا جوڵێنەری پڕۆژەی، ڕێکخراوەکـان زۆرێکیـان لـە کەسـانی بـەتوانا و کادیری چالاکی ئەوپارتانەن کە گلەیی و سەرنجیان لەسەر ئەدا و بەڕێوەبردنی لایەنـەکانی خۆیـان هـەبوە. ئەمـەش وا دەکـات ئـەو لایەنـە ئیـسلامیانە هەستیارییان بەرانبەر بەکار و جموجووڵەکانیان بۆ دروست ببێت، حەز بـەهیچ جموجووڵێکیتر و پڕۆژەی کاری تازە نەکەن، دڵخۆش نەبن بەهیچ پڕۆژەیـەکی تـازە لـەناو هـەناوی ئەوانـەوە بێتـە دەرەوە، بۆیـە تێـڕوانینی پارتـە ئیسلامییەکان، بۆ هـەر کـارو پڕۆژەیـەکی تـازە، تێڕوانینێکـی گومانـاوییـە، لەبەر ئەوەی لایەنە ئیسلامییەکانیش نایانەوێت پارتەکانیان بچنە چواچێوەیە کی بچووکەوە هیچ پڕۆژەو پێشنیاز و جموجـوڵێکی تازەیـان پـێ ئیـستیعاب ناکرێـت، ئەگـەر لـەباتی دۆزینـەوەی ڕێگەچـارەیەك ڕێکخراوەکـان و پارتـە ئیـسلامییەکان شانبەشـانی یـەکتر وەکـو دوو هێڵـی تـەریب بـڕۆن دوور نیـە لەداهاتودا، سـەنگەر لەیـەکتری بگـرن، بەتایبـەتی لـەکاتی شکـستخواردنی لایەکیانـدا، بەتایبــەت لایەنــە ئیــسلامییەکان هــەر چــوار ســاڵ جارێــك لەهەڵبژاردنـەکان و کۆنگرەکانـدا، دەبـێ قورسـایی خۆیـان بـزانن، لـەکاتی شکستخواردنیان لە هەر هەڵبژاردنێکدا دور نیە لایەنە ئیسلامییەکان بەشێك لە ئۆباڵەکەی بخەنە سەر هەڵگرانی پـڕۆژەی تـازەو ڕێکخـراوە مەدەنییـەکان، ئەوکاتە زیاتر ئەکەونە دوو بەرەی لەیـەك جـوداوە و زیـاتر سـەنگەر لەیـەکتر دەگـرن. خـۆ ئەگـەر سـەرکەوتنیان بەدەسـت هێنـا، دیـسانەوە حاڵەکـە لەپێچەوانەکەی باشتر نابێت، پێیـان دەڵـێن ئـەوەتا ئـەوانیش نـەبوون پارتـە ئیسلامییەکان پێگەیان توندوتۆڵتر بوو ئەوکاتە لەکاتی ڕودانی هەریـەك لـەو دوو ئەگـەرەدا، پەیوەنـدی نێـوان ڕێکخراوەکـان و پارتـە ئیـسلامییەکان بـە

قۆنـاغێکی ساردوسـڕدا دەڕوات، بۆیـە دەبـێ هـەر لەئێـستاوە هـەموو ئـەو هەڵسوڕێنەرانەی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی لەلایەك خۆیـان بپـارێزن لە هەرکارێکی دەستە جەمعی کە بوونی پـڕۆژەی سیاسـی لـێ بخوێنرێتـەوە، هەوڵی ئەوە بدەن ڕێڕەوی سروشتی مەدەنیانەی خۆیان بگرنەبـەر، بـۆ ئـەوەی ئومێدێك لای لایەنە ئیسلامییەکان بمێنێت کە ئەگەر ئەوان چاکسازی بکـەن مەجالی ئەوە ماوە جارێکی تر پێکەوە لە پڕۆژەیەکی تـازەدا پێکـەوە درێـژە بەخەبات و پڕۆژەیەکی کارکردنی تازە بدەن، جگە لەوەی هەلومەرجی سیاسی و ئابووری هەرێمی کوردستان بێ متمانەییەکی دروستکردووە، خەڵکی وەکـو چـاودێرێك، بەهەسـتیاریەوە دەڕواننـە هـەموو جموجـوڵێکی سیاسـی و ڕێکخراوەیی، کێشەی نێوماڵی پارتـە سیاسـییەکان جێگـەی بایـەخی ئـەوان نیە، بەشێوەیەکی لاوەکی ئەڕواننە ئەو جموجوڵە نێوخۆییانە، بۆیـە دەبـێ تـا ئەوکاتە هەڵگرانی بـیری نـوێی چاکسازی و هەڵـسوڕێنەرانی ڕێکخراوەکـانی کۆمەڵگەی مەدەنی، زۆر بە وریایی و بەهەستیارییەوە هەڵـسوکەوت لەگـەڵ ئەگـەرەکان بکـەن، بەشـێوەیەك دەسـتیان بۆبـەرن نەکەونـە نێـو کێـشەی نێوخۆییەکانەوە، وای لێ نەیەت لەباتی چاکسازی سەرقاڵی یەکتربن.

ئێـستا شـێوەی ڕێکخراوەکـان وەکـو نـەمامێك وایـە تـازە سـەوز بوبێـت هەرشکست هێنانێك لەلایەن هەڵگرانی بیری چاکسازیەوە، دەبێتە هۆی خستنە ژێر پرسیاری هەموو پڕۆژەیەکی چاکسازییەوە، دەبێتە پشتڕاستکردنەوەی، ئەو بۆچوونەی کە دەڵێت ئەو هەولانەی لەدەرەوەی پارتە سیاسییەکان ئەدرێن، ئەبو لەنێوپارتـەکان بدرایـە و هـەوڵی مانەوەوبـەهێزکردنی ئـەوان بدرایـە، ئەگـەر پارتەکان کەم وکورتیەکیان بوبێت، ئەوە ئەوان بەبۆچوونە تازەکانیـان زۆرتریـان

کرد، له هه‌مان کاتدا خۆشیان ڕفتـار و هه‌ڵسوکه‌وتی پارتـه سیاسـی و لایه‌نـه ئیسلامییه‌کانیان دووباره کرده‌وه، که پێشتر ڕه‌خنه‌یان لێ ده‌گرتن، خاڵێکی تـر که ڕێکخراو و هـه‌ڵگرانی تـه‌وژمی تـازه ده‌بـێ ڕه‌چـاوی بکـه‌ن ئه‌وه‌یـه پـلان و به‌رنامه‌یان کۆپی پلان و به‌رنامه‌و نه‌خشه‌ڕێگای لایه‌ن و وپارته‌کان نه‌بێت، نابێ ئـه‌و پرانـسیپ و پلانانـه دووبـاره بکه‌نـه‌وه، کـه کـاری ڕۆژانـه‌ی پارتـه ئیسلامییه‌کانه، باش وایه بۆ ئه‌وان له‌وخالآنه‌وه ده‌ست پـێ بکـه‌ن کـه لایه‌نـه ئیسلامییه‌کان بۆیان نه‌کراوه‌و تێیدا ده‌سه‌وسـان بـوون، بـه‌کرده‌وه گۆڕانکارییـه تازه‌کان پیشان به‌خه‌ڵك بده‌ن، خۆیان بپارێزن له دوباره‌کردنه‌وه‌ی، ئه‌و گوتارانه‌ی که له‌سه‌ره‌تای نه‌وه‌ده‌کان و تائێستاش هێشتا شـوێنه‌واری مـاوه لـه‌نێو لایه‌نـه ئیـسلامی و چه‌په‌کانیـشدا، کـه پارتێـك سـه‌ری هـه‌ڵ ده‌دا، له‌سه‌رلاشـه‌ی لایه‌نه‌کانی تـر دروسـت ده‌بـو وه باسـیان له‌خاڵـه جیاوازه‌کـانی نێـوان خۆیـان و ئه‌ولایه‌نانه‌ی تر ده‌کرد، که خۆیان به به‌دیلیان ده‌زانی، هه‌نـدێك جـار ئه‌وخاڵـه جیاوازانه‌یان به‌نوسراو و بڵاوکراوه، ده‌دا به دۆست و لایه‌نگره‌کانیان و له کۆڕ و سیمیناره‌کانیـشدا دوپاتیـان ده‌کـرده‌وه، بـه کـورتی ئـه‌م قۆناغـه بـۆ پارتـه سیاسییه‌کان ده‌بێ قۆناغی به‌خۆداچونه‌وه‌و بژاری هه‌ڵه و که‌موکورتییه‌کان بێت، بۆ هه‌موو ئه‌وکادیر و ته‌وژم و ڕێکخراوه‌کـان، قۆنـاغی خۆپێگه‌یانـدن و پـلان و به‌رچاو ڕۆشنی و به‌ده‌ست خستنی ئه‌زمونی تـازه‌و به‌رنامـه‌ی تۆکمه‌ودامـه‌زراو بێـت، له‌هـه‌موو حاڵه‌ته‌کانیـشدا هه‌ڵبـژارده‌ی هـه‌ردوو جه‌مـسه‌ر گفتوگـۆ و لێکتێگه‌یشتن بێت، تـا هه‌ڵبـژاردنی داهـاتوو چاوه‌ڕوانی یـه‌کتر بکـه‌ن، ئه‌گـه‌ر نه‌گه‌یشتنه هیچ پرۆژه‌و به‌رنامه‌یه‌کی هاوبه‌ش ئه‌وکاته هه‌رکه‌س ئازاد بێت چۆن پلان و به‌رنامه‌ی خۆی جێبه‌جێ ده‌کات و به‌ره‌و چ ئاقارێك ده‌ڕوات.

## ٢. گوتاری بەدیل

لایەنە ئیسلامییەکان: لە سەرەتای نەوەدەکانەوە، تا ساڵی ٢٠٠٠، لایەنە ئیسلامییەکانی کوردستان، کە پێکهاتبوو لە هەریەك لە: بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان، بزووتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی کوردستان، یەکگرتوی ئیسلامی کوردستان، چەندین پرۆژەی هاوکاری و لێکتێگەیشتن و هەما هەنگی و پێکەوە کارکردنیان، لە نێوان خۆیاندا، واژۆ کردووە،[١] کە تائەندازەیەکی باش ڕۆڵی هەبووە، لە لێکتێگەیشتن و نەهێشتنی هەستیاری و پرۆژەی جۆراوجۆری هاوبەش و یەکتر قبوڵکردنی لێ پەیدا بووە، تا گەیشتن بە یەکبوون و[٢]، بووە بە هۆکاری بەرەو پێشبردنی خەباتی سیاسی و بەرزکردنەوەی ئاستی هوشیاری لە نێو ئیسلامییەکانی کوردستاندا، بۆیە بە شێوەیەکی ڕێژەیی ئەو لێکتێگەیشتن و بەخۆداچونەوانە، گۆڕانکاری لە ڕیتمی حیزبایەتی و کاری ڕێکخراوەیدا، دروست کردووە و شوێنەواری گەورەی بووە کە هەندێکیان پارتەکانیان وەکو میکانیزم تەماشا بکەن و وەهەنگاوێك بێت بۆ کەمکردنەوەی، دەمارگیری حیزبایەتی و هە ستیاری بەرانبەر بە ئەندام و دۆست و لایەنگرانیان و هەڵوێستی یەکتر، بەڵام ئەوەی جێگەی تێبینییە

---

[١]بەڵگە نامەکان دەدوێن، بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی، ١٩٩٢ـ١٩٩٩، بەرگی یەکەم، ئامادەکردنی: ئارام قادرـ ئیدریس سیوەیلی، چاپی: ٢٠١٠.

٢کە لەساڵی ١٩٩٩، یەکگرتنی هەردو بزوتنەوەی ئیسلامی و، بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی، بەناوی بزوتنەوەی یەکبونی ئیسلامیەوە، ڕاگەیەنرا، وەپاش نزیکەی دو ساڵ لەو ڕاگەیاندنە، لە٣١/٥/ ٢٠٠١، کۆمەڵی ئیسلامی ڕگەیەنرا، وەناو بەناو لەنێوان یەکگرتوی ئیسلامی و، کۆمەڵی ئیسلامیدا، چەندین پرۆژەی جۆراو جۆری تری وەکو لیستی خزمەت و، ئەنجومەنی هاریکاری ڕاگەیەنراوە .

ئەوگۆڕانکارییانەی، کە لایەنە ئیسلامییەکان لەماوەی ڕابوردوودا لەنێو خۆیاندا کردویانە، جگە لە یەکبوون، کە هەنگاوێکی تازەبوو بۆ ئەوکاتەی لایەنە ئیسلامییەکان، هەمووی لە هاوکاری و تەنسیق تێنەپەڕیوە، نەبووە بەهۆی لەدایکبوونی پرۆژەیەکی تازە، بەڵکو لەچوارچێوەی ئەو قاڵبەدا بوون کە لەسەری ڕاهاتون، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی ئیسلامییەکان، گۆڕانکارییان لەسەرشان گرانە، ئەمەش وایکردووە، لە هەر قۆناغێکدا کە پێویست بە گۆڕانکاری بکات بەئاسانی نەتوانن، گۆڕانکاری بکەن و دوور لە کێشەو گرفتی نێو خۆیی ئەوقۆناغە تێبپەڕێنن، بۆیە: لەکاتی سەرهەڵدانی کاری نوێی برایان، بەڕابەرایەتی: م صدیق عبدالعزیز، لەگەڵ ڕێکخراوی برایان بەڕابەرایەتی: م صلاح الدین، لەباتی لێکتێگەیشتن و ڕێکەوتن لە سەر پرۆژەیەك و شێوازی کارکردن کە جێگەی هەردوو تەوژمە ئیخوانیەکەی تێدا ببێتەوە، ئەگەرتەماشای گوتار و پرۆژەکانیان بکەیت، هەردوولایان وەکو بەدیلی ئەویتر، نەك تەواوکەر، پلان و بەرنامەی خۆیان دەخستە ڕوو برایانی نوێ بەسەرکردایەتی م صدیق دەیان گوت: ئێمە پێشکەوتوین، لەکارکردن بەناوی برایانەوە، بۆیە دەبێ ئێوە پلان و بەرنامەی ئێمەتان قبوڵ بێت. برایانی پێشووتر کە خۆیان بە میراتگری شەرعی برایان دەزانی، دەیانگوت: شەرعیەتی کاری برایان لەلای ئێمەیە، بۆیە دەبێ ئێوە خۆتان هەڵوەشێننەوەو لەگەڵ ئێمەبن، لەکۆتایدا بەبێ یەکتر قبوڵکردن هەرلایەنەیان بەجیا کۆمەڵەکەی دەوری م صدیق لە ١٩٩٢/١١/٢٢ پارتێکی تازەیان ڕاگەیاند بە ناوی: بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامی، کۆمەڵەکەی دەوری م صلاح الدین، لە ١٩٩٤/٢/٦، یەکگرتووی ئیسلامییان ڕاگەیاند، هەردولایان، هەریەکەیان

لەژێر ناونیشانێکی جودادا، بەردەوام بوون لەسەر کـار و خـەباتی سیاسـیان، لێرەدا بە حوکمی ئەوەی باس لە پێکەوە بوون دەکرێت نەك بەدیل، بۆیە ئێرە جێگەی داوەری نیە، تا قسە لەسەر ئەوە بکەین، خـەتای کـام لا بـووەو کـێ زیاتر ئۆبالّی ڕاگەیاندنی دوپارتی جودای دەکەوێتە ئەستۆ، ئەم ڕیتمە بەتەنها هــەردوو بــالّی برایــانی، نەگرتــەوە بــەلّکو بەهــەمان شــێوە، بزوتنــەوەی یــەکبوونیش، بەهــەمان ڕێــچکەدا ڕۆیــشت، لــەدوای ڕاگەیانــدنی بزوتنــەوەی یەکبوون، لە مانگی ئابی: ١٩٩٩ کە دەبـوو دوای سـالّێك لەسـەرپڕۆژەیەکی تازە ڕێك بکەون و کۆنگرە بگرن، ئەوەبوو لـەمانگی ئـابی: ٢٠٠٠ لەتەوێلّـە کۆنگرە گیرا، بەلاّم کۆنگرەکە بێ ئەنجام بوو نەیانتوانی بە ئەنجامەکـەی ڕازی بـن، دوای سـالّێك لـە کـۆنگرە، لـە٣١/٥/ ٢٠٠١، زۆرینــەی پێکهێنــەری بزوتنەوەی یەکبوون، کۆمەلّی ئیسلامیان ڕاگەیاند، کە ئەم ڕووداوانـە پێمـان دەلّــێن: ئەگــەر لایەنــە ئیــسلامییەکان لەســەر فەلــسەفەی پێکــەوبوون، لێکتێگەیشتنێکی باش لەنێوان خۆیاندا نەسازێن، ئەوە کارەساتی هەلّکـشان و داکشان لە پڕۆژەی کاری سیاسیاندا، دەمێنێتەوەو هەموو ١٥ سالّ جارێـك ئەوەی کە بنیاتیان ناوە دەبێ تێکی بـدەن و سـەرلەنوێ، لـە نوکـەوە دەسـت بەپڕۆژەیەکی تر بکەن کە زۆر بڕ بکات ئەویش ١٥ سالّی تر تەمەنی دەبێت، تێگەیشتن لەبیرۆکەی چاکسازی وەگەڕان بە دوای میکانیزمی جۆراجۆردا، بـۆ دۆزینەوەی چاکترین میکانیزمی کارکردن، تەنها بەلایەنێك ناکرێت کە داوای چاکـسازی لـێ دەکرێـت، تـەنها بـەو لایەنـەش ناکرێـت کـەداوای چاکـسازی دەکات، چونکە ناکرێت ئەوەی چاکسازی بەدەستە تەنها بەوڕێگایـەدا بـڕوات کە خۆی قەناعـەتی پێیەتی، ئەو ڕیتمە تێك نەدات کەپێوەی ڕاهاتووەو دەست

به ناو و ناونیشانی خۆیەوە بگرێت و کونجی قەناعەتی لێ بگرێت و بەو قەبارەو چوارچێوەیە ڕازی بێت، کە هەیەتی تەماحی گەورە بوون و گەشەکردنی زیاتری نەبێت، بەهەمان شێوە ئەوانەش کە پڕۆژەی چاکسازییان پێیە خۆ نابێ، سەنگوسوکی تێدا نەکەن، ئەوەی لەمێشکیاندا چەسپیوەو دەیانەوێت جێگیری بکەن، لە پیتێکی نەیەنە خوارێ، بەڵکو دەبێ هەردوولای داواکار و داوالێکراو باوەڕیان بەلێکتێگەیشتن و گۆڕانکاری و گەیشتن بە ئەنجام هەبێت، ئەوکاتە بەشێوەیەکی ئاشتییانە و دوور لەهەموو گرژییەك، بەدەم داواکاری گۆڕانکارییەکانەوە بڕۆن، ئەوکاتە پێویست بە ڕوخاندن و دروستکردن ناکات، بەڵکو لەسەر ئەو ئەساسەی کە هەبووە، پڕۆژە و کۆشکی تر دروست بکەن، بەڵام کەی دەگەن بەو قەناعەتە؟ ئەوە وەڵامەکەی لەلای سەرکردەکانی ڕەوت و بزاڤە ئیسلامییەکانە.

## ٣. زاڵکردنی ئایدیۆلۆژیای[١] حیزبی بەسەرکۆمەڵگەدا:

ئەگەر تەماشایەکی کۆمەڵگەی کوردی بکەین، پارتە سیاسییەکان وەکو سەرچاوەیەکی تەمومژاوی هۆکار بوون بۆ هەڵکشان و داکشانی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەشێوەیەکی بەرچاو ڕۆڵیان هەبووە لە بەر تەسککردنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و بوون بە هۆکاری دابەشبوونی کۆمەڵگا بەسەر چەند دیدگا و دونیابینییەکی لێکجودا، لە هەرێمی

[١] حیزبی ئایدۆلۆژی ئەوەیە:یەك تێڕوانین و، یەك شێوازو، یەك هەڵوێستی دیاری هەیە بەرانبەر هەمو ڕوداوە هزری و، ئاکاری و، سیاسی و، فەلسەفیەکان، الموسوعە السیاسیە، عبدالوهاب الکیالی واخرون، ١/٤٢٢.

کوردستاندا حیزبایەتی بەحوکمی ئـەوەی لەچوارچـێوەی ئـەرکی ڕاسـتەقینەی خۆی دەرکراوە، نەتوانراوە وەکو میکانیزمێك بەکار بهێنرێـت بۆخزمـەتکردن بە خەڵك و هوشیارکردنەوەی خەڵك، لەباتی ئەو ئەرکە کراوە بە پەیکـەرێکی هـەرەمی خـاوەن ئایدیۆلۆژیایـەکی تایبـەت، کـە ئـەبێ لەسـەر تـا خـوار لـە چوارچێوەی پارتێکی دیاریکراودا، لەسەر یەك ئایدیۆلۆژیا و یەك قەناعەت و بۆچوون بەڕێوە بچن و بەنامۆ تەماشـای دەورو بـەریان دەکـەن و کـار لەسـەر جیاوازییـەکان دەکـەن و هـەموو بەرژەوەندییـە نیـشتیمانی و بـەها پـیرۆز و بـەرزەکان لـەو چوارچـێوەیەدا کـۆ دەکەنـەوە، تەنهادڵـسۆزی خزمەتـەکانیان پێشکەش بەئەو سەنتەر و ڕێکخراوانە دەکەن کە بەڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ سەر بەپارتەکەیانە، ئەو ڕێکخراو و سەنتەرانەی بەو شێوەیە نـین، ئەوپارتانـە بەشتێکی نامۆ تەماشایان دەکەن و بەدڵسۆزی خۆیانی نازانن، ئەگەر نەشڵێن ئەو ڕێکخراوانەی لەگەڵمان نین دژمانن، بەڵام هیچ خاڵێکی هاوبەش لـەنێوان خۆیان و ئەو ڕێکخراوانەدا نابینن، هەموو ئەم هەوڵانەش لـەپێناو مانـەوەی خۆیـان و دەستاودەسـتپێنەکردنی دەسـەڵاتە بـەمیکانیزمی دیموکراسـی و بـە شـێوەیەکی ئاشـتی و مەدەنیانـە و دوور لـە ململانێـی بـێ شـەرعی و قۆرخکاری، هەموو هەوڵەکان بـۆ سـەرکەوتن و دەسـتگرتنە بـە دەسـەڵاتەوە لەناو پارتی شموولییدا ڕاجیایی ئەوەندە لە دەوروبەر قبوڵ دەکرێت کە خۆیـان سەردەستە و براگەورە و دەمسپی بن، لەسەر ئەم ئایدیۆلۆژیایەش ئەندامان و دۆسـتان و جەماوەرەکـەی خۆیـان پێگەیانـدووە، کـە ئـەم شـێوە پێگەیاندنـە

کاریگەری گەورەی لەسەر هەست و هۆش و دونیابینی و خوێندنـەوەی ئـەوان بەجێهێشتوە[1] . ئەمەش وایکردووە خوێندنـەوەیان بـۆ هـەموو پێکـەوەبوون و کارپێکـەوەکردنێك بگەڕێتــەوە بــۆ ئــەو باگراوەندانــە، بۆیــە ئیــدارەدانی پێکەوەبوون لەلایەن ئەم جۆرە پـارت و ڕێکخراوانـەوە، لـەباتی تۆمـارکردنی گیـانی لێبـوردەیی و چاوپۆشـی لـە یـەککردن و خزمـەتکردنی خـەڵك بـەبێ بەرانبەر و دەستاودەستپێکردنی دەسەڵات، کە بنەمایەکی مرۆڤ دۆستانەیە و هەموو دەقەکانی قورئان و سوننەت و پراکتیزەی ژیانی پێغەمبەر (صلی الله علیــە وســلم)، لەوچوارچــێوەیەدا خۆیــان دەبیننــەوە، هــەموو پــارت و ڕێکخراوەکان وەکو قوتابخانە فەلسەفییەکان باسـی لێـوە دەکـەن لـەوپێناوەدا درووست دەبن، بەڵام ئەم تێگەیشتن و ئایدیۆلۆژیای حیزبایەتیـەی ڕۆژهـەڵات بە گشتی و هەرێمی کوردستان بەتایبەتی، ئامانجەکانی نەپێکاوە و بـووە بـە ئێش و ژان بۆ خەڵکەکەی و هێنانی چەندین نەهامـەتی و شـەڕی نێـو خـۆ و هەوڵدان بـۆ پاکتـاوکردنی یـەکتری، بـە جۆرێـك بـوونی خۆیـان لـە نـەبوونی بەرانبەرەکانیاندا بینیوەتەوە، ئایا بوونی حیزب بـەم شـێوەیە زەرەری زۆرتـرە یان قازانج؟!.

---

[1] ئەمە تەنها ئاماژەیەکە بەو شوێنەوارە خراپەی شێوازی حزبایەتی لە ولآتی ئێمە پێیدا گوزەری کردوە، ئەگەر هەڵسەنگاندن بۆ پارتەکان بکەین ئەبێ دیوە پۆزەتیفەکانیشیان باس بکەین، هیچ کۆمەڵگایەك بەبێ پارتی سیاسی وقوتابخانەی فیکری جۆراو جۆری سەردەمیانە نابێت، چونکە پێداویستیەکی کۆمەڵگایە، بەڵام ئەوەی ئێمە ئێستا قسەی لەسەر ئەکەین هەندێك دیوی نیگەتیفی پرۆسەی حیزبایەتیە کەوا ئێستا هەندێکیان کەم کەم خەریکە بە دەر ئەکەون وپێویستە چاکسازیان پێدا بکرێت.

## ٤. شوێنەواری تێڕوانینی هەستیارانە بەرانبەر بەگۆڕانکارییەکان

### أ- گەشە نەکردن و مانەوە لە قاڵبێکدا:

مەسەلەی گۆڕانکاری کۆسپێکی گەورەیە لە ناوپارتە ئیسلامیەکاندا، بەشێکی بەرچاوی میکانیزمی کارکردن و گوتاریان بۆماوەییەکی مێژوییە و لەسەری ڕاهاتوون، کە لەسەرهەڵدانی ڕابوونی ئیسلامیدا، بیرمەندان و نوسەران ورۆشنبیران وسیاسەتمەدارانی ڕابوونی ئیسلامی لەپەرچە کرداری چەپەکان و ناسیونالیستەکاندا هەمان گوتارو میکانیزم وتێڕوانین ودونیا بینی ئەوانیان دوبارە کردۆتەوە، کە لەسەرەتای پەنجاکانەوە لەزۆربەی جیهانی ئیسلامی و بەتایبەتی جیهانی عەرەبیدا، وەکوکارکردن لەچوارچێوەی دەوڵەتی تەنزیمی و پارتی سەرکردەدا باوبووە[1]، ئەگەر ئەم شێوە گوتار و نووسینانە بۆ قەناعەت پێهێنانی تەوژمی سەلەفی و هەندێك ئەندام وکادیری پارتە ئیسلامییەکانە، ئەوان لەسەر ئەو تێگەیشتنە گەورە بوون و وازیشی لێ ناهێنن، ئەم جۆرە لە کاری سیاسی، هەندێك بابەتی تیۆری لە خۆ دەگرێت و بەس! ئەم شێوە بیرکردنەوەیە وا دەکات بزاڤە ئیسلامییەکان، بەردەوام لە هەڵکشان و داکشاندابن و لە یەك قاڵبدا بمێننەوەو تەنها جموجوڵیشیان هەر لەو جوغزەدا بێت، کە توشی بە خۆوەخەریك بوون و خۆخواردنەوەیان دەکات و ناوبەناو توشی لێك ترازان و پارچەبوون دەبن.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە ئەو سەرکردە و ڕۆشنبیرە سیاسییانە، بە دوای پڕۆژە و میکانیزمی کردەییدا بگەڕێن بۆ پراکتیزەکردنی تیۆرەکان و پلان و

---

[1] ئەم بابەتەلە پەیکەری پارت وڕێکخراوەکان باسکراوە.

پڕۆژەیان هەبێت بۆ چارە سەری واقیعی سیاسی و ئابووری و نەتەوایەتی و زانستی و پێکەوەژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و پەیوەندی و ململانێ نێودەوڵەتییەکان، بەتایبەت هەندێك لەو بزاڤە ئیسلامییانە دەنگی خەڵك بە دەست دەهێنن و دەچنە هەرەمی دەسەڵاتەوە، دەبێ پڕۆژەی جۆراوجۆریان بە دەستەوە بێت، کە بە شێوەی کردەیی وەڵامی خەڵکی پێ بدەنەوەو کێ بڕکێی پارت و تەوژمە عەلمانییەکانی پێ بکەن، کاتی ئەوە هاتووە بزاڤە ئیسلامییەکان لە بیرکردنەوەو تێڕوانینی دەستە بژێری بچنە دەرەوە، بەرنامەو گوتارەکانیان خولیای گەل و جەماوەر بێت، تێکۆشان و بیرکردنەوەیان بۆ هەموو خەڵك بێت، ئەو پلان و گوتارانە بەلای ئەوانەوە گرنگ بێت کە بەلای خەڵکەوە گرنگە، لە چوارچێوەی مامەڵەکردن لە گەڵ بیردۆزەو بابەتە تێۆرییەکاندا بچنە دەرەوەو مامەڵەکردن لەگەڵ واقیع و مەیدان و ژیانی ڕۆژانەی خەڵکدا بکەن، تێڕوانین و جیاوازییە فیکری و فیقهی و ئایدۆلۆژییە جۆراوجۆرەکان، شۆڕ بکەنەوە بۆ ناو قوتابخانەو ناوەندە زانستی و ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی، لە سەر ئاستی تاك و کۆمەڵ قسەو مشتومڕی لە سەر بکرێت، بەڵام لە سەر ئاستی بەڕێوەبردنی وڵات و چارەسەری کێشەی خەڵك، دەبێ پارتە سیاسییەکان بەجۆرێك خۆیان دابڕێژنەوە پلان و گوتار و بەرنامەکانیان ڕەنگدانەوەی هەموو ڕەنگە جۆراوجۆرەکانی خەڵك بن و یەك ڕەنگ و شێوە بەخۆیان نەبەخشن و نەبنە مۆرکی بیروبۆچوونێکی دیاریکراو. ئەوان لە چوارچێوەی پلان و سیاسەت و پیادەکردنی دەسەڵاتەکانیاندا لە چوارچێوەی ڕێکخراوەکان و قوتابخانە جۆراوجۆرەکاندا، ئازادییەکان بۆ خەڵك بڕەخسێنن و هەر لە چوارچێوەی ئەو

ڕێکخراوانەش قەناعەت و بۆچوونە شەخسییەکانی خۆیان پیادە بکەن، لە سەدەی سێیەمی کۆچی و لە کاتی خیلافەی عەبباسییەکاند، لە ساڵی ٢١٨ھ، شوێنکەوتوانی ڕێڕەوی موعتەزیلە لەڕێگەی دەسەڵاتەوە ڕای خۆیان بە زۆر سەپاند بە سەر خەڵکیدا، کارەساتێکی گەورەی لە بواری هزر و سیاسەتدا دروست کرد و چەندین زانا و شارەزایانی ڕێڕەوەکانی تر بە هۆی بەتۆبزی چەسپاندنی ڕا و بۆچوونەکانەوە توشی ئەشکەنجە و زیندانیکردن بوون[1]. وایکرد خۆری ئەو قوتابخانە عەقڵانیە بە یەکجاری ئاوا ببێت، بەڵام کاتێك یەکێك لە خەلیفەی عەباسییەکان[2] داوای لە ئیمامی مالیك کرد کەوا ڕێڕەوەکەی بکرێت بەڕێڕەوی ڕەسمی وڵات و خەڵکی پێوە پابەند بکرێت، لە وڵامدا وتی: کاری وامەکەن هەر وڵاتەو تایبەتمەندی خۆی هەیە، خەڵکی هەر وڵاتێك چ ڕێڕەوێکیان پێباشە با بۆخۆیانی هەڵبژێرن[3]، خۆ لەوانەیە لێکچونی تەواو لە نێوان ئەم دو نمونەیەو ئێستای بزاڤە ئیسلامییەکاندا نەبێت، چونکە ئەوان خاوەن دەسەڵات بوون و لایەنە ئیسلامییەکانیش دوورن لە دەسەڵاتەوە، بەڵام لەو ڕووەوە لێکچوونێك هەیە کە هیچ هێزێك ناتوانێت بەهیچ ڕێگەیەك خەڵکی تر پابەند بکات بە قەناعەتە تایبەتییەکانی خۆیەوە. وە بەردەوامیدان بەم جۆرە ڕیتمە دەبێتە هۆی گەشە نەکردن و بەرەو پێشنەچونی حیزب و مانەوەی لە چوارچێوەیەکی لاوازدا، چونکە سروشتی پارتی سیاسی

[1] الموسوعة الميسرة، فى المذاهب والاديان المعاصرة، د. مانع الجهنى، چاپی پێنجەم، ٢٠٠٣، ١/ ٦٥.

[2] هەندێك ئەڵێن ئەبوجەعفەری مەنسوربوە، هەندێکی تر، ئەڵێن هارون الرشيد بووە، موطأ، امام مالك، دارالقلم، چاپی یەکەم ١٩٩١، ج ١/ص: ٣٣.

[3] سەرچاوەی پێشو١/ ٣٣.

وایە، کە وەستا جێدەمێنێت و لە ئاست ڕووداو و پێشهاتەکانی ناوچەکەدا نابێت، کادیر و ئەندامە چالاکەکانی و دڵسۆزانی، ساردبوونەوەو ڕوویان تێ دەکات و هەندێ جاریش توشی دابڕن دەبن، کە لە ئەنجامدا لە دەرەوەی حیزب، خەریك دەبن بە کار و پرۆژەی تری سیاسی و ڕێکخراوەیی جۆراو جۆرەوە، پاشان مەگەر بەدەگمەن لەو شکڵ و شێوەیەی پێشوودا خۆیان لەناو ئەو پارتەدا نابیننەوە، ئەو مەترسیانەی لەکاتی گۆڕانکارییدا چاوەڕوان دەکرێت، بە هەمان شێوە لەکاتی ئەنجام نەدانی گۆڕانکاریشدا، بە زیاترەوە چاوەڕوان دەکرێت، لەگەڵ بوونی یەك جیاوازییدا، ئەویش لەکاتی ئەنجامنەدانی گۆڕانکارییدا، چاوەڕوانی دروستبوونی ئۆپۆزسیۆن و کەسانێکی ڕەخنەگر دەکرێت پەیدا ببن، بە بێ ئەوەی ئامادە بن هیچ دەستباریك لەگەڵ ئەو پارتەدا بگرن، ئەوەی کە گرنکە بیکەینە کۆتا قسەمان ئەوەیە: لەڕەخنەگرتن و ئاڵوگۆڕی ڕا و بۆچوونەکان لە قەبارەی خۆی زیاتر گەورەی نەکەین، مەرج نییە هەموو ڕەخنەیەك سەدلەسەد لە جێگەی خۆیدا بێت، هەروەکو چۆن، ئەگەر مکوڕبوونی بابای ڕەخنە لێگیراو نەبوایە لە سەر کەموکورتی و هەڵەکانی، هیچ دەستە و گروپێکی ڕەخنەگر دروست نەدەبوو، دەبێ لامان گرنگ نەبێت لە کوێین، بەڵکو ئەوەمان لاگرنگ بێت، چ جۆرە کارێك ئەنجام دەدەین، چەنێك خزمەت بە پرۆسەی چاکسازی و بەرەوپێش بردنی کاری ئیسلامی دەکەین؟ هەمووومان ئامادەبین بەخۆداچونەوە بکەین، ڕایەکان و ئەو حاڵەتانەی دەقمان پێوە گرتووە، لێمان نەبێت بە ڕێبازێکی نەگۆڕ، کە نەتوانین لێی لابدەین، هەرچەند هەموو دەستە و جەماعەت و پارتێك، وەکو چۆن دامەزرێنەر و بەڕێوەبەرەکانیان تەمەنێکی

دیاریکراویان هەیە، بەڵام ئەنجامدانی هەندێك کاری چاکە، لەگەڵ دایك و باوك و کەسوکار، تەمەن درێژ دەکات، بەهەمان شێوە گۆڕانکاریکردن و لابردنی خاڵە نیگەتیفەکان و بەخۆداچونەوە، تەمەنی پارت و ڕێکخراوەکان درێژ دەکەن و نوێیان دەکەنەوە، وەکو ئەوەی تازە لە دایك بووبن.

ب- شەخسەنەکردن:

لە کاتێکدا تەوژمی گۆڕانکاری تێکەڵ بە کەسەکان کرا، دەبێتە مایەی بە هەستیاریکردنەوە مامەڵەکردن لەگەڵیاندا، بۆیە کاتێك داواکاری لە سیستمی سیاسیدا، سەری هەڵدا، دەبێ پارتەکان لێی ورد بنەوە، بزانن خەون و خەیاڵی چەند کەسێکە، یان تەوژمێکە، ئەگەر تەوژم بوو دەبێ بە ئەندازەی بارستایی خۆی بچیت بەرەو پیری، نابێ لەو کاتەدا وەکو ڕای فلان کەسێك، یان دەستەو گروپێك، هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکرێت، دروست بوونی تەوژم و ڕاجیایی لەناو هەر پارتێکدا، وەکو حاڵەتێکی سروشتی مامەڵەی لەگەڵ ناکرێت، کە بەزۆرینەو کەمینە و بە دەنگدان بابەتە خیلافییەکان، چارەسەر بکرێت، تەوژمێك کە سەرهەڵ دەدات لەوانەیە لە قۆناغێکدا یەك کەس نوێنەرایەتی بکات و بانگەشە و تەنزیری بۆ بکات، بەڵام تەوژم زۆر بە پەلە تەشەنە دەکات و بڵاودەبێتەوە، حیزبی شیوعی کاتێك دروست بوو لەماوەیەکی زۆر کەمدا بەشێکی زۆری جیهانی گرتەوە، بزاڤی ئیخوان المسلمین کە سەری هەڵدا لەماوەیەکی کەمدا لەزۆربەی وڵاتانی جیهانی ئیسلامیدا پێگەی بۆ دروست بوو، کاتێك ئێمە بڕیارماندا کۆمەڵی ئیسلامی ڕابگەیەنین، لە ماوەی کەمتر لەساڵێك زەمینەی بۆ سازا، کاتێك گۆڕان

دروستبوو لەیەکەم هەڵبژاردندا لەپارتی دایك دەنگی زۆرتری هێنا، بۆیە بە حوکمی هاوڕابوون لەگەڵ تەوژمدا، هەموو ئەوانەی ڕۆژێك قاوەیەکیان پێکەوە نەخواردووەتەوە، ئامادەن پێکەوە کار و پڕۆژەی هاوبەشیان هەبێت و پێکەوە چالاکی جۆراوجۆر بنوێنن، بۆیە نابێ لە پێگەو سەنتەرەکانی بڕیارداندا بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە، بەزۆرینەو کەمینە، مامەڵەی لەگەڵ بکرێت، بەڵکو دەبێ بۆ سوودوەرگرتن لە خاڵە پۆزەتیڤەکانی ئەو تەوژمەو خۆ بەدورگرتن لە خاڵە نیگەتیفەکانی کاری لەگەڵ بکرێت و گوێ لەبەرانبەر بگیرێت و زۆر بە نەرمی و لێزانین و لێك تێگەیشتن مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.[1]
بەدرێژایی مێژوو وابووە هەرکاتێك بەبایەخەوە گوێ بۆ ئەوکەسانە نەگیرابێت، کەداوای گۆڕانکاری دەکەن، لەئەنجامدا بەربەرەکانێ کەوتۆتە نێوان دوو بەرەی موحافیزکار و نوێخوازەوە، کە ئەمەش سەرەتایەك بووە، بۆ دروستبوونی جیاوازی فیکری لە ناو ئەو پارتەدا، خۆ ئەگەر موحافیزکارەکان بیانەوێ سود لەتوانای گەنجەکان و کەسانی نوێخواز وەربگرن، پێویستە بگەن بە پڕۆژە و لێکتێگەیشتنی هاوبەش و ڕێز لە ڕاوسەرەنجی نوێخواز و بیرە تازەکان بگرن.

[1] دیل کارنیجی ئەڵێت: لای ئێمە لەکالیفۆڕنیا دوو جۆر داری بی و داری چناری لێ بوو کاتێك ڕەشەبا هەڵی ئەکرد، دار بیەکان نەرم بوون ئەچەمینەوە، دوای تەواو بونی ڕەشەباکە وەکو خۆیان لێ ئەهاتەوە، بەلاّم چەنارەکان ڕەق بون، لەکاتی ڕەشەباکەدا نەدەچەمینەوە، بۆیە ئەوان لەناوەڕاستا ئەشکان، تەوەژم وەکو ڕەشەبا وایە ئەبێ بە نەرمی مامەڵەی لەگەڵ بکەیت.

## ت-    ڕەتکردنەوەی ئەزموونی گەلانی تر

دوای ڕوخانی ڕژێمی پارتی بەعس لە عێراق لە ٢٠٠٣دا، سیستمی تازەی جیهانی، لەلایەن ئەمریکاوە، لەچوارچێوەی سیستمی دیموکراسیدا پشتیوانی لیٚ دەکرێت، لەو دەرگایەوە چەندین ڕێکخراوی جۆربەجۆر دەستیان بەکارو چالاکی خۆیان کرد، لەو نێوەندەشدا ڕێکخراوەکانی ndi و iri[١]، لەعێراقدا بۆ هوشیارکردنەوەی خەڵك لەسەر چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ سیستمی دیموکراسیدا، دەستیان بەچالاکی خۆیان کرد، لەسەرەتای ٢٠٠٩ لە هەرێمی کوردستانیش دەستیان بەکار و چالاکییەکانیان کرد[٢]. پارتە شیعییەکانیش لە سەرەتاوە زۆر بەگومان بوون لەو ڕێکخراوانە، بە پیلانیان ئەزانی بۆ تێکدانی یەکڕیزیی ماڵی شیعیی و لەت و پەتکردن و دوورخستنەوەی پارتەکان لە یەکتر و کەمکردنەوەی متمانە بە سەرکردایەتیە مێژووییەکانیان،[٣] لەکاتی دەست بەکاربوونیان لە هەرێمی کوردستاندا، خولی جۆراوجۆریان بۆ هەموو لایەنەکان دەکردەوە، لایەنە ئیسلامییەکانیش

---

[١] Ndi ساڵی ١٩٨٣ دامەزراوە، تێڕوانینی ئەم ڕێکخراوە وایە: پارتەکان لەباتی ئەوەی توانا و وزەی خۆیان لەهەڵبژاردنەکاندا بەخەرج بدەن، وا چاکە هەمو تواناکانی خۆیان بخەنەکار بۆ دروستکردنی  پارتێکی سەرکەوتووی تەمەن درێژ. الاحزاب السیاسیه والانتقال الی الدیمقراطیة، ٢٠٠٤، ل: ١٧. وە ئەم ڕێکخراوە سەر بەپارتی دیموکراتەکانی ئەمریکایە، ڕاستەوخۆ پەیوەندی بەدامەزراوەی نیشتیمانی:ned وە هەیە، کە ئەویش دەزگایەکی هەواڵگریە: ئەمریکاو بریتانیاو ئوسترالیا، ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی ئەکەن، وەبەهەمان شێوە، هەر ئەو دەزگایەش، سەرپەرشتی، پەیمانگای نێو دەوڵەتیiri ئەکات کەپارتی کۆمارییەکان بەڕێوەی ئەبەن، سایتی: یمانی نت.

[٢] سایتی: غارعەشتار.

[٣] سایتی: غار عەشتار.

بە هەمان شێوە بە کادیر و ئەندامەکانیان، لە ئاستێکی بەرچاودا بەشدارییان تێدا کرد.

کردنەوەی خولەکانی ndi، لە هەرێمی کوردستاندا کاردانەوەی گەورەی لە سەر هزر و بەڕێوەبردن و تێڕوانینی بەشدار بوان، لە لایەنە ئیسلامییەکان و لایەنەکانی تر دروست کرد، جگە لەوەی بەشداربوان خۆشیان تێبینی و سەرەنجیان هەبوو لە سەر سیستمی بەڕێوەبردنی پارت و لایەنە ئیسلامییەکان، ئەو خولانە هوشیاری زیاتری پێدان، لە بوارەکانی: گوتاری جەماوەری و ئازادی ڕادەربڕین و دەستاودەستکردنی دەسەڵات و پەیوەندی نێوان سەرکردەو ئەندامانی پارت و ڕەهایی دەسەڵاتی پارتەکان و بەڕێوەبردن، بەشداربوانیش بە نەرمی ئاوێتەی ئەو دیدە تازەیەی کاری حیزبی و بەڕێوەبردن دەبوون، لە ساڵی ٢٠١٢ بە دواوە ئەو کادیر و ئەندامە بەشدار بوانە، تێڕوانین و بۆچوونی تازەو تایبەتیان پێشکەش دەکرد، هەندێکجار لەگەڵ ڕای ڕەسمی سەرکردایەتیدا تێکگیرانیان بۆ دروست دەبوو کە سەرکردایەتی وەکو پێویست گوێیان بۆ سەرەنج و تێبینییەکانیان نەدەگرت، ئەوانیش ناچار دەبوون لە میدیاو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە ڕەخنەو تێبینییەکانیان لە سەر پارتەکان بڵاو بکەنەوە، لەو سەروبەندەشدا ئەو تەوژمە دەستیان بەجموجوڵ و چالاکی کرد و چەندین ڕێکخراوی جۆراوجۆر سەریان هەڵدا، کە لە چوارچێوەی ئەو ڕێکخراوانەدا ڕا و سەرەنجەکانی خۆیان دەخستە ڕوو لەنێولایەنە ئیسلامییەکاندا دوو تێڕوانین بۆ کاری حیزبایەتی و پێکەوەبوون پەیدابوو تێڕوانینێکی تازە داوای گۆڕانکاری دەکردو بەسیستم و شێوازی پێشوو ڕازی نەبوون. تێڕوانینێکی پارێزکار، کە لە ڕووی تێڕوانینە

تازەکەدا وەستان و قەناعەتیان پێی نەبوو بۆیە لە نێو پارتە سیاسییەکاندا چینێکی بەرچاو لەئاستەکانی سەرکردایەتی و کادیرە باڵاکان، پێگەیشتن و بوون بە خاوەنی ڕای خۆیان، خوێندنەوەی خۆیان بۆ واقیع و ڕووداوەکان هەبوو ئەمەش وایکرد دوو ڕێڕەوی جودا لەنێو پارتەکاندا بەتایبەت پارتەئیسلامییەکان دروست ببێت.

ئەمە تا ئێرە زۆر باشە و هەمووکەس مافی خۆیەتی سەرچاوەی زانیاری و پێگەیاندنی خۆی بەر فرەوان بکات و سوود لە ئەزموونی گەلان وەربگرێت، بەڵام ئەوەی جێگەی تێڕامانە لەلایەك پارتە سیاسییەکان زۆر بەخەمساردی مامەڵەیان لەگەڵ ڕەخنەو سەرەنجەکانیان دەکرد و نەیان توانی بەجۆرێك هەڵسوکەوت بکەن بتوانن ڕا و سەرەنجە تازەکان ئاوێتەی پارتەکانیان بکەن، لە لایەکی تریشەوە ئەوانەی هەڵگری بیری نوێ بوون نەیان توانی وەکو تەوژمێکی خاوەن ئایدیای ئۆپۆزسیۆنی بیندرێژ بەردەوام بن لەسەر خەباتی خۆیان و خەڵکی بە ڕا و سەرەنجەکانیان ئاشنا بکەن، قەناعەت بە زۆرترین لەئەندامان وکادیرانی ئەو پارتە بکەن، لە کۆنگرەکاندا دەنگ بە هەڵگرانی پەیامی نوێ خوازی بدەن و تەقەللای خۆیان بدەن زۆرترین کەسەنوێخوازەکانیان بچنە شوێنە هەستیارەکان، بۆ ئەوەی بتوان زۆرترین گۆڕانکاری لە پارتەکەیاندا بکەن، لەوانەیە بەشێك لەوکادیرانەی دوای نا ئومێدبوون لە چاکسازی بە پاساوی ئەوە لە پارتەکانیان دور بکەونەوە، کەمانەوەیان دەبێتە هۆی ململانێی بێ واتای پڕوکێنەر و کات بەزایەدان، لەم حاڵەتانەدا بۆ گەیشتن بە بڕیارێکی ڕاست و دروست، هەڵسەنگاندنی زانستی و پشوودرێژی و حەوسەڵەو دان بەخۆداگرتنی دەوێت، کە ئایا لەناو

پارتەکەیدا بمێنێتەوەو بەنەرمی و ڕوونی و ڕاشکاوی کار بکات بۆ گۆڕانکاری باشـترە، یـان بـچێتە دەرەوەی پارتەکـەی و لـەوێ لەچوارچـێوەی چـالاکی جۆربەجۆردا کار بکات؟ وەکو لە ناوپارتەکەدا ئەگەری کات زایـەکردن هەیـە بەهەمان شێوە لەدەرەوەش ئەو ئەگەرە هەیـە، چـونکە لـە دەرەوەش خـەڵکی ڕەخنەگری نوێخواز چاوەڕێی بەرهەمی کارەکان و ئەنجام دەکات، ئەگەر لەناو پارتەکەدا بمێنیتەوە دەتوانیت وەکـو تـەوژمێکی ئۆپۆزسـیۆن هـەموو کـەم و کورتییـەکان بخاتـە سـەر پارێزکـارانی نـاو حیـزب، لـەو حاڵەتـدا عەیبـەو کەموکورتی ئەو تەوژمە بەدەرناکەوێت، بەڵام لەدەرەوەی پارت خەڵکیی کـەم وکورتییەکان دەبینن و چاوەڕێی جێبـەجێکردنی نەخـشەو پلانـەکان دەکـەن و داوای سەقفێکی زەمەنی دیاری کراو دەکەن، لەو حاڵەتانەدا یـەك هـەنگاوی دیراسەنەکراو و دوور لە شیکاری بنرێت زەرەرێکی گەورەی چەند قات مانەوە لەناو حیزبدا دەدات، چونکە شوێنکەوتوانی و خەڵکی بەگـشتی زۆر بـەوردی تەماشای بابای ڕەخنەگر دەکەن، لەوانەیە سـانتیمیترێکی هەڵـەی لـێ بکـەن بەکیلۆ میترێك، چونکە لای خەڵکی ئاساییە کەسانێك بەگەندەڵ و خۆسەپێن و تێکـشکاو لەبەڕێوەبردنـدا ناویـان دەرکـردووە، گـوێ بـۆ خـەڵکی نـەگرن و گەندەڵ کار و بێ ئیدارە بن، بەڵام ئەوەیان قبوڵ نیە بۆ کەسـانێك بانگەشـەی چاکـسازی دەکـەن و لـەواقیعێکی خـراپ دور کەوتوونـەوە بـۆ نـەهێڵانی کەموکورتییـەکان ئـەوانیش بەهەمانـشێوە جۆرێـك لـەو کارانـە دووبـارە بکەنەوە[1].

---

[1] کە لەپێناسەی کێ بڕکێدا زیاترباسی دەکەین.

### پ- بەکەم بە بایەخ تەماشاکردنی ڕا جیاوازەکان:

ئەوانەی لە ژینگەی پارتێك یان ڕێکخراوێکدا کار دەکەن، لە کاتێکدا هەستیان بە نەخۆشی و کەموکورتی و خاڵە لاوازەکانی کرد هەرکەس لەڕێگەی خۆیەوە و بە ئوسلوبی خۆی دەگەڕێت بە دوای چارەسەردا، لەم حاڵەتدا ئەوەی جێگەی مەترسیە کەمێك هەست بەو نەخۆشیانە بکەن و ئەوانیتر ئەو کەموکورتیانە نەبینن کەوا ئەمان دەیبینن، لەم کاتەدا ئەمانە ئەو ڕێگەچارانە ناگرنەبەر ئەوانەی هەستیان بەنەخۆشییەکان کردووە و دەیگرنە بەر، ئەوانەی هەست بەنەخۆشیەکە دەکەن و گوێیان بۆناگیرێت، وەکو ئەو کەسەیان لێ دێت کە نەخۆشی گرانەتایەتی هەرچەند هاوار دەکات دەوروبەر باوەڕی پێ ناکەن و ئەڵێن وەسوەسەیە عەیبی نیە، لەم کاتەدا نەخۆشەکە ناچار دەڕواتە تاقیگەکان بۆ سەلماندنی نەخۆشیەکەی بۆدەوروبەر، بۆ ئەوەی ئەگەر چارەسەریشیان بۆ وەرنەگرت قەناعەت بکەن کە نەخۆشە، بۆیە لەکاتێکدا لەناو لایەنە ئیسلامییەکاندا ئەم دیمەنە ڕوویدا، ئەوانەی ڕەخنە و تێبینیان هەبوو لە ڕێکخراوەکاندا خولی جۆربەجۆریان بینی کە هەموو زانیاری و ئەزموونی ئەوانیش پشتڕاستکردنەوەی سەرەنج و تێبینییەکانی ئەمان بوو، لێرەدا ڕەخنەکە ئەوەیە کە نەدەبوو لەسەر ئاستی باڵای پارتە ئیسلامییەکان، بە هاوشێوەی کابرای نەخۆش بە کەمبایەخەوە تەماشای سەرهەڵدانی بۆچوونی تازە بکەن، نەدەبوو بەوشێوازە مامەڵە لەگەڵ بانگ و هاوارەکانیاندا بکەن، نەدەبوو بەوشێوەیە تەماشای کادیرەکانیان و ئەو ڕێکخراوانە بکەن کە سەرکردایەتی و زۆرینەی ئاستە باڵاکان، وەکو بابەتێکی لاوەکی مامەڵەیان لەگەڵ بکەن.

له بەر ئەوەی سەرکردایەتییەکان کەمتر بەشداریان لەو خولانەدا دەکرد، ناوبەناو بەگوێرەی داوای ڕێکخراوەکان، ئەندامی هەندێك لە ئۆرگانەکانیان دەنارد، هەندێك سەرکردایەتیش ئەگەر ئارەزوویان لێبوایە، بەشدارییان تێدا دەکرد، لەکاتێکدا خاوەن بیری نوێخواز و ئەو کەسانەی داوای پێداچونەوەیان بە شێوازی بە ڕێوەبردن و کاری حیزبایەتیدا دەکرد، لەباتی ئەوەی بێ بایەخ تەماشای ڕایەکانیان بکرێت، دەبوو بە چاکی گوێیان لێ بگیرێت و هەستیان بە قورسایی خۆیان بکردایە لای سەرکردایەتیەکەیان، بۆ ئەوەی ئەو بۆ چونە تازانەی لە نێو پارتەکاندا لەسەر هەڵدان و گەشەکردندان بوو سوودیان لێ ببینرایە، دەبوو سەرکردایەتی و ئاستە باڵاکانی پارتە ئیسلامییەکان لە سەر لێکۆڵینەوەو بەرچاو ڕۆشنی و دونیابینیەکی تەواوە بیانڕوانیایە بۆیان و لەپێشەوە خۆیان لەو خولانەدا بەشدارییان بکردایە، ئەو تێگەشتن و بۆچوونانەیان بۆ بەڕێوەبردن و سیستمی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنی و بەڕێوەبردنی پارتی سیاسی قبوڵ بکردایە، خۆیان ئەو پرۆژەو پێشنیازانەیان پێشکەش بکردایە، ئەگەر بە بەشێك لە ئەندامەکانیان بەشدارییان تێدا بکردایە، ئەوکاتە ڕای جیاواز دروست نەدەبوو. هیچ جۆرە تێکگیرانێکیش لە نێوان ڕای سەرکردایەتی و کادیرە بەشداربووەکان دروست نەدەبوو.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە بۆچی دەبێ داوای گۆڕانکاری لە سیستمی حیزبایەتی و بەڕێوەبردندا تەنها داوای بەخۆدا چونەوە لە لایەنە ئیسلامییەکان بکرێت؟ خۆ لایەنە چەپ و

ناسیۆنالیستەکان، کەموکورتییان ئەگەر لەلایەنە ئیسلامییەکان زۆر تر نەبێت، هیچیان کەمتر نیە؟!

وەڵامی ئەم پرسیارە سێ ڕەهەندی هەیە: ڕەهەندی یەکەم: ئەوانیش باجی ئەنجامنەدانی گۆڕانکارییان داوەو گرفتی گەورەی نێوخۆییان هەیە، دیارترین نموونەش دروستبوونی بزووتنەوەی گۆڕان و لەتبوونی یەکێتی نیشتمانیی بوو. ڕەهەندی دووەم: بەشێك لە چەپەکان دوای ڕووخانی بلۆکی ڕۆژهەڵات لە ١٩٩١ بەدواوە، ڕویان کردە پارتە سۆشیال دیموکراتەکانی ڕۆژئاوا، تا ئەندازەیەکی کەمیش بێت سودیان لە سیستمی حیزبایەتی و بەڕێوەبردنی پارتە چەپەکانی ڕۆژئاوا وەرگرت، لەوکاتەدا بۆ ئەوان پشوودانێك بوو. ڕەهەندی سێیەمیش: ئەوان هەندێکیان گەیشتون بەدەسەڵات و خاوەن هێزی سەربازی و سەرچاوەی دارایی و بڕیاری سیاسین، ئەمەش وایکردووە، ڕەخنەی ئەندامانیانی کەمی کردووەتەوە، زۆریش گوێ بۆ داوای شەقام ناگرن، تا فشارەکانی خەڵك گۆڕانکارییان پێ بکات. ئەم دوو هۆکارە ئەگەر بەلاوازییشبێ هێشتویانیەتیەوە، بە شێوەی لایەنە ئیسلامییەکان کەموکورتییەکانیان لێ دەرنەکەوتووە.

گـەرەترین هێمـای پێکـەوەژیانی کۆمەڵایـەتی، لەجێگـەی ململانـێ و هەوڵـدان بـۆ سـڕینەوەی ئـەویتر و پەراوێزخـستنی ئەنجامـدانی کێبڕکێیـە بەکۆمـەڵێك پرەنـسیپ و میکـانیزمی سـەردەمیانە و مـرۆڤ دۆسـتانە، هەنگاونانە بۆ ڕێکەوتن لەسەر چۆنیەتی پێشبڕکێ و لێکپێشکەوتن، زۆرترین خۆماندوکردن بۆ زۆرتـرین خزمـەت بـەهاوڵاتیان و پێـشکەشکردنی باشـترین بەرهەم پێیان.

## ١. پێناسەی کێبڕکێ

کێبڕکێ، یان پێش بڕکێ بۆ ئـەو کەسـانە بـەکار دێـت، کەدەیانـەوێت بـۆ بەدەستخـستنی قـازانج و پلـە و پایـە، زۆر تـرین دەسـکەوتیان هـەبێت و گەورەترین پـشکیان بـەر بکـەوێت، لـە ڕووی مـادی و مەعنـەوی و ئاکـار و پێگـەی زانـستی و نـاو و ناوبـانگی کۆمەڵایەتیـەوە، بـەبێ ئـەوەی لـەهیچ ڕوویەکـەوە زەرەر لەبەرانبـەرەکانیان بـدەن لـە سـەر ئـەرك و مانـدووبوون و شـەونخونی خۆیـان پـێش بەرانبـەرەکانیان بکـەون، هـەرکات چـووە قۆنـاغی زەرەرگەیاندنی مادی یان مەعنەوی بـە بەرانبـەر، یـان دەوروبـەر ئـەوە پێـی دەوترێت ململانێی بێـزراو. لەچوارچێوەی پیـشبڕکێی ڕێگـە پێـدراو دەچێتە دەرەوە.

لە دەقەکانی قورئان و فـەرموودە و سەرچـاوەکانی زمـانی عەرەبیـدا بـەم شێوەیە لێکدانەوە بۆ کێبڕکێ کراوە، (منافسە) کێبڕکێ لە فیعلـی (نـافس) وەرگیراوە، کە بۆ کێبڕکێی کەسانێك، یـان چـەند پـارت و ڕێکخراوێـك، یـان نەتەوەکان لەنێو خۆیانـدا دێـت، بۆگەیـشتن بـە بـەها و ئامانجـە بـەرزەکان و

پێشکەشکردنی باشترین خزمەت، هەر شتێك جێگەی تەماح و چاوتێبڕینی خەڵکی بێت و دڵیان پێوەی بەسترابێت و حەزی لیَ بکەن و هەوڵی بۆ بدەن، ئەوە پێی دەوترێت: (نفیس)[1]، (نفیس) بەمانای خۆ ماندوکردن هاتووە، بۆ ئەوەی خۆی بچوێنێت بەچاکترین کەس، کارەکانیشی بە باشترین کار، بەبێ ئەوەی زیان بە کەسی تر بگەیەنێت، یان سەرکەوتنەکەی لەسەر حیسابی کەسانی تر بێت، بەڵکو ئەیەوێت بگات بە ئاستی سەرکەوتوەکان و بچێتە ڕیزی ئەوانەوە[2]. لەزاراوەشدا (منافسە) بەو پلان وکارانە دەوترێت، چەندکەسێك، دایدەڕێژن و لەسەری دەڕۆن، بۆگەیشتن بەئامانجە باشەکانیان، ئەگەر ئامڕازی خراپی تێدا بەکار نەهات، پێی دەوترێت کێبڕکێی شەریف، ئەگەر ئامڕازی نا شەرعی، یان دژ بەعورف، یان پێچەونەی یاسای، تێکەوت ئەوە مونافەسەیەکی ناپاکە، وەکو پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وەصفی دەکات: **(وَلَكِنِّي أَخْشَي عَلَيْكُمْ أَنْ تُبْسَطَ الدُّنْيَا عَلَيْكُمْ كَمَا بُسِطَتْ عَلَي مَنْ كَانَ قَبْلَكُمْ فَتَنَافَسُوهَا كَمَا تَنَافَسُوهَا وَتُهْلِكَكُمْ كَمَا أَهْلَكَتْهُمْ)**[3]، کاتێك قوتابیان لەنێو خۆیاندا هەوڵ دەدەن بۆ بەدەستهێنانی بەرزترین نمرە، یان کاتێك فرۆشیارێك هەوڵ دەدات کەلوپەل زۆربکات لەناوچەی دیاریکراوی خۆیدا، ئەمانە پێیان دەوترێت کێبڕکێ، بەڵام کاتێك قوتابی بۆ بەدەستهێنانی نمرە فێڵی کرد، یان کابرای فرۆشیار بۆساغکردنەوەی کەلوپەلەکانی زیانی

---

[1] تاج العروس، الزبیدی، ٤١٦٨/١، باب: نفس، وة : تفسیر روح المعان، آلوسی، ٣٠/ ٧٦، وة: لسان العرب، ابن منظور، باب السین.

[2] سەرچاوە؟

[3] بوخاری، ٤٠١٥/٣٧٧/١٢، وموسلیم، ٢١٢/٨/ ٧٦١٤.

بەدەوروبەر گەیاند، ئەوە پێی دەوەترێت ململانێی ڕێگە پێنەدراو پێویستە بەیاسا چارەسەر بکرێت، قورئان دەربارەی مونافەسە دەفەرموێت:(**وَفِي ذَلِكَ فَلْيَتَنَافَسِ الْمُتَنَافِسُونَ**)[1]، قورئان وەکو باسی مونافەسەی کردووە بە هەمان شێوە باسی موسابەقەشی کردووە، کە بە واتای پێشبڕکێ دێت، هەردوو زاراوەکە لە بەر ئەوەی بۆ کاری چاك و خراپ، یان ئامڕازی شەرعی و ئامڕازی بێ شەرعی بەکار دەهێنرێت، قورئان ئەو دوو زاراوەیەی بەڕەهایی بەکارنەهێناوە، بەڵکو بەکارهێنانی هەردوکیانی بەستووەتەوە بەکاری خێر و چاکەوە، کە بۆ بەدەستخستنی پلەکانی بەهەشت وشەی مونافەسە بەکار هاتووە، لە موسابەقەشدا، وەکو لە سورەتی (البقرة)و سورەتی (المائدة)دا هاتووە، لە هەردووکیاندا، موسابەقەکە پاڵ دەداتە پاڵ کاری خێر، وەکوو دەفەرموێت: (**فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ**)[2] ڕاڤەکارانی قورئان و شارەزایانی زمان، بەم شێوەیە ئاماژەیان بە واتاکەی کردووە: کاتێك دوو ئەسپ سوار لە نێو خۆیاندا پێشبڕکێ دەکەن یەکێکیان لەوی تریان پێش دەکەوێت، (**والمسابقة طلب السبق**)[3]وە (استبق)ەی پێ دەوترێت، وەکو لە قورئاندا خوای باڵادەست لە بەسەرهاتی یوسف (درودی خوای لەسەر بێت) و هاوسەرەکەی گەورەی میسردا دەفەرموێت: (**وَاسْتَبَقَا الْبَابَ**[4])[5]، بۆیە کێبڕکێ بە ئەوە ناوترێت،

---

[1] المطففين: ٢٦.

[2] البقرة: ١٤٨.

[3] لباب التأويل، في معاني التنزيل، الخازن، ١٢/٤.

[4] يوسف: ٢٥.

[5] تهذيب اللغة، الازهري، الباب الاول، ٢٠٦/٥.

تەنها کار بۆ لەناوبردنی هەستکردن بەکەموکورتییەکانی ناخ بێت و هەموو خۆ ماندوکردنێکیش بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییە دەروونیە و پەیداکردنی ناو و ناوبانگ و تێکشاندنی بەرانبەر بێت، بەڵکو ئەوە دەچێتە چوارچێوەی ململانێی ڕێگەپێنەدراوەوە، لەبەرانبەر ئەو دوو وشەیەدا وشەیەکی تر هەیە، کە وشەی: **(مصارعة)**یەکە بەمانای زۆرانبازی و دانبەزەویدا و ململانێکردن هاتووە، کە لەڕووی زمانەوانیەوە جودایە لەواتای مونافەسەو موسابەقە[١]، پێویستە ناوبەناو هەڵوێستە لەسەر کێبڕکێکانمان بکەین و لەخۆمان بپرسین ئایا دوورە لەوخڵتەو نەخۆشییانە یان نا؟ وە دووەم پرسیار لەخۆمانی بکەین ئەوەیە: ئایا ئێمە وەکو یەك تیم کار دەکەین بۆ سەرخستنی پرۆژەکانمان؟ یان کارەکان بۆ سەرخستنی کار و بەرژەوەندی و ناو و ناوبانگی کەسیە؟ چونکە وشەی کێبڕکێ و پێشبڕکێ هیچیان بۆ تاك بەکارنایەت، بەڵکو لەنێوان تێکەڵەیەکدا بەکاردێت، کە کارەکانیان لە یەك بچێت و ئومێد و ئامانجی هاوبەش کۆیانی کردبێتەوە، سروشتی کارکردن بەتیم وایە هەموو کاراکتەرەکان هاوبەشن لەچالاکییەکاندا، مۆری کەسێك یان چەند کەسێکی پێوە دیارنیە، بەڵکو هەموویان لە شەرەف و ناوبانگی تیمەکەدا بەشدارن، ئەوکاتە هەست بەکەمی لای کەسیان دروست نابێت و ناخی دوور دەبێت لەوەسوەسەیی، جا بۆ من خۆم ماندو بکەم کە بەرهەمەکەی بچێتە گیرفانی یەکێکی ترەوە، یان ناچار بکرێت بۆ ئەوەی ئەم وەسوەسانە بەدڵیدا نەیەت، ئەویش هەوڵبدات، چالاکی خۆی دەربخات، تاخەڵکی بزانن ئەمیش یەکێکە

[١] لسان العرب، ابن منظور، ج ٨/ حرف الصاد.

لەکاراکتەرە چالاکەکان و بەبێ ئەم بڕیار نادرێت و بڕیاریش هەڵناوەشێتەوە، کە ئەمەش کاری بە تیم لە ڕاستەڕێگەی خۆی لادەدات، وەکو ڕاستگۆییەك لەگەڵ خۆمان و دەوروبەرمان دەبێ دان بەوەدا بنێین مرۆڤ خۆی خۆش دەوێت، حەز بەسەرکەوتن دەکات و زۆر نیگەرانیشە لە تێکشکان، یان ببینێت خەڵکی بەبێ ڕەزامەندی خۆی بۆ گەیشتن بە ئامانجە شەخسییەکانیان، سوودیان لە هەوڵەکانی ئەو وەرگرتوە، لێرەدا ئەوانەی کە ئامانجی پیرۆزیان هەیەو باوەڕیان بە کێبڕکێی شەریفانە هەیە، خۆیان ناخەنە مەیدانی ململانێی کەسیەوەو هەوڵی گۆڕانکاری و بنبڕکردنی نەخۆشییەکان و بەدامەزراوەییکردنی دامودەزگا و ڕێکخراو و پارتەکان دەدەن، ئەگەر نائومێد بوون لەچاکسازی، ئەوکاتە بۆ ئەوەی نەبن بە بەشێك لە نەخۆشییەکان، دەبێ تێرا بمێنن، لە نێوان مانەوە لەنێو ئەو واقیعەدا و هەوڵی چاکسازی بدەن؟ یان دوورەپەرێزی بکەن و هیچ بەرپرسیاریەتیەکی کار و پرۆژەکانی پێشوو هەڵنەگرن، یان خەریك بن بە پرۆژەی تاکە کەسیەوەو لە چوارچێوەی ئەوەی کارێك هەمووی نەکرا، ناکرێت هیچی نەکرێت؟ یان بچنە دەرەوەی ئەو بەرنامەو پرۆژانەو خۆیان بۆخۆیان، خەریکی کار و چالاکی تر بن و چیان پێ چاك بوو ئەنجامی بدەن. هەموو ئەم ئەگەرانە، پێنج حوکمە شەرعیەکەی وەکو: ئەوەی هەنگاونان بەرەو هەر یەك لەم ئەگەرانە چەنێك بەرژەوەندیان تێدایە، بەئەندازەی بەدەستخستنی بەرژەوەندییەکان، چ کاتێك واجبە، چ کاتێك ڕێگە پێنەدراو و یاساغە، چ کاتێك ڕەوایە، واتە: کردن و نەکردنی یەکسانە، چ کاتێك کردنی باش ترە لە نەکردنی، چ کاتێك نەکردنی باشترە لەکردنی، بەسەردا جێبەجێ دەبێت.

## ٢. كێبڕكێ لە ڕوانگەی قورئان وفەرموودەوە

خوای بالآدەست دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ عَمَّا جَاءَكَ مِنَ الْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ ۖ فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ ۚ إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾[١]، ﴿وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ أَيْنَ مَا تَكُونُوا يَأْتِ بِكُمُ اللَّهُ جَمِيعًا إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾٢، عەبدوڵڵا كوڕی عەباس دەڵێت: جوولەكە ڕووگەی خۆیان هەیە، گاورەكان ڕووگەی خۆیان هەیە، خوای گەورە ئێوەشی ڕێنمایی كردووە بۆ ڕووگەی خۆتان[٣]، ئەگەر لە ئایەتەكانی ئەم دوو سورەتە وردببینەوە، پەیوەندی نێوان مسوڵمانەكان و ئایینەكانی تر دەكات بە سێ بەشەوە:

بەشی یەكەم: ئەوبنەمایانە دیاری دەكات، كە نەگۆڕن، لە نێوان ئیسلام و ئایینەكانی تردا، تەنها قورئان پێوەری مانەوە لەسەر ڕاستی، یان لادانی ئایین و شەریعەتەكانی ترە، دەبێ مسوڵمانان لەسەر پەیامی خودا بڕۆن، نابێ لە هیچ هەلومەرجێكدا لێی لابدەن، نابێ لە بەرخاتری ڕازیكردنی دڵی بەرانبەرەكانیان وازی لێ بهێنن، ئەم بنەمایانە لەهەموو پەیوەندییەكاندا

---

[١] المائدة: ٤٨.

[٢] البقرة: ١٤٨.

[٣] مختصر تفسير ابن كثير، محمد علی صابونی، بەیروت، چاپی پێنجەم ١٩٨٦، ١ / ١٤٠،

نەگۆڕن[1]. وەئەم گوتارانە بۆمسوڵمانەکان نیە، چونکە ئەگەر مسوڵمان بێت چۆن برا مسوڵمانەکەی لەڕێگەی ڕاست دەخلیسکێنێت و لەدینداری دوری دەخاتەوە؟!

بەشی دووەم: باس لەتایبەتمەندی شوێنکەوتووی ئایینەکانی تر دەکات، بەجیا دان بەتایبەتمەندی هەر یەکێك لەوئایینانەدا دەنێت کە دەفەرموێت: **(وَلِكُلٍّ وِجْهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَا)**[2]، لەهەمان کاتدا ئاماژەی تێدایە بۆ مسوڵمانان، خۆیان بەدەنگوباسی گۆڕینی ڕووگەوە خەریك نەکەن و دەست نەخەنە سنووری تایبەتمەندییەکانی ئایینەکانی ترەوە. عەبدوڵڵا کوڕی عەباس لەڕاڤەی ئایەتەکەدا ئاماژەی بەجیاوازی ڕووگەکان کرد، کە هەرکەس ڕووگەی تایبەت بەخۆتان هەیە بەڵام لەکاری چاکەدا، هەمووتان هاوبەشن و پێکەوە هاوکاری یەکتر بکەن و پێشبڕکێی لەسەر بکەن.

بەشی سێیەم: لە هەردوو ئایەتەکانی سورەتی: (البقرة) وە:(المائدة) دا **(فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ)** وشەی **(الْخَيْرَاتِ)** بە ڕەهایی هاتووە، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی گوتارێکی تایبەت نیە بە مسوڵمانەکانەوە لەنێوان خۆیاندا، پێشبڕکێی لەسەر بکەن، بەڵکو هانی مسوڵمانەکان دەدات، لەگەڵ ئایینەکانی تردا پێشبڕکێ لەسەر کاری چاکە بکەن، ئەم پێشبڕکێیە بنەمایەکە لەئیسلامدا، بۆ مسوڵمانان دەبێت لەنێوان خۆیاندا، بۆ خۆیان و غەیری خۆشیان دەبێت، هەندێك کاری چاکەی وەکو: خزمەتکردنی گەل و

---

[1] تفسیر ابن کثیر، : ١/ ١١٦، تیسیر کریم الرحمن، فی تفسیر کلام المنان، عبدالرحمن ناصر السعدی، چاپی: ٢٠٠٠، ٧٢/١. تفسیر الطبری: ١٠/ ٣٨٤.

[2] البقرة: ١٤٨.

ولاّت و پارێزگـاریکردن لەبەرژەوەنـدی گـشتی و بەرەوپێـشبردنی ولاّت، لـە ڕووی، ئـابووری و سیاسـی و کۆمەلاّیەتیـەوە و بنبڕکردنـی گەنـدەڵی و بەدەستخـستنی زانیـاری و پیـشەسازی جۆراوجـۆر و تـەکنۆلۆژیای سـەردەم، تایبەت نین بە هـیچ گـەل و ئایینێکـەوە، بـەڵکو مـوڵکی هەرکەسێکە لێـی بزانێت و خۆی تیادا ماندو بکات، ئەمەی قورئان ڕێنموونیمان دەکات بـۆی، پێـشبڕکێیە بۆخزمـەتی مرۆڤایـەتی، نـەك ململانێـی نێـوان گـەل و نەتـەوە بەهێزەکان، ئەوان ملی بێهێز و کەم دەسەلاّتەکان بشکێنن بۆ بەدەسـتهێنانی بەرژەوەندییـەکانی خۆیـان، جیـاوازی ئایینـەکانی کـردووە بـە هۆکارێـك بـۆ موداراتکردن و سوود بینین لەتواناکان، نەك جیـاوازی ئـایین ببێـت بـە هـۆی جودایی و لێك ترزان و سودنەبینین لەتوانای یەکتر، وەکو قورئان جارێکی تـر ئەوەمان بۆ دووپات دەکاتەوە، کە جیاوازییـەکان لێکمـان نـەترازێنێت وەکـو دەفەرموێت: (**وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ أَن صَدُّوكُمْ عَنِ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ أَن تَعْتَدُوا ۘ وَتَعَاوَنُوا عَلَي الْبِرِّ وَالتَّقْوَيٰ ۖ وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَي الْإِثْمِ وَالْعُـدْوَانِ**)[1]، واتە: ڕقی کۆنیش هەڵتان نەنێ کە نەیانهێشت بە زیارەتی کابەی ماڵی **خودا** بگەن، زۆری بکەن. لەسەر چاکەو پارێزکـاری یارمـەتی یـەکتری بـدەن، نـەك لەسەر تاوان و غـەدر،[2] ئێمە دوو جۆر جیاوازییمان هەیە، جیاوازیەکیان بوونی ئایین و ڕێڕەو و قەناعەتی جۆراوجۆرە، ئەمە ئەمرێکی تەکوینی و جەعلێکی خوداییە و هەموو مرۆڤەکان تێیدا ئـازادن، هـیچ زۆرە ملێیـەکی تێـدا نیـە، بەلاّم وەکو قورئان دایناوە، ئەم جیاوازییانە، بۆ کێبڕکێیە لەسەر پێشخـستنی

[1] المائدة: ٢.

[2] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی هەژار، ل: ١٠٦.

ژیان و ئاوەدانکردنـەوەی زەوی و سـوود بیـنین لەگـەردوون و گەشـەپێکردن و تەواوکردنی کەموکورتی یەکتری، بەپێچەوانەی صامویل هنتگتون،[1] کە ڕای وایە ئەو ولاّتانەی یەك باگراوندی ڕۆشنبیرییان هەیە لە بارترن بۆ پێشکەوتنی ئابووری، تا ئەو ولاّتانەی شوناسی ڕۆشنبیری و ئایینی جیاوازیان هەیـە، کـە واقیعی ولاّتانی عەرەبی پێچەوانەی بۆچوونەکەی ئەوە، کە خاوەنی یەك ئایین و یەك زمانن، بەلاّم لە ڕووی ئابووری و تەکنۆلۆژیاوە لە دواوەن،[2]. صـامویل قەناعـەتی وایە: ئەگەر هەویەی شارستانی یەك بێت هاوکارە بۆ پێـشکەوتنی باری ئابووری ئەو ولاّتانـە، زۆر قەناعـەتی بـە پێکـدادانی شارسـتانیەتەکان هەیـە، ئـەو بـاوەڕی وایـە شارسـتانیەتەکان پێکـەوە نـاتوانن، لەچوارچـێوەی ڕێکخراوێکی تۆکمەدا پێـشکەوتن بەدەسـت بێـنن، کاتێـك شارسـتانیەتەکان پێش ئەکەون بەهێزەکان لەدژی لاوازەکان یەك بگرن، سروشتی مرۆڤ وایە لـە پێکهێنانی شارستانیەتدا، ئەوانەی لـە چـلّەپۆپەی هێـزدان، بـەردەوام خۆیـان ماندوو ئەکەن و هەولّی داهێنانی تازە دەدەن، تا ئەوکاتەی دەگەنە قەناعـەت گەیشتوون بە چلّە پۆپەی سەرکەوتن و کەس ناتوانێ باشـتر بەدەسـت بێنێـت لەوەی ئەوان بەدەستیان هێناوە، کە ئەو بۆچوونە نیشانەی ئەوەیە خاوەنی ئەو شارستانیەتانە لەوە زیاتر بەخشندەییان پێ نیە بۆگەلانی تـر، هـەلّگری هـەر شارستانیەتێك گەیشتە ئەوقەناعـەتە، ئەوە ماویەك دەوەستن، پاشان گێـچیان

---

[1] مامۆستای زانستە سیاسیەکانە لە زانکۆی هارفەرد، وەبەناوبانگترین، بیرمەندی ستراتیژی ئەمریکایە، صدام الحضارات، ل: ١١.

[2] صدام الحضارات، واعادة بناء النظام العالمی، صمویل هنتکتون، چاپی یەکەم: ١٩٩٩، ل:٥٨-٦١.

بەرەوخوار دەبێتەوە، هەروەکو فەرەنسیس فۆکۆیاما[1] دەڵێت: هیچ هێز و ئایدیۆلۆژیایەك توانای بەرەنگاربوونەوەی دیموکراسیەتی نیە، ئەوانەش قەناعەتیان پێی نیە، ناچارن بەناوی دیموکراسیەتەوە قسە بکەن،[2] وەبەهاکانی دیموکراسی لیبراڵی دەربارەی: ئازادی تاك و یەکسانی و دەسەڵاتی گەل، کۆتا گەشەکردنی ئایدیۆلۆژیای مرۆڤایەتیە، مرۆڤ ناتوانێت بۆداهاتومان بیر لەجیهانێکی باشتر لە دیموکراسیەتی لیبراڵی بکاتەوە، کۆتا دەستکەوتی مرۆڤایەتیە،[3] وەتەنانەت ئیسلامیش کە بنەمای هێزی زۆری وەکو: پێوەری ڕەوشت و دادگەری سیاسی و کۆمەڵایەتی هەیە، بە حوکمی ئەوەی بەبێ جیاوازی ڕەگەز، یان نەتەوەیەکی دیاریکراو هەموو مرۆڤایەتی دەدوێنێت و هێزی ڕاکێشانی جیهانی هەیە، بەڵام هێزی ڕاکێشانەکەی سنووردارە، تەنها لەچوارچێوەی شارستانیەتی ئیسلامیدایە، کاتی فرەوانبوونی شارستانیەتی ئیسلامی بەسەر چووە،[4] وە ئەوەی جێگەی تێبینیە لەبۆچوونی هەردوو بیرمەندەکەدا ئەوەیە: هنتنگتون بەپێچەوانەی شارستانیەتی ئیسلامی،

---

[1] فەیلەسوفێکی سیاسی و شارەزایەکی بواری ئابوورییە، وەلە٢٠١٠وە، لەزانکۆی ستانتۆرد، لەسەنتەری دیموکراسی و گەشەپێدان و سەروەری یاسا، کار دەکات، وەئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکی ئەمریکایە.

[2] نهاية التأريخ وخاتم البشر، فرنسيس فوكۆياما، وەرگێڕانی: حسين احمد امين، چاپی یەکەم: ١٩٩٣، ل: ٥٦.

[3] دیموکراسیەت ئەزمونێکی مرۆڤایەتیە، دوای هەوڵ تەقلایەکی زۆری مرۆڤایەتی تاوەکوبونی خۆی لەگێڕانەوەی ڕێز و کەرامەتیدا، بسەلمێنێت، ئەم ئەزمونە دۆزیەوە، بۆیە ئەم ئەزمونە نە ڕۆژ هەلآت خاوەنیەتی و، نەڕۆژئاوا، بەلآم دەرکەوتنەکەی لەڕۆژئاوادا بو، الاخلاق والسياسة، امام عبدالفتاح امام، چاپی:٢٠٠١، ل: ٢٤.

[4] سەرچاوەی پێشو، ل: ٥٦.

باوەڕی بەپێکەوەژیان نیە، بەڵکو باوەڕی بەپێکدادان هەیە، بۆیە ئەو پێشنیاز دەکـات ئـەو نەتەوانـەی خـاوەنی یـەك باگراونـدی ڕۆشـنبیریین، یـەکگرتنیان لـەپرۆژە ئابورییەکانـدا هـەبێت، فۆکۆیامـا بـاوەڕی وایـە کـە شارسـتانیەتی ڕۆژئاوا لەچڵەپۆپەدایە و هـیچ شارسـتانیەتێك ناتوانێـت لـەو باشـتر بێنێـت، سروشتی ژیانیش وایە کە گەیشت بەئەنـدازەی کـەماڵ و تـەواوەتی، دەگاتـە قۆنـاغی وەسـتان، ئەوکاتـە بـە هێواشـی سـەرکردایەتی ئـەو شارسـتانیەتە دەکەوێتە دەست گەلانی تر، کە فۆکۆیاما شارسـتانیەتی ئیـسلامی و چـینی هەڵبژاردووە[1]، قورئانیش ئاماژە بەو جۆرە خۆناسـین و تێـڕوانین بۆگـەلانی تـر دەکات، وەکـو دەفـەرموێت: (**فَلَمَّا نَسُوا مَا ذُكِّرُوا بِهِ فَتَحْنَا عَلَيْهِمْ أَبْـوَابَ كُلِّ شَيْءٍ حَتَّى إِذَا فَرِحُوا بِمَا أُوتُوا أَخَذْنَاهُمْ بَغْتَةً فَإِذَا هُمْ مُبْلِسُونَ**)[2] وەکو ڕاڤەکارانی قورئان دەڵـێن: (**فَرِحُوا**) لێـرەدا بـەواتای یـاخیبوون و لـەخۆبایی بوون و سەرسام بوون، بەو پلە و پایەیەی دەسـتیان کـەتووە، کەقەناعـەتێکی لەلا دروست کردوون ئەودەستکەوتانە لەناو ناچن[3]، جێگـەی خۆیـەتی لێـرەدا تێبینیەك تۆمار بکەین کە: ئێمـە پێمـان خۆشـە ئـەم شارسـتانیەتەی ئێـستا ڕۆژئاوا سەرکردایەتی دەکات، لە گەشەکردن ڕانەوەستێ و هەموو مرۆڤایەتی زیاتر لێی سودمەند ببێت، بەتایبـەت جیهـانی ئیـسلامی، بـەڵام هـەڵگرانی هەرشارستانیەتێك، گەیـشتنە ئـەوباوەڕەی گەیـشتون بەچـڵەپۆپە مرۆڤایـەتی لەمەباشتری لەهەمبانەیدا نیە، ئەوە زەنگی مەترسییە ئەو شارستانیەتە لێی

---

[1] صدام الحضارات، صاموئيل هنتنغتون، ل:٢٣.

[2] الانعام:٤٤.

[3] تفسيرمقاتل، ٤٤٢/١، وتفسيرالقرطبي: ٣٩٠/٦.

داوه، چـونكه لـەوەزیاتریان پـێ نیـە، جیـاوازی هەیـە لـەنێوان گواسـتنەوەی شارستانیەت لەگەڵ و نەتەوەیەك بۆ گەل و نەتەوەیـەكی تـر، لەگـەڵ ڕوخـانی ئەوشارستانیەتەدا، لەسەدەكانی ڕابوردوودا، لەبەر ئەوەی جیهانگەرایی نەبوو ئەگەر ئایین و نەتەوەكان شكستیان بهێنایە، تـەنها دەسـەڵات لەدەست ئـەو گەل و نەتەوەیە نەدەما و ئەكەوتە دەست نەتەوەكانی تر، بەڵام ئێستا لەگـەڵ گواسـتنەوەی دەسـەڵاتی سیاسـی و سـەربازی و ئـابووری دەسـەڵاتە زانـستیەكەش، دەكەوێتـە دەسـت ئـەوان، شارسـتانیەتەكان بـەزەبری هێـزی دەرەكی نەڕوخاون، بەڵكو دوای ئەوەی لە خودی خۆیاندا لاواز بوون و توانـای بەخشندەییان نەما، ئەوكاتـە گەلـە بـەهێزەكان سـەریان تێكـردوون و گـەل و نەتەوە بەهێزەكان بوون بەمیراتگری.

## ٣. كێبڕكێی لایەنە ئیسلامییەكان

وەكو باسمان كرد لایەنـە ئیـسلامییەكان بـە بەراوردلـە گـەڵ نـەوەدەكان و سـەرەتای دووهـەزار، هەنـدێك هـەنگاوی باشـی لێكتێگەیـشتن و پێكـەوە كاركرنیان بڕیوە، ئـەوەی ئێـستا دەبـێ هەڵوێـستەی لەسـەر بكـەین ئەوەیـە: لایەنە ئیسلامییەكان لەكوێی ئەم گۆڕانكارییانەدان ئێستا جیهـانی عـەرەبی بەگـشتی و ناوچـەكەی گرتووەتـەوە؟ دەبـێ لایەنـە ئیـسلامییەكان لـەخۆیان بپرسن، هەڵوێستە سیاسییەكانیان چەندێك جێگـەی بایـەخی خـەڵكن؟ نـاو و ناونیـشانەكانیان چـەندێك سـەرەنجی خـەڵكی بـەلای خۆیانـدا ڕادەكێـشێت؟ پـرۆژەی سیاسـی و چاكسازی ئابوورییـان چـەندێك چارەسـەری ئـەم واقیعـە چەقبەستوەی كردووە؟ بۆ وڵامی ئەم پرسیارانەدەبێ ئەوان كـار لـە سـەر دوو

تەوە رە بکەن: تەوەری یەکەم: چاککردنی نێو ماڵی خۆیان، بە جۆرێك هـەوڵ بدەن بۆ بنبڕکردنی ئەو تێبینی و سەرەنج و ڕەخنانەی لەسـەریانە، سـەرلەنوێ جارێکی تر خۆیان دابڕێژنەوە[١]، ئـەوە سەرەتایەکیـشە بـۆ بـە پێـزی هـەموو گوتارێکی دەرەکیان، تـەوەری دووەم: لایەنـە ئیـسلامییەکان پێکـەوە لەسـەر پڕۆژەیـەکی چاکـسازی سیاسـی و ئـابووری وکۆمەڵایـەتی و نەتـەوەیی و نیـشتیمانی، ڕێـك بکـەون و وەکـو یـەك تـیم کـاری لەسـەر بکـەن، لەگـەڵ ڕەچاوکردنی ئەوەی هەموو پارتێك کۆمەڵێك نەگۆڕی تایبەت بە پارتەکەیەوە هەیە، کە ئەوە فەلسەفەی دروستبوونی ئـەو پارتەیـە، ئەمـەش بـەوە دەبـێ پارتـە سیاسـەکان لەمامەڵـەیان لەگـەڵ یـەکتر بەرچـاو ڕوون بـن، نـەگۆڕە حیزبییـەکان جیـا بکەنـەوە، لەسـتراتیژ و تاکتیکـەکان، هـەموو چـەمکە سیاسییەکان پێناسەی وردیان بۆ بکرێت، لـەنێو خۆیانـدا یـەکڕابن لـە سـەر پلان و هەنگاوە تاکتیکی و ستراتیژییەکان، ئەگەر ئەم وردەکارییانـە نەکـەن، دوور نییە ئەوەی لـە لایـەکیان تاکتیکـە، لـەلای ئـەویتریان سـتراتیژ بێـت و هەروەها بەپێچەوانەشەوە، ئەوکاتـە هەڵوێـست و زاراوە سیاسـییەکانیان لـێ تێکەڵ دەبێت، لـەباتی کـار و پـڕۆژەی هاوبـەش، یـەکتر بـە بەرژەونـدخواز و پابەند نەبوو بەڕێکەوتنەکانەوە وێنا بکەن. هەڵەیەکی کوشـندە هەیـە کـەزۆر جار لە پەیوەندیە سیاسییەکاندا لایەنە ئیسلامییەکان لەگەڵ یەکتر دووبـارەی دەکەنەوە، ئەویش ئەوەیە ئەوەندەی لەپەیوەندی و ڕێکەوتنەکانیاندا پشت بـە ئاکارە ئیسلامیە بەرزەکان دەبەستن، ئەوەندە بایەخ بەبنـەماکانی ڕێکـەوتن و

---

[١] لە باسی شوێنەواری تێڕوانینی هەستیارانە بەرانبەر بە گۆڕانکاریەکان ئاماژەی پێ دراوە.

بڕیاری یاسایی نابەستن،کە ئەمە هەڵەیەکی کوشندەیە لە هەموو ڕێکەوتنێکدا، بۆ سەرکەوتنی ڕێکەوتنەکان ئەبێ ئەم جۆرە تێڕوانینە بۆ یەکتر پێچەوانە بکرێتەوە، بەجۆرێك لەپەیوەندی و ڕێکەوتنەکاندا، پشت بە بڕیاری یاسایی و خاڵ لەسەر پیت دانان ببەسترێت، ئاکار و ڕەوشتە جوانەکان جێ بهێڵن بۆ ویژدانی سەرکردایەتی و لیژنە پەیوەندیدارەکان، با لەنێو خۆیاندا لە هەموو هەڵسوکەوت و هەنگاوێکیاندا، ئاکارە جوانە ئیسلامییەکان بکەن بەدادوەر و ڕێگە نەدەن کەس دڵی گەرد بگرێت، خۆ مەرج نیە کاتێك لایەنێك یان دوو لایەن، یان زیاتر لە هەڵسوکەوت و پێکەوەبوون و مامەڵەی ڕۆژانەیاندا پابەند نابن بەناوەرۆکی ئاکار و ڕەوشتە ئیسلامیە جوانەکانەوە، هۆکارەکەی لە سەر زانیاری بێت و بۆ پیادەکردنی سیاسەتی ماکیاڤیلیانە و[1] بەرژەوەند خوازی بێت، بەڵکو هەندێکجار پابەندنەبوونەکە دەگەڕێتەوە، بۆ لێنەزانین و نەتوانینی پراکتیزەکردنی بنەماجوانەکان بۆ کردار، هەموو سیاسیەك دەتوانێت بەنواندن خۆی بەکەسێکی زۆر ڕەوشتبەرز و ئاکارجوان پیشان بدات، بەڵام گرنگ ئەوەیە: ئەوکەسە چۆن قسەو نواندنەکانی دەکات بەکردار؟ هەرچەند خەریکە پاساوی

[1] سیاسەت لای ماکیافیللی ئەوەیە : مەبەستی باش پاساو ئەدات بە بە کار هێنانی ئامڕازی خراپ (الغاية تبرر الوسيلة)، وەمەبەستیش لەلای ئەو بەرژەوەندی وڵاتە، وە بۆپارێزگاری لەنیشتیمان، لای ئەوهەمو شتێکی قەدەغەکراو، ئەبێتە ڕێگە پێدراو. الاخلاق السياسية، دراسة فی فلسفةالحکم، تألیف: امام عبدالفتاح امام، ضاثی: ٢٠٠١، ل: ٢٥٨. وەئەو سیاسەتە بەرژەوەندیخوازییەی ئێستا ئەمریکا ئەیکات، کە لەپێناو وڵاتەکەیدا گەلانی لاواز ئەچەوسێنێتەوەوخێرو بێریان بۆخۆیان ئەبات، لەگەڵ بەرژەوەندی وڵاتەکەیدا یەك ئەگرێتەوە، بەڵام لەگەڵ بنەمای مرۆڤایەتیدا یەك ناگرێتەوە، کە ماکیافیللی بە ئەندازیاری دا ئەنرێت .

پێکەوەبوونی لایەنـە ئیـسلامییەکان، لەبەرەیەکـدا و سـەربەیەکەوەنانیان بـۆ تێپەڕاندنی قۆناغێك، نامێنێت، دووبارەکردنەوەی پرۆژەی هاوبەش و لیژنـەی هەماهەنگی لاواز دەبێت، چونکە مەرج نیـە هـەموو لایەنـە ئیـسلامییەکان وەکـو یـەك، یـەك هەڵوێـست بـن لەسـەر بابەتـە هەنوکەییـە سیاسـییەکان و داخوازییەکانی جـەماوەر و ڕوبەڕووبوونـەوەی گەنـدەڵی، ئەوپارتانـەی پلانـی ستراتیژی کورتخایەن و درێژخایـەنیان هەیـە بـۆ ئەنجامـدانی گۆڕانکـاری، کـە ئامـادە نـین لـە هـیچ هەلومەرجێکـدا، نـە بـە ئامرازەکـانی ترسـاندن و نەبەئامرازەکانی تەماح خستنەبەر، لێی لابدەن، لەپارتە چـەپ و ڕاسـتەکانی هاوشـێوەی خۆیـان نـزیکترن، تـا پـارتێکی ئیـسلامی، کـە دونیـابینی و نەخـشەوپلانیان و ڕۆڵ بینینیـان لەکایـە سیاسـییەکاندا، بۆڕووبەڕوبوونـەوەی گۆڕانکارییـەکان، هاوشـێوەی پارتەئیـسلامیەکەی تـر نیـە، ئەمـەش ئەگـەر دەلالەت لەسەر شتێك بکات، دەلالـەت لەسـەر ئـەوە دەکـات، بەهاوشـێوەی نـەوەدەکان و سـەرەتای دووهـەزار، کـاتی ئـەوە نـەماوە پارتـە ئیـسلامییە سیاسییەکان تەنها لەسەر بنەمای ئایدیۆلۆژیا لێك نزیـك ببنـەوە، بۆیـە لـەم قۆناغـەدا دەکرێـت لایەنـە ئیـسلامییەکان لەپرۆژەیەکـدا کۆببنـەوە، کـەوا ئامانجێکی سیاسی، یان ئابووری ڕوونی قەناعەت پێ هێنەریان هەبێت، بەڵام جێگەی سەرەنج و تێڕامانی خەڵکی نیە لایەنە ئیسلامییەکان لەبـەر خـاتری پاشگری ئیسلامی، یان خاوەنی یەك ڕۆشـەنبیری و باگراونـدی فیکـرین، یـان ئاشنایەتی و دۆستایەتیەکی دێرین کۆببنەوە، چونکە کۆبوونـەوە لەسـەر ئـەو جـۆرە بنەمایانـە جێگـەی تـەماحی خـەڵك نـین و نایـان کـات بـە ڕووداوی سەرگۆڕەپانی سیاسی.

بۆیە ئەوەندەی لایەنە ئیسلامییەکان بیر لەپرۆژەی تەقلیدی و تێپەڕاندنی قەیرانەکان بەشێوەی سەرپێی دەکەنەوە، چاك وایە پیاچونەوەیەك بە هەموو کارە هاوبەش و پرۆژە هاوبەشەکانیاندا بکەنەوەو جارێکی تر بە لەبەرچاوگرتنی هەموو ئەو هەلومەرج و گۆڕانکارییانەی هاتوونەتە پێشەوە، پیاچوونەوە بە هەموو چەمکەکانی وەکو: پرۆژەی ئیسلامی و گوتاری ئایدۆلۆژی و گوێنەدان بەداخوازی کادیر و ئەندامە پێشکەوتوەکانیان بکەنەوە، پارتەکانیان بخەنە چوارچێوەی ئەوەی ئێمە لەداخوازییەکان و خولیای هیواو ئاواتەکانی جەماوەردابن. وە گەورەکردنی چەمك و دەستەواژە ئیسلامییەکان، چارەسەرە، یان هەولّدان بۆ دابینکردنی، داوا و ئومێدەکانی خەلّك؟.

### ٤. هۆکاری سەرهەلّدانی کێ بڕکێ:

کێبڕکێی پۆزەتیڤ لەناو هەموودەستە و کۆمەلّێکدا، شتێکی سروشتیە، کەوا لەپێناو سەرخستنی پڕۆژەکاندا بێت و بە یاساو سیستمی سەرکەوتوانە رێك بخرێت و هاوسەنگی لەنێوان دەسەلاّتەکاندا راگیر بکرێت، لەهەمان کاتیشدا کەسی یەکەم ململانێکان بەڕێوە ببات، لە باتی ئەوەی تەنها تەماشاکەرێك بێت، رێنمایی پێویستی لە بوارەکانی بەڕێوەبردن و سیاسی و برایەتی و لێبوردەیی هەبێت بۆیان، بە یاسا رێگری لە هەلّپەنەکردن بۆ پلە و پۆست و خۆدەرنەخستن بگیرێت، هیچ مافێك نەسپێردرێت بە هەندێك موجامەلە و تەوازوع نواندنی رواڵەتی، رەوایی و نارەوایی کارەکان نەسپێردرێت بەویژدانی کەسەکان، بەشێوەیەك خۆیان حەکەم بن، بە ویژدانی

خۆیان مافی براکانیان پێشێل نەکەن، ئەمەش بەکۆمەڵێك یاسـای تونـدوتۆڵ، دەکرێت کە مافی هەموو لایەنە پەیوەندیـدارەکان، لەچوارچـێوەی ڕەزامەنـدی ڕای گشتییدا، بڕیاری لەسەر بدرێت، ئەوکاتە هەرکەسێك سنور بەزێنی کرد، بـەپێی ئـەو بنـەماو یاسـایانە دادوەری بکرێـت، نـەبوونی ئـەو یاسـایانە و دابەشـنەکردنی دەسـەڵاتەکان وایـان کـردووە، نـەتوانرێت ڕێگـە لـە هەنـدێك جموجـوڵ و سـەربەیەکداکردن بگیرێـت، کـە بەرژەوەنـدی پارتـەکان لـەپێناو بەرژەوەنـدی شەخـسی و دەسـتەیەکدا نەخەنـە مەترسـییەوە، بەئـەزموونیش سەلماوە زۆر ترین پێشێلکاری، لەناو ئەو دەسـتە و کۆمـەڵانـەدا دەبێـت بـەبێ هیچ یاسا و لێپێچینەوەیەك، تەنها پـشت بـەئامۆژگاری و ئاکـارە بـەرزەکان دەبەستن[1].

[1] وتەیەکی بەناو بانگە ئیمامی عوسمان هەیە (خوا لێی ڕازی بێت) کە ئەڵێت: (**إن الله ليزع بالسلطان ما لا يزع بالقرآن ".البداية وانهاية، ابن كثير، ١٠/٢**. واتە ئەوەی خوا بەدەسەلاَت ئەیچەسپێنێت بەقورئان نایچەسپێنێت، مەبەست ئەوەیە تەنها نابێ پشت بەئاکار و لەخواترسان ببەسترێت، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا ئەبێ یاسا کاری خۆی بکات، کە خەڵکی ترسی یاسایان هەبوو بەباشی ئەرکەکانیان جێبەجێ ئەکەن، هەرچەند ئەم وتەیە پیرۆزی سوڵتان و پیشاندانی بەسێبەری خودا لەسەر زەویدا لێ ئەخوێنرێتەوە، بەلاَم ئیمام خوا لێی ڕازی بێت لەکۆتایی تەمەنیدا، بەهۆی پشتگوێخستنی ئەوبنەمایەوە توشی زەحمەت و سەرئێشەی زۆر بوو. یان وەکو ماکیافیللی بەسەرهاتی، ڕاهیبی دۆمینیکانی (سافۆنا رۆلا، ١٤٥٢ـ ١٤٩٨) ئەگێڕێتەوە: کەدوای ئەوەی لەسەر گەندەڵی بواری ئاکار و ڕەوشت، پاشای فلۆرنسای دەرکرد، خۆی لەفلۆرنسا دیکتاتۆریتێکی ئایینی دامەزراند، لەماوەی سێ ساڵی دەسەلاَتیدا کە پشتی بەئامۆژگاری لەسەر پابەندبون بەئاکارە جوانەکانەوەو بلاَوکردنەوەی پابەند بون بەئایین و زوهدئاکارە بەرزەکانەوە، بەڵێ لەسەرەتاوە بە هۆی هەندێك لێزانین وئوسلوبی سیحریەوە، سەرکەوتنی بەدەستهێنا، بەلاَم دوای ئەوەی نەیتوانی بەو شێوەیە تەنها لەسەر پابەندبون بە

بۆیە چەندێك ئەركی سەرشانی سەركردایەتیە پێشەنكی ئاكار و ڕەوشت بێت، بەهەمان شێوە ئەركی سەرشانیەتی پێشەنگی پابەندبوون بە یاسا و پرەنسیپە یاساییەكانەوە بێت، بەشێوەیەك پەروەردە لەسەر ئاكاروڕەوشتی جوان لەگەڵ پەروەردەكردن لەسەر پابەندبوون بە یاساوە، شان بەشانی یەكتر بڕۆن، هیچ لایەكیان باڵ نەكێشێت بەسەر ئەویتریاندا، پێوەری ئەم هەنگاوانەش ئەوەیە، لەكۆی گشتیدا هەموو چالاكی و جموجوڵ و پێشبڕكێكان بخرێتە خزمەت بە بەرژەوەندی گشتیەوە، سەرنەكێشێت بۆ ململانێی ترسناك، باشترین پڕۆژەش ئەوەیە كەوا دوور بێت لە هەموو كێبڕكێیەك، ئەویش كاتێك دەبێت كەوا جەمسەرەكانی بەڕێوەبردنی كار و پڕۆژەكان لەگەڵ یەكتر بەبیركردنەوەی پۆزەتیڤ و میكانیزم و ئامرازی ڕێگەپێدراو و شەرعی بڕۆن بەڕێوە، هەموو كەسە دیار و بەڕێوەبەرەكان بەئەنجامەكەی دڵخۆش بن، هیچ كەس و دەستەیەك هەست بە پەراوێزخران و ماف خوراوی نەكات، ئەمەش كاتێك دەبێت هەموویان وەكو تیمێك كار بكەن، ئەم شێوە پێشبڕكێیەش ئیسلام هانی داوە، لەبەڕێوەبردنی پارت و ڕێكخراوەكاندا جێگەی دەبێتەوە.

كێبڕكێ دەبێت بە دوو بەشەوە: بەشێكیان ستوونییە لەگەڵ سەرووی خۆیدایە، بەشێكیشیان ئاسۆییە چ وەكو كەس، یان ئۆرگان، لەگەڵ هاوئاستەكانی خۆیاندایە، ململانێی ستوونی كاتێك ڕوو دەدات، كەوا

---

ئاكارەوە ولأت بەرێ بەڕێوە، خەڵكەكە لێی هەڵگەڕانەوەو لە گۆڕەپانی وولأتدا سوتاندیان، الاخلاق والسياسة، امام عبدالفتاح امام، ل: ٢٤٩ـ ٢٥٠.

سەرکردەکان دەست بخەنە ئیشوکاری ڕۆژانەی ئاستەکانی خوارووی خۆیانەوە، هەوڵ بدەن دەست بگرن بەسەر کار و چالاکییەکانیاندا، ململانێی ئاسۆییش کاتێك بەرپا دەبێت: کەوا هاوئاستەکان، چ وەکو کەس، یان وەکو گرووپ، جیاوازی هەبێت لەنێوان ئامانج و تێگەیشتنەکانیاندا و هەرکەسە و ئامانج و تێگەشتن و ئەجیندای خۆیدا ببەزێنێت، کە ئەمەش هەنگاوی یەکەمی تێکگیرانە[1]. وەمەترسیدارترین ململانێی نێو پارت و ڕێکخراوەکان، ئەوەیە: لەنێو پارت و ڕێکخراوەکاندا چەند جەمسەرێك دروست ببێت و دوور لەکارنامەو بڕیارە یاسایی و کارنامەو پرەنسیپەکان، هەریەك پلان و بەرنامەی خۆی هەبێت، وەکو تاك، یان وەکو گروپێك، لەناوکایە گشتیەکەدا کاری بۆ بکەن، ئەمە جگە لەوەی ئەوململانێیە پارتەکە بۆ چەند جەمسەری جیاوازیی فیکری و سیاسی دەبات، لەهەمان کاتدا لەنێوخۆی پارتەکەشدا دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەنجامدانی هەر کار و چالاکیەکی دەستە جەمعی و بەرەوپێشچوونی ئەو پارتە، زانایانی کۆمەڵناس بەم شێوەیە پێناسەی ململانێ دەکەن کە: پرۆسەیەکە کاتێك دەس پێ دەکات، کەسێك، یان چەند کەسێك، بەهۆی سنوور بەزاندنی تاکێك، یان کۆمەڵێك، هەست بەنەگەیشتن بە ئامانجەکانیان دەکەن و بەرژەوەندییەکانیان بووە بەژێرپێوە[2]. جا هەرکاتێك لەنێو پارتێك، یان ڕێکخراوێکدا، دونیابینی جیاواز هەبوو هزری جیاواز هەبوو بەرژەوندی جیاواز هەبوو ئەوکاتە هەڵوێستی سیاسی جیاواز دەبێت،

---

[1] الانماط القيادية، وعلاقتها بادارةالصراع التنظيمى بالمنظمات، اعداد: يحيا بن موسى، چاپی: ٢٠١١، ل: ٥٣.

[2] تكوين الفرق والعمل الجماعى، أ.د. عادل محمد زايد، القاهرة، چاپی: ٢٠٠٧، ل:٥٧.

هـەر لایەنـەو هـەوڵ دەدات، بڕیـارە چارەنوسـسازەکان و ڕێـڕەوەی پـارت و ڕێکخراوەکە بەرەو ئەو ئاقارە بەرێت، کە لەگەڵ بۆچـوونی فیکـری و پێگـەی سیاسی و بەرژەوەندییەکانیدا یەك دەگرێتەوە، بۆیە ڕوودانی ململانێ لە نێـو ئەو پارت و ڕێکخراوانەدا، کـە پێکهاتـەکانیان جیـاوازە، کۆمـەڵێك بڕیـاری یەکلاکـەرەوەش نیـە، ڕێگـری لەسـنوربەزاندنی کـەس و گروپـەکان بکـات، شتێکی حەتمی و بەڵگە نەویستە.

## ٥. ڕێگەچارەکانی ململانێی ناڕەوا

### أ- چارەسەری نێوخۆیی

#### ١. سەروەریی یاسا

سەروەریی یاسا بەو حاڵەتە دەوترێت، ئەوکارنامەو بڕیارە ڕەسمییانـەی لـە ئەنجومەنـە باڵاکانـەوە دەرکـراون، هـەموویان لەحاڵـەتێکی سروشـتیدا دەرکـرابێتن، لەبـەرخاتری فـشار و ڤیتـۆی هـیچ کـەس و تاقمێکـدا هەڵنەوەشێنرتەوە، چونکە ئـەو کارنامـەو بڕیارانـەی لەحاڵـەتێکی ئاسـایی و بەشێوەیەکی سروشتی دەرکراون، ئەگەر هوشیاری یاسایی هەبێت زەحمەتە بە هـیچ حاڵـەتێکی ناسروشـتی و هەنـدێك داواکـاری لاوەکـی ئـەو بڕیارانـە هەڵبوەشێنرێنەوە، گرەنتی ڕونـەدانی ئـەو جـۆرە کارانـە بەهوشـیارکردنەوەی زیاتری سەرکردایەتی و ئاستە باڵاکان دەبێت، بە جۆرێك ڕێگە نەدرێت لەبەر خاتری ئارەزوو حەزی کەسانێك ئـەو پـارت و ڕێکخراوانـە بـەرەو ئاقـارێکی مەترسیدار بڕۆن، مەترسیەکەشی ئەوەیە دوورنیـە لەکۆتایـدا ببێتـە هۆکـاری هەڵوەشاندنەوەو تێکدانی ئەو پارت و ڕێکخراوە، ئەبێ بڕیـار و یاسـاکان زۆر

ڕوون و ئاشــكرابن مــاوەی چەندوچــوون و ڕاڤــە و تــەئویلاتی جۆراوجــۆر هەڵنەگرێت، كە كەسانی خاوەن بەرژەوەندی و قەناعەتی تایبەت، بۆ گەیشتن بە ئامانج ومەبەستەكانی خۆیان مانای جۆراوجۆری بۆ لێـك بدەنـەوە، ئەمـە یەكێكە لەڕێگرییـەكان لەكەسـە خـاوەن بۆچـوونە جیاوازەكـان، تـاوەكو سـەر بەیەكدا نەكەن و داهاتووی جەمعەكە نەخەنە مەترسییەوە، لەكاتێكیشدا ئەم جۆرە كەسانە نەیانتوانی پابەند بن بەیاساو بڕیار و پرەنسیپەكانەوە، بەردەوام بوون لەسەركاركردن بۆقەناعەت و بەرژەوەندییەكانی خۆیان، ئەوە ئەوانـە لـە بەردەم دوو ئەگەری تاڵدان: یان ئەوەیە پابەند دەبن بەیاساكانەوەو وەكوو دین تەماشای قەناعەتەكانی خۆیان ناكـەن، تـاوەكو بـۆ حەسـانەوەی ویـژدانیان و چەسپاندن و بەدیهێنانی ئومێدەكانیان سنووربەزێنی بكەن و هەموو ڕێگایەك بگرنەبەر، یان ئەوەیە ئەو پارت و ڕێكخراوانـە ناچـاربن بیـان خەنـە دەرەوەی جەمعەكەو هیچ بەرپرسیاریەتێكی ئەو جۆرە بۆچوون و ئایدۆلۆژیە تایبەتیانـە هەڵنەگرن، ئەوكاتە ئەو كەس و تەوژمانە بۆ خۆیان ئازادن لەدەرەوەی پارت و ڕێكخراوەكـان، چ قەناعــەت و فیكـر و پـلان و سیاسـەتێك پیـادە دەكـەن، هەرچەند ئەو جۆرە دەستەو كەسانە تەنها بەجێبەجێكردنی خاڵی یەكـەم، كـە پابەندكردنیانە، حـەزی كاركردنیـان لەگـەڵ ئـەوجۆرە پـارت و ڕێكخراوانـەدا نامێنێت.

**٢. بنەماكانی ڕێكەوتن وكاركردن ئاشكرا و ڕوون بێت:**

ئەو بنەمایانەی پارت و ڕێكخراوەكان پێكەوە ڕێك دەكەون كـاری لەسـەر بكەن، دەبێ بكرێن بە دوو بەشەوە، ئەو بابەتانەی گـرنگ و چارەنووسـسازن، زۆر ڕوون و ئاشكرا و یەكلاكەرەوە و جامیدبن، بەشێوەیەك ڕێگەی هیچ ڕاڤە

و تـــەئویلات و واتـــای جۆراوجـــۆر هەڵنـــەگرێت، کـــەوا زۆرینـــەکان، مـــافی کەمینـــەکان، یـــان ڕاجیاوازەکـــان پێـــشێل نەکـــەن، بەتایبـــەت سەرچـــاوەکانی بڕیاردان و دارایی و پەیوەندییەکان، بەشێوەیەکی مەرکەزی ڕێك بخرێـت، کـە هیچ کـەس و تـەوژمێك دەسـتیان بەسـەردا نـەگرێت، کـە دارایـی شەخـسی هەبێت، یان تەنها لەڕێگەی شەخسێکەوە نەبێت ڕێگە نەدرێت لەگەڵ پارت و دەوڵەتەکاندا پەیوەندی ببەسترێت، ئەم سێ جەمسەرە سەرچـاوەی باڵبـاڵێن و تەکەتول و بەدەستهێنانی بەرژەوەندی شەخسیە، هەرپارتێك توانیتی ئەم سێ سەرچاوەیە بەچاکی زەبت بکات، ئەوە توانیویەتی دوورترین ڕێگەی کارکردن، وەکو یەك تیم ببڕێت و کۆنترۆڵی زۆربەی ململانـێ نێوخۆییـەکان بکـات، زۆر جار لەکاتی ڕێکەوتن و داڕشتنەوەی کارنامەکاندا، جار جار هەنـدێ وەعـز و ئامۆژگـاری هانـدەری هەنـدێك موجامەلـەی یـەکتر لـەکاتی ڕێکـەوتن و بڕیارەکاندا وایان لە هەندێك کەس کردووە بەو هۆیەوە لەکاتی ڕێکەوتنـەکان لەبەر خۆپاراستن لەهەندێك تومەت بوونەتە هۆی شەرمکردن و کەبتکردنی ڕا جیاوازەکان، کە نەیانتوانیوە قسەی نێو دڵی خۆیان بکەن، ئەمەش وایکردووە ئەوانەی حەزیانکردووە لەیاساوە بڕیارە چارەنوسسازەکان و شەرعیەتی کـا رو چالاکییەکانیان وەربگرن، چاوەڕێی ویژدانی زۆرینەکان بوون، یان هەندێك جار بە هۆی بوونی هەندێك کە خۆشییان لەکار و پڕۆژەی یاسایی نـەهاتووە و لـە پێگەی هەستیاری پارتەکانیشدابوون، بە بە خۆزگەو ئاوات، خوا دڵیـان نـەرم بکات و ئەوانیش لوتف بکەن ملکەچی بنەماکانی ڕەوشتی جوانی ئیـسلامی بن، دینداریيەکەیان ڕێگرییان لێ بکات لە سنوورشکاندن و کاری نا یاسایی، کە بەداخەوە ئەو ئومێد و ئاواتانە هیچیان لەجێگەی خۆیدا نـەبوون، چـونکە

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمان دەكات و دەفەرمویێت: (**اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ**[1]) وەبۆ چارەسەری ئەم مەترسیانە دەبێ لە نێو پارتەكاندا، جگە لەیاسای پۆلاین و وردكردنەوەی بنەماكانی كارپێكەوەكردن، دەبێ دەزگایەكی خاوەن دەسەلات كە پێك بێت لەخەلكانێكی خاوەن كەسایەتی بەهێز وە جێگەی متمانەی پارتەكان، تاوانبار نەبێت بە تێوەگلان لە گەندەڵی، یان لەبەر تەماحێك لایەنگری هیچ كەس و لایەنێك بكات، هەلسێت بە یەكلاكردنەوەی بابەتە كێشە لەسەرە نێوخۆییەكان.

### ٣. سەركردایەتی دەبێ زانیارییان لەسەر گۆڕانكارییەكان هەبێت:

لەكاتی سەر هەڵدانی هەر بیرۆكە و ڕێڕەوێكی فیكری، یان سیاسی تازەی ناوچەی ئیشوكاری پارت و ڕێكخراوەكان، ئەركی سەرشانی سەركردایەتی و كەسە بڕیاربەدەستەكانە، پێش كادیر و ئەندامە باڵاكانیان، ئەو زانیارییانە وەربگرن و باش هەرسی بكەن، ئاگاداری هەموو گۆڕانكارییەكانی سەرگۆڕەپانی فیكری و سیاسی بن، كە تا ئێستاش زۆرێك لەئەندامان و كادیرانی لایەنە ئیسلامی و غەیرە ئیسلامییەكانیش فیكر و دونیابینییان بەجۆرێكە شێوازی بیركردنەوەو دونیا بینی پلەباڵا و بڕیار بەدەستەكانیش بەپێچەوانەی ئەوانەوە، بەجۆرێكی تر دەڕوانن بۆ دونیا و دەورو بەریان[2].

---

[1] ئەنەسی كوڕی مالیك خوا لێی ڕازی بێت ئەگێڕێتەوە كەوا پیاوێك وتی ئەی پێغەمبەری خوداحوشترەكە ببەستمەوەو پشت بەخوا ببەستم، یان بەرەلای بكەم وپشت بەخودا ببەستم؟ پێغەمبەر فەرمووی ( **اعْقِلْهَا وَتَوَكَّلْ**) سونەنی تورموزی، ١٤/ ٢١٢/ ٤٤١٥.وە صەحیحی ئیبنو حیبان، ٤٥٧/٣/ ٧٣٢.

[2] نمونەی سەر هەڵدانی بیر نوێگەری و، ڕێكخراوەكانی ndi وiri كە لە لاپەڕە: ١١٦باسمان كرد.

بەتایبەت ئەمڕۆ سەردەمی جیهانگەراییە، کـە بیرۆکـە فیکـری و فەلـسەفی و سیاسییەکانی دونیا بەزوویی دەگەنە شوێنەکان، نابیّ بەهەڵەشدا بچین، لەبەر ئەوەی ئامراز و میکانیزمەکانی دونیاگەرایی ڕاستەوخۆ پەیوەندی بە هەموو تاکێکی کۆمەڵگاوە دەکات.

نابیّ پارتە سیاسییەکان بە شێوە کلاسیکیە کۆنەکـە بـیر لـەوە بکەنـەوە چۆن مەناعـە بـدەن بـە کـادیر و ئەندامـەکانیان، تـاوەکو خـەرقی فیکـری و سیاسـی نـەکرێن، بـەڵکو چارەسـەر ئەوەیـە: لـەنێو پـارت و ڕێکخـراوە سیاسییەکاندا، دەزگای توێژینەوەی فیکری و سیاسـی سـەردەمیانە هـەبێت، ڕۆژانە زانیاری تازە بدات بە ئاستە باڵاکان، خولی جۆراوجۆریان بۆ بکەنەوە، بە هەمان شێوە بە ئامادە بوونی ئاستەباڵاکان خولی جۆراوجۆریش بکەنـەوە، بـۆ ئەنـدامان و کـادیران ئاسـتی مـام ناوەنـد و خـوارتر، ئەوکاتـە سـەرەوەو خوارەوە پێکەوە ئیستیعابی گۆڕانکارییەکان دەکـەن، نـەك هەنـدێك کـادیری پێشکەوتوو بە هۆی زرنگی خۆیانەوە، لەدەوروبەریان تیّ بگەن، بەڵام لەکاتی گفتوگۆ و لێکحاڵیبوونیان لەگەڵ ئاستە باڵاکانیاندا، ئەوان لێیان تیّ نەگـەن، وەکو کەرەی نێو شایی تەنها بەڵێیان بۆ بکەن و سەریان بۆ بلـەقێنن، نهـێنی ئـەم خەلەلـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ بەدامەزراوەیینـەکردنی پـارت و ڕێکخـراوە سیاسییەکان، کە بەشێوەیەك هەموو پارتەکان چاوەڕوانن بزانن سەرکردایەتی فەرمانی بەچیە چ جۆرە ڕێنمونیەکیان هەیە.؟

یان جاری واهەیە دەزگایەکی بـیّ ڕوح و بـیّ نـاوەرۆك دروسـتکراوە نـاوی لێنراوە بەشـی لێکۆڵینـەوە، ئـەویش لەسـنووری توانـا و دەسـەڵاتە مـادی و مەعنەوییە لاوازەکەیدا ناوبەناو هەندێك مەلـەف ئامـادە ئـەکات و دابەشـی

دەكات بەسەر ئۆرگانی پارتەكەدا ئـەوانیش لەسوچـێكدا فڕێـی دەدەن، بـەبێ بەرنامە هەندێك دەیخوێنێتـەوەو هەنـدێكیش هەرچـاوی پێـی ناكـەوێت، كـە پارت و ڕێكخراو بەدامەزراوە نـەكرا و ئاسـتێكی بـاڵای مـادی و مەعنـەوی نـەبوو ئەگـەر شـارەزاترین كەسـیش بكـەیت بەلێپرسـراوی هـیچ لەبابەتەكـە ناگۆڕێت، خەلەلێكی تری هەندێك لە پارتەكان ئەوەیـە تاچـەندێك هوشـیاری لەنێو ئەندامان وكادیرانیانـدا هەیـە سـەبارەت بەچـۆنیەتی هەڵـسوكەوتكردن لەگەڵ ڕووداو و زانیاری و بابەتە نوێیەكاندا.

هەواڵ و زانستی سیاسی و فیكری تاچەندێك وەكو بەرهـەمێكی زانـستی مامەڵەی لەگەڵ كراوە؟ وە ڕێكخراو و دامەزراوە شارەزا و بەئەزموونەكان بۆ چۆنیەتی مامەڵەكردن لەگەڵ زانیاری و ڕووداوەكان چەند خولی جۆراوجۆریـان بۆ ئاستەباڵا و مام ناوەندەكانی پارتـەكانیان كردووەتـەوە؟ هەنـدێك زانیـاری وەكـو مـین وایـە، بـاش لێـی نـەزانیت لـەكاتی دەسـتكاریكردندا بـەخۆتا دەتەقێتەوە! هەروەها مەسەلەی بەئاگابوون لە ڕووداوەكان، بەتایبـەت ڕوداوە فیكرییەكان بۆ ئەندامان و كادیرەباڵاكان نابێ تەنها چێژێكی زانیـاری بێـت، بۆ ئەوە بێت كەوا شت دەزانن، نەخێر دەبـێ دەزگـا ڕەسمییـەكانی ئەوپارتانـە ئــەو زانیارییانــە لــە نێــو ئەندامەكانیانــدا بكــەن بەسـلوك، لــەئاكار و هەڵسوكەوتی ڕۆژانەیاندا ڕەنگ بداتەوە، چونكە سروشـتی زانیـاری وایـە بـە بەخشین و مومارەسەكردن لەسەری گەشە دەكات، ئەگەرنانەبێت كام كادیرەی چالاكە باچەندین خـولی جۆراجـۆریش ببینێـت، كـە نـەبوو بـەكاری ڕۆژانـەی ئەگەر لەبیریشی نەچێتەوە دەبێت بەزانیارییەكی بێبایەخ ئەگەر ڕقیـشی لێـی نەبێتەوە بەو زانیارییە دڵخۆش نییە، هەندێك جار لەناخی خۆیدا دەڵێت ئـەم

زانیارییەی من بۆچی باشە؟ ئەمەش مانای وانیە هەرچی ئەندامی پارتەکانە ڕۆژانە لەخولەکانی گەشەپێدانی مرۆییدا بن؟ نەخێر ئەوەی ئێمە مەبەستمانە دەزگایەکی لێکۆڵینەوەی ستراتیژی خاوەن ئیمکانیەتی مادی و مەعنەوی هەبێت، کار لەسەر ئەو پڕۆژەیە بکات، هەماهەنگی بەهێزی لەگەڵ ڕێکخراوە مرۆییە نێوخۆیی و دەرەکییەکاندا هەبێت، چەنێك زانیاریی دەبەخشێت ئەوەندەش زانیاری و مەعلوماتی جۆراوجۆر سەبارەت بەپیشەکەی خۆی وەربگرێت.

زانستی گەشەی مرۆیی تازە بووە بەزانیارییەکی سەربەخۆ ناکرێت بە بێ پسپۆڕی بەسەر پێیەکەوە هەندێك شتی لێ وەربگریت و پاشان وازی لێ بهێنیت، نزیکترین ڕێگاش ئەوەیە گەنجێکی زۆری خاوەن بڕوانامەی بەرز پسپۆڕییان لەو بوارانەدا پەیدا کردووە، پارتەسیاسەکان ئەگەر لەقاڵبە کۆنەکانیان بێنە دەرەوە دەتوانن سودی باشیان لێ ببینن و کەرتی گەشەی سیاسی مرۆیی خۆیان بەسوود بینین لەو توێژە ببوژێننەوە، بەڵام بەداخەوە تا ئێستاش بەشێکی بەرچاوی پارتە سیاسییەکان ئەندامەکانیان لێیان دوور نەکەونەوە، یان ڕێژەی دەنگەکانیان لەهەڵبژاردنەکاندا کەم نەکات، یان پەیوەندییە سیاسییەکان وەکو خۆی لەنگەر بگرێت، دەستگرتن بەوحاڵەوە بەگەورەترین سەرکەوتن دەزانن! کە ئەم حاڵەتەش ئومێد بەخش نیە بۆ پارتی سیاسی.

### ٤. دەستاودەستپێکرنی دەسەڵات و ئاستە باڵاکان:

کاتی ئەوە هاتووە پارتە سیاسییەکان بۆ دوو ئامانج بەکۆمەڵێك بنـەما و پرەنسیپ قەناعەت بە ئاڵوگۆڕ و دستاودەسـت پێکردنـی ئاسـت و دەسـەڵاتە باڵاکان بکەن:

ئامانجی یەکەم: ئاستەباڵاکان نەبێت بەموڵکی چەند کەسێك، تـا مـردن لەوێـدا بمێننـەوە، زۆر جـار ئاسـتەباڵاکانی پارتـە سیاسـییەکان ئـەم قـسەیە بەئەندامان و کادیرە ڕەخنە گرەکانیان دەفرۆشنەوە، کە ئێمـە لەکۆنگرەکانـدا سـەرلەنوێ دەچـینە ڕیـزی پاڵێوراوەکـان و جـارێکی تـر خۆمـان کاندیـد دەکەینەوە، ملی خۆمان دەخەینە بەرکەرەمی دەنگپێـدانی ئـەوان، ئـەوانیش ئازادن دەنگمان پێ بدەن، یان دەنگمان پێ نەدەن، بەشێك لەم قسانە لەخودی خۆیاندا ڕاستن، بەڵام لە کۆنگرەکاندا کۆمەڵێك مـاف و ئیمتیـازات، بـۆ ئـەو (م. س) و سەرکردایەتیانە هەیە، ئەو ماف و ئیمتیازاتانە بۆ خەڵکە تازەکـە نیە تا کاندیدە، تازەکان هەڵبژێرن و دەنگ بەئەندامەکۆنەکان نەدەن، لەوانە: ئەندامــە کۆنــەکان چــەندین ســاڵە لــەو پێگەیــەدان و خۆیــان بەئەنــدامان و کادیرەکان ناساندوەو هەر سەروەرییەکی سیاسی، یان مادی، یـان مەعنـەوی هەبێت بەجۆرێك لەجۆرەکان بەناوی خۆیانەوە تۆماریان کردووە، کاتێك کەسە تازەکان دەچنە پێشەوە دەنگدەران لەسەر چ بنەمایەك دەنگیان پێ بدەن.؟

کاتێك بەشێکی زۆریـان لای دەنگـدەران ناسـراو نـین، ئەگـەر ناسـراویش هەبێت هیچ جێدەستێکی دیارنیە جێگەی سەرەنجڕاکێشانی دەنگـدەران بێـت، لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە، ئەگەر ئەو پارتە بەهۆی هەڵەی سەرکردایەتی پێشووەوە توشی چەندین قەیران و سەرگەردانی و تێکشکان بـوو بێـت، کـەی

دادگایەك، یان ئۆرگانێكی دەسەڵاتدار هەبووە چاونەترسانە لێپێچینەوەیان لەگەڵ بكات، لەكۆنگرەكاندا هەموو هەڵە و كەموكورتییەكانیان بخاتەڕوو؟ كاتێك، پارتێك كۆنگرە دەگرێت، بۆپێداچوونەوەی چوار ساڵی ڕابوردووە، كەی بینیمان لەكۆنگرەیەكدا جگە لەسەروەری و چالاكییەكانی ئەندامانی سەركردایەتی خاڵە لاواز و لەتوپەتكردنی حیزب و چەندین جۆر و گرفتاری دیكە كەهێناویانە بەسەر ئەو حیزبەدا باس بكرێت؟! ڕای بەشێك لەسەركردایەتییەكان كە زۆر جار دەیڵێنەوە ئەوەیە: لە ڕووی خۆڕاگری و قوربانیدان و دەستپاكی و وەستان لە ڕووی گەندەڵییەكاندا كەس لە ئێمە باشتری پێ ناكرێت، یان دەڵێن: ئێمە پێویستمان بە پلە و پۆستی حیزب نیە لەبەر خاتری حیزب ئێمە دەمێنینەوە، هەندیك جار خۆیان بە (صمام الامان)ی حیزب دەناسێنن.؟

ئەم قسانە بووە بە ویردی سەرزمانی بەشێك لە ئاستەبالاكانی هەندێك لە پارتە سیاسییەكان، كە ئەمەش سروشتی مرۆڤە ماوەیەكی زۆر لەشوێنێكدا مایەوە، ئەوكارانەی ئەو پێی هەڵدەستا كەسی تر دیار نەبوو ئەویش خۆی لێ دەبێت بە سەركردەی ڕۆژی تەنگانە و قەناعەتی وایە دەبێ هەر ئەو بێت، ئەمەش نهێنی ئەوە دەردەخات كەوا لەسەردەمی عومەری كوڕی خەتتابدا (خوا لێی ڕازی بێت) لە چوار ساڵ زیاتر والییەكانی لەسەر شارەكان نەدەهێشتەوە[1]، ئەمەش لە سیستمی دیموكراسی و دەستاودەستپێكردنی دەسەڵاتدا كراوە بە بنەمایەكی نەگۆڕ، جگە لەوەش

[1] تحرير الانسان وتجريد الطغيان، د. حاكم المطيري، ١/٤٥١.

ئەگەر بزانن لـەکۆنگرەدا برایـەکی بـاش! یـان دۆسـتێکی دێـرین، پێگەکـەی لەمەترسیدایە، زۆر ئاساییە بەجۆرێك لەجۆرەکان کاری بۆ بکرێت، بۆ ئـەوەی سـومعەی نەشـکێت و کەسـایەتی لەکـەدار نـەبێت! وەلەکۆتایـشدا هـەموو ئەوانەی کەوا خۆیان کاندید دەکەن، مەگەر بەدەگمـەن بـەجۆرێك لـەجۆرەکان کار بۆجارێکی تر دەرچوونی خۆیان بۆ پۆستەکانی پێشووی خۆیان دەکەنـەوە، ئەوەشمان لەبیر نەچێت، ئەوانـەی لـە ئاسـتی بـاڵای حیزبـدا بـوون، زۆربـەیان پشکی شێریان هەبووە لەپۆستەباڵاکانی حکومەت و پەرلەمان، کە ئەمانەش مەگەر خۆیان ئارەزوومەندی نەبن، زۆربەیان بەختی دەرچونیان هەیە بۆجـاری چـەندەم بۆسـەرکردایەتی و م.س، بۆیـە چـاکترین چارەسـەر بـۆ ڕێگـری لـە گەنـدەڵی سیاسـی و ئـابووری و ڕێکخراوەیـی، سـنوردارکردنی مـاوەی سەرکردایەتیە لەکۆنگرەکاندا، کە تا دوو خول بۆیـان هـەبێت خۆیـان کاندیـد بکەن.

ئەم سیـستمەی تـا ئێـستا بەشـێکی زۆری پارتـە سیاسـییەکان لەسـەری دەڕۆن، یەکێکە لەهۆکارەکانی قەیرانی نێـو پارتـە سیاسـییەکان، مانەوەشـی تائێستا بەم شێوەیە هۆکارەکەی ئەوەیـە: بـەدوای چارەسـەردا ناگـەڕێن، خـۆ ئەگەر سووربن لەسەر چارەسەرکردنی، چارەسـەر دەکرێـت، چـونکە سروشـتی مرۆڤ وایە خوای باڵادەست وا دروستی کردووە بـەدوای هەرشـتێکدا بگـەڕێت دەیدۆزێتەوە، بۆیە ئەگەر حیزب زەبت و ڕەبتی باشی تێدا بێت، ئەوانەش کە بۆیان نیە خۆیان کاندید بکەن، دەتوانن بـە جـۆرێکی تـر تـا چـوار سـاڵی تـر خزمەت بکەن، بۆی هەیە ئەوەندە کەسانی بەتوانا و چالاکیش بێنە پێـشەوە، ئەندامان و کادیرەکان، بڵێن خۆزگە ڕۆژێك زووتر لە کۆڵمان ببوونایەتەوە.

ئامانجی دووەم: هەموو ئاستەکان بکرێن بەخاوەنی حیزب، ئەویش بەوە دەبێت تەنها سەرکردایەتییەکان و هەندێك ئاستی بالاّ خاوەنی بڕیارە چارەنوسسازەکان نەبن، بەڵکو بەگوێرەی هەندێك بڕیاری یاسایی ئەو مافە بدرێت، بەهەموو کادیرەبالاّکان، کە بەسەر ئۆرگانە جۆراوجۆرەکاندا دابەش بوون، ئەمەش ڕێگرێکی باش دەبێت بۆ هەندێك سەر بەیەکداکردن، کە هەموو کات پارتەکان باجی ئەو جۆرە هەڵانە دەدەن، ئەو قەناعەتەش پووچەڵ بکرێتەوە کەوا تەنها ئاستەبالاّکان دەزانن بەرژەوەندی حیزب بپارێزن، تا چەندێك خەڵکی لەدیاریکردنی چارەنوسی پارتەکەیاندا بەشداربن، بایی ئەوەندە ئەوانیش خۆیان بەخاوەنی ئەو پارتە دەزانن، بڕیارێك ئەگەر هەڵەش بێت مادام زۆرینە ڕێکەوتون لەسەری، چاکترە لە بڕیارێکی ڕاست کەوا کەمینەیەکی سەرکردایەتی بیدات و زۆرینەی خەڵك گلەییان لێی هەبێت.

**٥. جیاکردنەوەی برایەتی نێو ڕەوتە ئیسلامییەکان، لە ڕێکەوتن و سازان**

دەقە قورئانییەکانی وەکو: (**إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ**)[١]،کە ڕاڤەکارانی قورئان بەم شێوەیە لێکیان داوەتەوە: برایەتی کورت هەڵهێنراوە لەنێوان ئیمانداراندا، چونکە ئیمان گەورەترین کۆکەرەوەی هۆکارەکانی پێکەوەبوونە، بەدەستهێنەری ژیانی هەتاهەتاییە[٢]. وەئەو بنەمایەش بنچینەیەکی بەهێزە بۆ پاراستنی کۆمەڵگەی ئیسلامی لە لێکترازان و پارچەبوون، بنچینەیەکی

---

[١] الحجرات: ١٠.

[٢] انوارالتنزيل واسرار التأويل، البيضاوى، ٥/٢١٤.

جێگیره بۆ بەئەنجامگەیاندنی: ڕاستی و دادگەری و چاکسازی[1]، وەکو چۆن پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئیمانی کۆکردووەتەوە، لەڕەچاوکردنی بەرژەوەندی برا ئیمانداراەکەدا کە دەفەرمویێت: (**لَا يُؤْمِنُ أَحَدُكُمْ حَتَّي يُحِبَّ لأَخِيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِه**)**٢**. یان چۆن برایەتی کۆکردۆتەوە لە دادگەری و پێدانی مافی دەوروبەر: (**فَأَعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ**)**٣** کاتێك ئەم پلە بەرز و ئاکارە جوانانەی برایەتی بەدەست دەکەوێت کەوا ئیمانداران لەنێوان خۆیاندا بگەن بە پلەیەکی بەرزی ئیمانی بەجۆرێك کەوا پیادەکردنی مافی یەکتر لەنێوان خۆیاندا، ببێت بە مەلەکەیەك بە بێ داواکردنی خاوەن ماف، یان هەست بەوە بکات مافی پێشێل کراوە، لەلایەن برا ئیماندارەکانیەوە مافەکەی پێ بدرێت، کە ئەم واتایانەش چڵەپۆپەی ئاکاری ئیسلامی و دادگەری کۆمەڵایەتیە، ئەوکاتە ئیمانداران هەموویان لە نێو یەکتردا، هەست بەئارامی و ئاسایش و ئۆقرەگرتن دەکەن، وەکو پێغەمبەر: (**المسلم أخو المسلم لا يظلمه ولا يخذله ولا يحقره**)[4]، چەندین فەرموودەی تری وەکو: (**وَاللَّهُ فِي عَوْنِ الْعَبْدِ مَا كَانَ الْعَبْدُ فِي عَوْنِ أَخِيهِ**)[5]، هەموو ئەم ئایەت و فەرمودانە بۆ ئەوەیە ئیمانداران لەنێوان خۆیاندا مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ یەکتردا بکەن. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە ئەی هۆکاری

---

[1] فی ظلال القران، سید قطب، ٦/ ٤٩٧.

[2] بوخاری: ١/٢٩/ ١٣، وموسلیم، ١/ ٦٧/ ٤٥.

[3] بوخاری: ٢٠/ ٣١٢/ ٦١٣٩.

[44] موسلیم: ٤/ ١٩٨٦/ ٢٥٦٤.

[5] موسلیم: ٤/٢٠٧٤/٢٦٩٩. و موسنەدی ئەحمەد: ١٥/١٥٩/٢٦٩٩.

چیە ئەم واتا جوانانە لەهەڵسوکەوتی ڕۆژانـەی ئیماندارانـدا لـەنێو خۆیـان و غـەیری خۆیانـدا بەشـێوەیەکی بەرجەسـتە بـەدی ناکرێـت؟ ئـەم پرسـیارە دو وەڵامی هەیە:

یەکەم: لەخواترسان و ڕەوشتبەرزییە، خـودا و پێغەمبـەریش هـەموو ئـەم ئاکارە جوانانەیان بەستووەتەوە بە بەرزی لەخواترسان و شەرمکردن لێی، کـە ئەمە دیارە ئێستا لە نێوان ئیماندارانـدا بـە گـشتی لاوازەو نەگەیـشتوە بـەو ئاستەی کەفەرموودەکان پێناسەو وێنایان کـردووە، کـە ببێـت بەمەلەکەیـەك بەبێ داواکردنی ماف، خۆت مافەکەی پێ بدەیت.

دووەم: بەئەنجام گەیاندنی بڕگە یاساییەکانە، بۆیـە لێـرەدا کەموکورتیـەك هەیـــە لـــە میکـــانیزمی پێکەوەبوونـــدا، ئـــەویش پشتگوێخـــستنی بڕگـــە یاساییەکەیە کە بڕگەیەکی تری ڕێنماییەکانی قورئانە، کە دەفەرموێت: (**یَـــا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ**)١، واتـە ئـەی گـەلی خـاوەن بـاوەڕان! هـەر بەڵێنێکی دەیدەن، پێکی بێنن.[2] وە (العقود) جگە لە گرێبەستی نێوان خودا و بەندەکان، بەو گرێبەستانەش دەوترێت، لەنێوان خۆیاندا ئـەنجامیان داوە،[3] وە ئەلیف و لامی سەر (العقود) بۆ جینسە، واتـە هـەموو جـۆرە گرێبەسـتێکی مادی و مەعنەوی دەگرێتەوە، [4] وەجیـاوازی نێـوان (عقـد و عـهـد) ئەوەیـە: (عقد) بۆ ئەو کەسانە بـەکار دەهێنرێـت، پێکـەوە گرێبەسـتێك دەکـەن، کـە

---

[1] المائدة:١

[2] قورئانی پیرۆز، وەرگێڕانی : هەژار ل:١٠٦.

[3] الکشاف: زومەخشەری، ١/ ٤٩٧.

[4] التحرير والتنوير، ئیبنو عاشور، ١١٥/٤.

واتای زیاتری توندوتۆڵی و شـەتەکدانی تێدایـە،[1]. کـەوابوو ڕێکـەوتن لەبـەر خاتری گرەنتی برایەتی و پاراستنی بەرژەوەندیی گشتی و تایبەتمەندییەکانـە، ئەوەی لێرەدا دەمـەوێت هەڵوێستەی لەسـەر بکـەم، دەربـازکردنی برایەتییـە لەدوو جۆرە تێکگیران و بەریەك کەوتن:

- **تێکگیرانی نێوان نەتەوە و گەلە جیاوازەکان**

لە ڕووی پێکهاتەی نەتەوەییەوە، ئەو لێکـەوتن و تێکگیرانانـەی هەیـە، دەبیَ بە لە یەك تێگەیشتن و بڕیاری یاسیی چارەسەر بکرێت، نابیَ پشت بەوە ببەستترێت مادام کوردێك و فارسـێك و عـەرەبێك و تورکێـك بـرای یـەکترن، نابیَ هەندێکیان ستەم لە هەندێکی تریـان بکـەن، چـونکە ئەوانـە هـەموویان خۆیان بەئیماندر دەزانن و خوای باڵا دەستیش بە برا ناوی هێناون، خۆ ئەگەر ئەو نەتەوە جیاوازانە لەنێو خۆیانـدا، سـتەمیان لەیـەکتر کـرد، مانـای وایـە ئایەتـە قورئانیەکـە هەنـدێك، دەسـتەواژەی میـسالی و خەیاڵیـە، لـەدونیای واقیعدا نایەتە دی! لێرەدا هەڵە تێگەیشتنێك لە ئایەتەکـەدا هەیـە، ئـەویش ئەوەیــە: برایــەتی ئیمــانی تایبەتــە بــە کــۆی پێکهاتــەی شارســتانیەتە ئیسلامیەکە، کە زیندوکردنەوەی بنـەما مرۆڤایەتییەکانـەو ئـەوەش بنـەمای هەموو پەیوەندییەکانە، بەڵام دوای ئەوەی ئەو پێکهاتەو مەنزومەیە تێکچوو بـە دروسـتبوونی دەوڵـەتی نەتـەوەیی و نەتـەوەبوون کـرا بەبنـەمای هـەموو پەیوەندییەکان، ئەوە لەو کاتەدا، پەیوەندی ئیمانی نابێتە جێگرەوەی هـەموو گرێبەستە سیاسی و نێو نەتەوەیی و ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان، بەڵکو ئەو

[1] الوسیط، سید طنطاوی، ١/ ١١٥٦.

ئایەتە تەنها بۆ تەواوکاری و کار ئاسانی زیاتری ڕێکەوتن و گرێبەستەکانە، وەکو چۆن ئەگەر ڕێکخراوێك بیەوێت پڕۆژەیەك لە شوێنێکدا بە ئەنجام بگەیەنێت، پێشەکی چەندین خولی هوشیاری بۆ پێکهێنەری ئەو پڕۆژەیە دەکاتەوە بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی نەرم و ئاسان بڕوات بەڕێوە، بەهەمان شێوە بەستنەوەی ئاکار و هەڵسوکەتەکان بەباوەڕبوون بەخودا و پاداشتی دوا ڕۆژەوە، بەشێکە لە هوشیاری ئیمانداران، کە بزانن خودا دادگەری پێخۆشەو فەرمانی پێ دەکات، ئەگەر کارەکانیان بەجوانی پێکەوە ئەنجامدا و خودایان لەبیر بوو ئەوە جگە لە سەرکەوتوویی لەکار و پرۆژەکانیاندا، لەدواڕۆژدا چاوەڕوانی پاداشتی تریش بن، ئەی ئەوەنیە هەر لەئایەتەکەی پێشوودا خوای باڵادەست باسی شەڕ و کوشتاری نێوان ئیماندرەکان دەکات؟ وە باس لەهەندێك میکانیزمی مادی وەکو: بەکار هێنانی دیبلۆماسیەت و ڕێکخستنیان، یان بە زەبری هێز وەستان لە ڕووی ئەولایەنەی دەستدرێژکارە و دان نانێت بەمافی بەرانبەردا دەکات؟ وەئەگەر هەر ملی نەدا بۆڕێکەوتن، ئەوە لایەنی دەستدرێژکار گیان و ماڵی حەڵاڵە بۆ مافخوراو تا ئەوکاتەی مافەکەی دەست دەکوێتەوە: (**وَإِنْ طَائِفَتَانِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ اقْتَتَلُوا فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا فَإِنْ بَغَتْ إِحْدَاهُمَا عَلَي الْأُخْرَي فَقَاتِلُوا الَّتِي تَبْغِي حَتَّي تَفِيءَ إِلَي أَمْرِ اللَّهِ فَإِنْ فَاءَتْ فَأَصْلِحُوا بَيْنَهُمَا بِالْعَدْلِ وَأَقْسِطُوا إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ، إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ**)[1].

[1] الحجرات: ١٠.

- **تێكگیرانی نێوان لایەنەكان:**

هەندێك لایەن و دەستەو تاقمی ئیسلامی، كە بە بێ بوونی هوشیاری لەسەر چۆنیەتی پێكەوەبوون و كارپێكەوەكردن، لەژێر ناونیشانی برایەتی ئیسلامی و تەقوا و لەخواترساندا، پێكەوە كاردەكەن، كە ئەمە سیمای گشتی لایەنە ئیسلامییەكانە، بەڵام بەشێوەی كردەیی و لەڕووی مومارەسەكردن و پیادەكردنەوە، مانای ئەو دروشمانە بەدی ناكرێن، بۆیە كاتێك برایەتی ئیمانی كراوە بە بنچینەیەكی بەهێز بۆ پێكەوەبوون، مەبەست لێی ئەوەیە هەموو ئەو پلان و بەرنامەو ڕێكەوتنانەی لەسەر پڕۆژەكان دەكرێن، ئیمان و تەقوا هەوێنی زیاتری گرێبەست و پێكەوەبوونەكە بێت، بەڵام لەبەركەمتەرخەمی و موجامەلەی یەكتر نەهاتوون بەشێوەیەكی كردەیی، وەكو هەموو كڕین و فرۆشتن و مامەڵەو سەودایەك، دوو لایەنی سیاسی، یان زیاتر، یان كەمتر، لەسەر كۆمەڵێك خاڵی جەوهەری كە بنەمای كار و پڕۆژەكەیانە، وەكو چەند هاوبەش و خاوەن پشكێك، بەكۆمەڵێك بنەما و بڕیاری یاسایی، ڕێكەوتنی لەسەر بكەن، ئەمەش وایكردووە پێكەوەبوونی لایەنە ئیسلامییەكان هەركەس بەمیزاج و تێگەیشتنی خۆی ڕاڤەی بكات، ئەو لایەنانەی زیاتر دەستكراوەتر بوون، بەناوی بەرژەوەندی ئیسلام و مسوڵمانانەوە، بەبێ ڕچاوكردنی برایەتی (بەزاراوە تەقلیدیەكە) مامەڵەی لەگەڵدا كردووە، لەو موحتەوایە دەرچووە كە لە سەرەتاوە پێكەوە هاوڕا بوون لەسەری، بە هۆی نەبوونی گرێبەستی توندوتۆڵ لە نێوان لایەنەكاندا، پاش ماوەیەك كەوتونەتە گلەیی و گازندە لەیەكتری، لەهەمان كاتدا مەرج نیە هەموو كات، ئەو لایەنەی گلەیی و گازندە لە لایەنەكانەكەی تری نێو پارتە

سیاسییەکان دەکات هۆکارەکەی تەنها لایەنێك، یان دەستەیەکی، ستەمکار و سنووربەزین بن، بەڵکو هۆکاری سەرەکی ئەو سنووربەزاندنە دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی یاسا و زەبت و ڕەبتی تەواو و نەبوونی دیسپلینی ڕوون و تەواوی کارپێکەوەکردن، بۆی هەیە جارێکی تر هاوکێشەکە بگۆڕێت، بەشێوەیەك ئەودەستە و لایەنەی خۆی بەپەراویزخراو و بەشخوراو زانیوە، ئەو ببێت بەستەمکار و سنووربەزێن، چونکە وەکو یاسایەك نەبووە، کە لەسەر بنەمای ڕێکەوتن و بەسازانێکی ڕوون و ئاشکرا، وەکو ڕێکەوتنەکانی، سایکس بیکو بۆ نمونە گەل و نەتەوەیەك بەبێ ڕەزامەندی خۆی لکێنرا بێت بەگەل و نەتەوەیەکی ترەوە! بەڵکو ئەمە چەند تەوژمێك، یان چەند دەستەیەك، پێکەوە بەڕەزامەندیی خۆیان و لەچوارچێوەی ئیرادەی خۆیاندا، پێکەوە پارتێك، یان ڕێکخراوێکی سیاسییان ڕاگەیاندووە، بەلاّم بە هۆی کەمتەرخەمی و پشتێن لێکردنەوەی لایەك، کە بە بێ هیچ زانیاری و گرەنتیەکی یاسایی، خۆی تەسلیم بە ویژدانی بەرانبەر کردووە! تای تەرازوی هێزی بالێك زاڵ بووە، کەم کەم هاوسەنگییەکە گۆڕاوە و لایەنی کەمتەرخەم لەسەنتەری بڕیاردان و چەقی هێز دوور کەوتوورتەوە، خۆ ئەگەر بێت و هاوکێشەکە بەو شێوەیە نەبوایە، بەڵکو بە پێچەوانەوە، هاوسەنگییەکە بەلای باڵەکەی تردا بکەوتایەو ئەوکەسانەی یەکەم جار سنووربەزێنیان ئەنجام داوە، ئەوان هاواریان لێ بەرز ئەبووەوەو هەستیان بە بەشخوراوی و پەراوێزخران دەکرد و جارێکی تر دیسانەوە هاوسەنگییەکە تێك دەچوو، دوور نەبوو ئەوکاتە ئەوان پارتەکەیان توشی قەیران بکەن، کە بەهەمان شێوە ئەو یاسایەی کەپارێزگاری لەمافی دەستەی یەکەمجار نەکردووە، بەهەمان شێوە بۆ

ئەم دەستەیەش نیە کە لێپێچینەوە لەگەڵ ئەوکەسانەدا بکات کە خۆیان بەمافخوراو زانیوە و سنووربەزێنیان بەرانبەر کراوەو مافی ئەوانی تری پێشێل کردووە! ئێمە لێرەدا باس لە سیستم دەکەین نەك تاك، هەندێك جار لەوانەیە لەو دەستەیەی سنور بەزاندنیان کردووە، بەخەیاڵی کەسێکی ویژدان زیندویاندا بێت بڵێت: ئەرێ ئێمە کۆمەڵێك برا و هاوڕا و هاوخەبات بووین، ئەوە خێرە هەندێك لەبراکانمان لێدابڕاوە و ئێستا لەمەیدانی کار و خەباتدا، لێك دوور کەوتوینەتەوە؟ بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو ئاخەی ئەو برا خاوەن ویژدانە لەچوارچێوەی یاسا و کۆمەڵێك بڕیاری یاساییدا نیە، تەنها جارێك، یان چەند جارێك مەجلیسێکی پێ گەرم دەکرێت و پاشان چەند کەسێك سەردانێکی دەکەن و ناخی خۆیانی عەرز دەکەن و تامەزرۆییەکی زۆر دەردەبڕن، لەبەر خاتری خواو برایەتی و کاری ئیسلامی، جارێکی تر بێتەوە، سەنگەری کار و خەبات و ئەو کەلێنە بگرێتەوە کە دیارنەمانی ئەو دروستی کردووە، پاشان بەم گفتوگۆ پڕ لەسۆز و خۆشەویستییە کۆتایی بەو هەڵچوونە دەروونیە دێت و هەرکەسە و دەچێتەوە شوێنەکەی خۆی، ئەوان لەنێو جەنجاڵی ئیشوکار و خۆیاندان، ئەمیش لەو حاڵەتە دەروونیە ناجێگیرەدایە کە بەدوای جۆرەها ئەلتەرناتیفدا دەگەڕێت، تا لەکۆتاییدا ڕێگەی لەو پڕۆژەیە دەکەوێت، کەوا دەروونی ئاسوودە دەکات، ئەو سۆزی برایەتیە هەر لەسینگی ئەو خاوەن ویژدانانەدایە ئەویش بڵێسەکەی کپ دەبێتەوە و هیچکامیان نەئەوەی جوڵەیەکی کاتی دروست کردووە، نەئەوەی تەنها داخێك بوو زوو بڵێسەکەی دامرکایەوە، قازانج و سوودێك بەلایەنی مافخوراو دەگەیەنن، بۆیە هەموو ڕەوشتە جوانەکان و ئاکار و ڕێنمونیە بەرزەکان لەچوارچێوەی بیردۆزە و

میسالیەتدا بێناوەرۆك و بێگیان دەمێنێنەوە، تا ئەوکاتەی لەچوارچێوەی کۆمەڵێك بڕیاری یاسایی و دەستورییدا، پراکتیزە دەکرێن و لە چوارچێوەی دامەزراوەیەکدا، بەکردەوە گیان دەکرێت بەبەریاندا، جگە لەهەندێك حاڵەتی دەگمەنی وەکو مێژووی حوکمڕانی جیهانی ئیسلامی[1]، یان وڵاتێکی وەکو بەریتانیا کە کار و باری وڵات لە چوارچێوەی عورف و نەرێتی خۆیاندا دەبەن بەڕێوە، یان وڵاتێکی وەکو ئیسرائیل لەبەر بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەستووری نووسراویان نیە [2]، نەبووە هیچ گەل و نەتەوەیەك، بە بێ یاسا و دەستوورێکی تۆکمە و توندوتۆڵ کاروباری وڵات بەرن بە ڕێوە.

## ب- چارەسەری دەرەکی

لەهۆکارەکانی سەرهەڵدانی ململانێدا ئاماژەمان کرد کە چارەسەری ململانێ بە چەند شتێك دەکرێت لەوانە: چارەسەرە ناو خۆییەکانی وەکو

---

[1] وەکو خەلیفە ڕاشیدەکان، یان کەسێکی وەکو عومەری کوڕی عەبدولعزیز، کە کەسانێکی کاریزمایی بون و، لەسەرئاکارو، ڕەوشت بەرزی و نمونەییەکانی خۆیان، بە بێ دەستورو، کۆمەڵێك یاسای دەستوری، بە ئەوپەڕی دادگەریەوە، وڵاتیان بردوە بەڕێوە، وەئەوەش لەوانیە هۆکارێك بو بێت، کە لەوسەردەمانەدا زانایان و، فوقەهاکانی زانستی سیاسی لەباتی دانانی مەرج بۆ دامەزراوەی حوکمڕانی، مەرجیان بۆکەسی یەکەمی حوکمڕان داناوە. الاخلاق والسیاسة، امام عبدالفتاح امام، ل:٥٧.

[2] لە وڵاتێکی وەکو ئیسرائیل ئەگەر دەستورێکی نوسراویان هەبێت، ئەبێتە گرفت لەبەردەم تەماحی فرەوانخوازی زیاتری خاکی وڵاتانی عەرەبی و، ئیسلامی بۆسەر ئیسرائیل، بۆیە چەند جارێك پێشنیازی نوسینەوەی دەستور کراوە، بەڵام لە ڕێگەی بیرمەندو سیاسەت مەدارەکانیانەوە، ڕەتکراوەتەوە، چونکە یەکێك لەو شتانەی ئەبێت لەدەستوردا جێگیر بکرێت، سنوری وڵاتە، ئەو هەنگاوەش لەبەرژەوەندی تەماح خوازی ئیسرائیل نیە.

بەدامــەزراوەییکردنی دامودەزگاکــان و وەکــو یــەك تــیم کــارکردن و بــە یاساییکردنی کارنامەو بڕیارەکـان، کەسـی یەکـەم، جەمـسەری ململانێکـان بگرێتە دەست و ڕێنمـایی سیاسـی و بـەڕێوەبردن و ڕێکخـستن و پەیوەنـدی و دیبلۆماسی هەبێت، بـۆ خزمـەتی گـشتی و گەشـەپێدانی پڕۆژەکـان، ئەگـەر هەریەك لەم هەنگاوانە سەری نەگرت، ئەوە ڕێگەیەکی ترهەیە بۆ چارەسـەری ململانـێ ئـەویش چارەسـەری دەرەکیـە ئـەویش بـە دروسـتکردنی ململانێـی دەرەکی و بەڕێوەبردنیەتی بە هەندێك میکانیزم:

میکـانیزمی یەکـەم دانـانی پـلان و بەرنامـەی چـڕوپڕە بـۆ ئـەوەی وەکـو هێزێکی ئۆپۆزسیۆن لەسەر گۆڕەپانی سیاسی کار بکات، هەموو تواناکـانی ڕاگەیاندن و سیاسی و دیبلۆماسی و دەزگاکانی ڕاگەیاندن و ڕێکخـستنەکان، بۆ ئەو مەبەستە جۆش بدات و بەهیچ شێوەیەك سازش لەسەر داواکانی خەڵك و کێشەکانی جەماوەر نەکات، لـەم قۆناغـەدا ململانێکـان بەتـەواوەتی کـپ دەبنــەوەو کــەس بــاس لەبەرژەوەنــدی کەســی و دەســتە و گــرووپ ناکــات و هەموویان وەکو یەك تیم بەرانبەر بەگەندەڵییەکان دەوەستن، ئەوەی هۆکـاری جۆش و خرۆشی ئەندامان و جەماوەرە، لەسەر ئۆپۆزسیۆن بوون ئەوەیەکاتێك ئەو پارتە بڕیاریدا بەشـداری لەدەسـەڵاتدا بکـات، بەشـداریکردن و چـۆنیەتی یەکلاییکردنەوەی پلەو پۆسـتەکان، لـە ڕێگـەی ئەوانـەوەو لـە ئەنجومـەنێکی بەرفرەوانـدا بڕیـاری لەسـەر دەدرێـت، نەخـشەو پلانیـان بەدەسـت خـستنی بەرژەوەندی گشتیە، ڕێگە نادرێت بە کەسانی بەرژەوەندخواز و هەلپەرسـت، پلـەو پۆسـتە باڵاکـان لـەپێناوی خۆیـان و بەرژەوەندییـەکانی خۆیانـدا یـەکلا بکەنەوەو بۆ ئامانجەکانی خۆیان بەکاری بێنن، لە حاڵەتێکـدا ڕاجیـایی نێـو

پارتــه سیاســییەکان گەیــشتە ئاســتی نائومێــدی لەچاکــسازی نێــو خــۆیی پارتەکەیان، ئەوە چارەسەری دەرەکـی و هـەنگاونان بـەرەو ئۆپۆزسـیۆن بـوون چارەسەر نیە، چونکە ئۆپۆزسـیۆنبوون بـەڕاڕایی ناکرێت، لـەو حاڵەتانەشـدا، زۆربــەی کــات ســەرکردایەتی ئــەو پارتــە لــە ڕاڕاییــدا دەژی و نــاتوانن ئۆپۆزسیۆنێکی مەبدەئی بن و سازش لەسەر داواکانی جەماوەر نەکـەن. یـان لەژێر فشاری هەندێك لەو ڕایانەی کـە پێیـان وایـە لەدەسـەڵاتدابن باشـترە و دەتوانن چاکـسازی تێـدا بکـەن و وەزعـی حیـزبیش باشـتر بکـەن دانەبـەزن، تەنانەت ئۆپۆزسیۆنبوونیش هەڵبژێرن بـەهۆی ڕاڕایـی و ئۆقرەنـەگرتن لەسـەر بڕیارێکی ڕوون و ئاشکرا، لەباتی بەدەستهێنانی ڕای خەڵك نیگەرانی دروست دەکات و ئەو پارتەش بەپارتێکی ڕاڕا و بەرژەوەندخواز ناوبانگ دەردەکات و ناتوانێت وەکو پارتێکی خاوەن مەبدەئی سەر ڕاست، جێگەی متمانەی خەڵك بێت.

میکانیزمی دووەم: وەکـو قۆنـاغێکی تـەکتیکی دروسـتکردنی کێبڕکێـی سیاسی و ئایدۆلۆژی لۆژیکیە، کە لەچوارچێوەی خەباتی مەدەنی دەرنەچێت، ڕێگە نەدرێت بەرەو ئاقارێك بڕوات بەرژەوەنـدی گـشتی بخاتــە مەترسـییەوە، یان چارەنوسی پارتەکەش بەرەو ئاسۆیەکی نادیار بەرێت، چونکە هەموو ئـەو پێکهاتانــەی سروشــتێکی کۆمەڵایــەتی و پێکــەوەژیانیان هەیــە، هــەرکات هەستیان بەمەترسی دەرەکی کرد لەدەوری یەکتر کـۆ دەبنـەوەو هـەموو وزەو تواناکانیان وەگـەڕ دەخـەن بۆپارێزگـاریکردن لـە قەوارەکـەیان و بەگژاچـوونی هـەموو مەترسـیەکی دەرەکـی، بـەڵام بـەڕێوەبردنی ئـەم جـۆرە ململانێیانـە وردەکــاری و لێکۆڵینــەوەی باشــی دەوێــت، لەلایــەك بۆخۆپاراســتن لــەو

مەترسییانەی لە حاڵەتی ململانێی سیاسی و ئایدۆلۆژییدا ڕوو دەدات، کە ئاماژەمان پێکرد، لەلایەکی تریش بۆ ئەوەی سەرنەکێشێت بۆ سیاسەتێکی ماکیاڤیللانەی بەرژەوەندخواز کە لەپێناوی پارێزگاری لەپارتێك بەها بەرزەکان و بەرژەوەندی گشتی بخرێتە مەترسییەوە.

ئەم جەربەزەیی و چاونەترسیە لە پێناوی پارتێکدا دەکرێت بوونی پێویست بێت، لە حاڵەتی کەوتنە مەترسییەوە لەوانەیە بەرژەوەندی گشتی بەرەو ئاسۆیەکی مەترسیدار بڕوات، لە چ کاتێکدا ئەم هەنگاوە ڕێگە پێدراوە، چ کاتێکیش ئەم جۆرە هەنگاوانە قەدەغەیە؟ ئەوە پێنج حوکمە شەرعیەکەی بەسەردا دەچەسپێت[1].

## سوپاس بۆ پەروەردگاری جیهان

[1] لەبابەتی ڕەخنە گرتن لە ئیسلام و ئاینی مسوڵمانان ئاماژەمان پێکردوە.